فریدریش نیچە

# وەهای گوت زەردەشت

## کتێبێک بۆ هەمووکەس و هیچکەس

وەرگێڕ: عەلی نانەوازادە

ناوی کتێبەکە بە ئاڵمانی
Also sprach Zarathustra
ISBN: 91-472156-2-6


چاپی یەکەم
2001



**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**کوردستان/ هەولێر ت (٢٢٢٩٩٩٢)**

- کتێبی ژمارە: (٤٢)
- کتێب: وەهای گوت زەردەشت
- نووسینی: فریدریش نیچە
- وەرگێڕ: عەلی نانەوازادە
- پێداچوونەوە: جەعفەری حوسێنپوور (هێدی)
- چاپی یەکەم: هەولێر ـ ٢٠٠١
- دەرهێنانی هونەری: قاسم قادر
- بەرگ: محمد قادر
- ژمارەی سپاردن (١٧٥)ی ساڵی ٢٠٠١ دراوەتی.
- چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری/ هەولێر

فریدریش ویلهێلم نیچه

# وەهای گوت زەردەشت

ئەم کتێبە هاوکات لە سێ دەقی سویدی، فارسی، رووسییەوە وەرگێڕدراوەتەوە سەر کوردی و هاوڕێی خۆشەویستم جەعفەری حوسێنپوور دەگەڵ دەقی ئاڵمانییەکەی پێکی گرتوون و پێیدا چۆتەوە کە زەحمەتەکەی شیاوی ئەوپەڕی ڕێز و سپاسە. دەستخۆش!

# پێرست



## وتارەکانی زەردەشت بەشی یەکەم





## وەهای گوت زەردەشت
## بەشی دووهەم



## وەهای گوت زەردەشت
## بەشی سێهەم

## وەهای گوت زەردەشت
## بەشی چوارەم

## پێشوتاری زەردەشت

### ١

زەردەشت سی ساڵە بوو کە زێد و دەریاچەی زێدەکەی خۆی جێ هێشت و چوو بۆ کوێستان. لێرە چێژی لە گیان و تەنیایی خۆی وەرگرت و دە ساڵان لێی وەڕەز نەبوو. بەڵام لە ئاکام، دڵی گۆڕا و ـ بەیانییەک دەگەڵ کازیوە هەستا، هەنگاوی بەرەو هەتاو هەڵێناوە و وەهای پێگوت:

«ئەی هەسێرەی مەزن! تۆ چ بەختیارییەکت دەبوو ئەگەر نەبان ئەوانەی کە بۆیان دەدرەوشێیەوە!

تۆ دە ساڵ لێرە بەرەو ئەشکەوتەکەم هەڵدەکشای: ئەگەر من و هەڵۆ و مارەکەم نەباین تۆ لە شۆقی خۆت و لەم ڕێگایە تێر دەبووی.

کەچی ئێمە هەموو بەیانییەک چاوەڕێت بووین، سەرڕێژەی تیشکەکەتمان لە تۆ وەردەگرت و لە بەر ئەو سپاسی تۆمان دەکرد.

بڕوانە، لە زانایی خۆم بێزار بووم و وەک هەنگێک کە هەنگوینێکی لە رادە بەدەر زۆری کۆ کردبێتەوە، نیازم بە دەستانێک هەیە کە بۆ لام درێژ کرێن.

دەمەوێ بە دیاری بدەم و ببەشمەوە هەتا جارێکی دی زانایان لە نێو خەڵک دا لە نەزانی خۆیان شاد بن و نەداران جارێکی دی لە دارایی خۆیان.

لەبەر ئەوە دەبێ بچمە قولاییەوە، هەر ئەو جۆرەی کە تۆ ئێواران دەیکەی، بەم شێوەیە کە دەچیە پشت دەریا و نوور دەبەیە دونیای ژێرین. تۆ، ئەی هەسێرەی ئەنگراو!

من دەبێ، وەک تۆ، ئاوا بم، ئەو جۆرەی مرۆڤ ناوی دەنێن، ئەوانەی کە دەمەوێ بۆ لایان داگەڕێم.



کە وایە بەرەکەتم پێ ببەخشە ئەی چاوی ئاسوودە کە دەتوانی بەختیارییەکی گەلێک مەزن بەبێ ئێرەیی ببینی!

بەرەکەت بدە جامێکی کە دەیەوێ لێوڕێژ بێ، هەتا ئەوە کە ئاو زێڕاسا سەرڕێژ بێ و درەوشانەوەی شادیت بۆ هەموو لایەک بەرێ!

بڕوانە، ئەم جامە جارێکی دی بەتاڵ بوونی دەوێ و زەردەشت جارێکی دی بوونەوە مرۆڤ.»

ـ وەهای دەست پێکرد ئاوا بوونی زەردەشت.

### ٢

زەردەشت تەنیا لە کێو داگەڕا و کەسی تووش نەهات. بەڵام کاتێک گەیشتە لێڕەوار، لە نەکاو پیرەمێردێک کە لە کۆختەی پیرۆزی خۆی بۆ دیتنەوەی ریشەگیا لە لێڕەوار، دەرکەوتبوو، لە بەرابەری وێستا و پیرەمێردەکە وەهای بە زەردەشت گوت:

«ئەم ڕێبوارە لای من بێگانە نیە: ئەو بەر لە ساڵانێکی زوو بێرە دا تێپەڕی. ناوی زەردەشت بوو؛ بەڵام گۆڕاوە.

ئەودەم خۆڵەمێشەکەت بردە کوێستان، ئەمڕۆ دەتەوێ ئاگرەکەت بۆ دۆڵەکان بەری؟ لە سزای ئاگرهەڵگیرسێنەر ناترسی؟

ئەرێ، زەردەشت دەناسمەوە، چاوەکانی پاکن و لە زاری دا هیچ بێزێک شاراوە نیە. ئایا هەر وەک سەماکەرێک هەنگاو هەڵناهێنێتەوە؟

زەردەشت گۆڕاوە! زەردەشت بۆتەوە منداڵ! زەردەشت وەخەبەر هاتوە: نووکە چت لە خەوتوان دەوێ؟

تۆ لە تەنیایی دا وەها دەژیای کە دەتگوت لەسەر دەریا بووی و دەریا تۆی دەبرد. مخابن، دەتەوێ بێیەوە بەستێن؟ مخابن، دەتەوێ دیسان خۆت لەشی خۆت رابکێشی؟»

زەردەشت وڵامی داوە: «من مرۆڤم خۆش دەوێن.»

پیرە پیرۆزەکە گوتی: «بۆچ من سەری خۆم بەرەو لێڕ و چۆلگە هەڵگرت؟ هەر لەبەر ئەوە نەبوو کە منیش مرۆڤم لە رادەبەدەر خۆش دەویستن؟

نووکە خودام خۆش دەوێ. مرۆڤم خۆش ناوێن. مرۆڤ بۆ من شتێکی گەلێک ناتەواوە. ئەوینی مرۆڤ من دەکووژێ.»

زەردەشت وڵامی داوە: «من سەبارەت بە ئەوین چم گوت؟ من بۆ مرۆڤ دیارییەکم هێناوە.»

پیرەپیرۆزەکە گوتی: «هیچ مەدە بەوان، باشترە شتێکیشیان لێوەرگری و دەگەڵیشیان هەڵگری ـ ئەم کارە پتر لە هەموو شتێک رازییان دەکا، ئەگەر تۆش رازی دەکا!

ئەگەر ویستت شتێکیان بدەیەی، لە سەدەقە پتر مەیاندەیە و لێگەڕێ با ئەویش بە سواڵ وەرگرن!»

زەردەشت وڵامی داوە: «نا، سەدەقەی نادەم، چونکە بۆ دانی ئەو ئەوەند کە پێویستە دەستکورت نیم.»

پیرەپیرۆزەکە بە زەردەشت پێکەنی و وەهای گوت: «کەوایە بزانە ئایا گەنجینەکانت قەبووڵ دەکەن! ئەوان گومان لە دوورەپەرێزان دەکەن و باوەڕ ناکەن کە ئێمە بۆ دیاری دان دێین.

هەنگاوەکانی ئێمە لە کۆڵانەکانیان دا گەلێک تەنیا دەنگ دەدەنەوە و شەوانە کە لە نێو نوێنی خۆیان دا دەنگی پێی پیاوێک دەبیسن کە درەنگانێک بەر لە هەڵاتنی هەتاو تێدەپەڕێ. لە خۆیان دەپرسن: ئەو دزە بۆ کوێ دەچێ؟

بۆ لای مرۆڤەکان مەڕۆ، لە لێڕەوار دا بمێنەوە! واباشترە کە بۆ لای گیانلەبەرەکان برۆی! بۆ ناخوازی وەک من بی ـ ورچێک لە نێو ورچان، مەلێک لە نێو مەلان؟»

زەردەشت پرسی: «پیری پیرۆز لە لێڕەوار چ دەکا؟»

پیرەپیرۆزەکە وڵامی داوە: «ستران ساز دەکەم و دەیانڵێمەوە و کاتی ساز کردنیان پێدەکەنم و دەگریم و ورتەم دێ: بەم جۆرە خودا عیبادەت دەکەم.

بە ستران و گریان و پێکەنین و ورتە خودایەک عیبادەت دەکەم کە خودای منە، بەڵام تۆ چ دیارییەکت بۆ ئێمە هێناوە؟»



زەردەشت بە بیستنی ئەم قسەیە لە ئاست پیر سەری دانواند و گوتی: «من چم هەیە کە بە ئێوەی بدەم! بڵا با زووتر بڕۆم هەتا شتێکیشتان لێنەستێنم!» ـ بەمجۆرە پیرەمێرد و پیاوەکە، بە پێکەنین وەک دوو کوڕۆڵە لە یەک جوێ بوونەوە.

بەڵام زەردەشت کاتێک تەنیا ماوە، وەهای بە دڵی خۆی گوت: «بە دوور نیە! ئەم پیرە پیرۆزە لە لێڕەوارەکەی دا هێشتا شتێکی لەم بارەوە نەبیستوە کە **خودا مردوە!**»

## ٣

کاتێک زەردەشت گەیشتە نزیکترین شاری لای لێڕەوارەکان، ئاپوورەیەکی خەڵک لە بازاڕ دا چاوپێکەوت کە کۆ ببوونەوە؛ چونکە جاڕیان دابوو کە پەتبازێک ببینن. زەردەشت وەهای بە خەڵک گوت:

«من **بەرزەمرۆڤتان** پێدەناسێنم. مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی. بۆ زاڵ بوون بە سەری دا چتان کردوە؟

بوونەوەران گشتیان هەتاکوو ئێستا شتێکی بەرزتر لە خۆیان ئافراندوە: و ئێوە دەتانەوێ تەنیا نیشتنەوەی ئەم لافاوە گەورەیە بن و لە جیات زاڵ بوون بە سەر مرۆڤ دا تەنانەت بگەڕێنەوە سەر حەیوان؟

مەیموون بۆ مرۆڤ چیە؟ شتێکی گاڵتەجاڕ یان شەرمەزارییەکی تاڵ. مرۆڤ لە ئاست بەرزەمرۆڤ دا هەر ئاوا دەبێ: شتێکی گاڵتەجاڕ یان شەرمەزارییەکی تاڵ.

ئێوە رێگایەکی کە لە کرمەوە هەتا دەگاتە مرۆڤ، بڕیوتانە و هێشتا گەلێک شت لە ئێوە دا کرمانەیە. رۆژگارێک مەیموون بوون و هێشتاش مرۆڤ لە هەر مەیموونێک مەیموونترە.

بەڵام ئەوەی کە لە نێو ئێوە دا ژیرترین کەسە ئەویش جگە لە دووپارەیی و نێرەمووکی، جگە لە تێکەڵاوێک لە گیا و تاپۆ، نیە. بەڵام من پێتان دەڵێم کە تاپۆ بن یا گیا؟

بڕوانن! من بەرزەمرۆڤتان پێدەناسێنم.

بەرزەمرۆڤ مانای زەوییە. با ویستی ئێوە بڵێ: بڵا بەرزەمرۆڤ مانای زەوی

بێ!

برایان، ئێوە سوێند دەدەم کە بە زەوی ئەمەگدار بن و باوەڕ بەوانە مەکەن کە لە لاتان باسی هیواکانی دونیای دیکە دەکەن. ئەوان ژارتێکەڵکەرن، چ خۆیان بزانن یا نەزانن.

ئەوان لە ژین بێزارن و خۆیان ژارنۆشن و بەرەو فەوتان، کە زەوی لێیان وەڕەزە. دەبا لەبەر چاوان ون بن!

ڕۆژگارێک کفروێژی لە خودا گەورەترین کفر بوو؛ بەڵام خودا مرد و هەر بۆیەش کفروێژەکانیش مردن. نووکە کفروێژی لە زەوی و پتر لە مانای زەوی ڕێز گرتن لە دەروونی ئەم نەدۆزراوە، قورسترین کفرە.

ڕۆژگارێک ڕەوان بە سووکی دەیڕوانیە لەش و لەو ڕۆژگارە دا ئەم بە سووک زانینە بەرزترین شت بوو. ڕەوان لەشی داتەپیو و کرێت و برسێتی چێشتووی، دەویست. هەر بۆیە لە بیری ڕاکردن لە لەش و زەوی دابوو.

ئای کە ئەم ڕەوانە خۆی هێشتا چ داتەپیو و کرێت و برسێتی چێشتوو بوو وهەوەسی ئەم ڕەوانە دڵڕەقی بوو.

بەڵام ئێوە، براکانم، ئێوەش بە من بڵێن کە لەشتان لە ڕەوانتان چ دەگێڕێتەوە؟ ئایا ڕەوانتان پڕ لە بەدبەختی و چەپەڵی و ئاسوودەیی خەفەتبار نیە؟

بە ڕاستی، مرۆڤ سێڵاوێکی لیخنە. دەبێ دەریا بی هەتا سێڵاوێکی لیخن وەخۆ بگری بەبێ ئەوەی چەپەڵ بی.

بڕوانن، بەرزەمرۆڤتان پێدەناسێنم: ئەو ئەم دەریایەیە، لەو دایە کە بێزاری گەورەتان نوقم دەبێ.

گەورەترین ئەزموونێک کە دەکرێ بیکەی، کامەیە؟ ئەو ئەزموونە، دەمی بێزاری گەورەیە. ئەودەم کە لە بەختیاری خۆی و هەروەها لە ئەقڵ و ئاکارباشی خۆی هێڵنجی دێتێ.

ئەودەم کە دەڵێن: «چ کەلکی هەیە بەختیاریم کە بەدبەختیاریم کە بەدبەختی و چەپەڵی و ئاسوودەیی خەفەتبارە؟ کەچی بەختیاریم دەبا بیانوویەک با بۆ بوونم.»

ئەودەم کە دەڵێن: «چ کەلکی هەیە ئەقڵم؟ ئایا تامەزرۆیی بۆ زانست وەک



تامەزرۆیی شێر بۆ نێچیری خۆیەتی؟ بەڵام بەدبەختی و چەپەڵی و ئاسوودەیی خەفەتبارە!»

ئەودەم کە دەڵێن: «چ بایەخی هەیە ئاکارباشیم کە هێشتا شێواوی نەکردووم؟ لە چاکە و خراپەی خۆم چ بێزارم کە هەمووی بەدبەختی و چەپەڵی و ئاسوودەیی خەفەتبارە!»

ئەودەم کە دەڵێن: «چ کەلکی هەیە دادخوازییم؟ کە خۆم بە پۆلوو و ڕەژی نابینم. کەچی دادخواز پۆلوو و ڕەژییە!»

ئەودەم کە دەڵێن: «چ کەلکی هەیە بەزەییم؟ مەگەر بەزەیی هەر ئەو خاچە نیە کە، ئەو خۆشەویستەی بەشەریان لە سەر بزمارکوت کردوە؟ بەڵام لە بەزەیی من دا لە خاچ دان نیە!»

هەتا ئێستا هەرواتان گوتوە؟ هەتا ئێستا ئاواتان هاوار کردوە؟ خۆزیا هاوارتان ئاوا بە گوێم گەیشتبا!

ئەوە هاواری ڕەزای ئێوەیە کە بە ئاسمان دەگا نە گوناهی ئێوە. هاواری ئێرەیی ئێوە لە گوناه دایە کە دەگاتە ئاسمان!

لە کوێیە ئەو برووسکەی کە ئێوە بە زمانی خۆی بلێسێتەوە؟ لە کوێیە ئەو شێتایەتییەی کە دەبێ ئێوەی پێبکوترێ؟

بڕوانن! بەرزەمرۆڤتان پێدەناسێنم: ئەم، ئەو برووسکەیە، ئەم، ئەو شێتایەتییەیە!»

کە زەردەشت وەهای گوت، کەسێک لە نێو خەڵک دا دەنگی بەرز کردەوە: «ئەوەی کە سەبارەت بە پەتباز بوو بیستمان؛ ئێستا لێگەڕێ با خۆشی ببینین!» و خەڵک تێگڕا بە زەردەشت پێکەنین. بەڵام پەتباز کە باوەڕی کردبوو ئەم قسانە سەبارەت بەون، کاری خۆی دەست پێکرد.

## ٤

بەڵام، زەردەشت روانیە خەڵک و سەری سوڕما. لە دوایی وەهای گوت:

«مرۆڤ پەتێکە بەستراو لە نێوان حەیوان و بەرزەمرۆڤ دا ـ پەتێک لە سەر بەرزایی هەڵدێرێک.

چوونە پێشی مەترسییەکە، بە سەر دا چوونی مەترسییەک، بۆ دوا روانینی مەترسییەک، بە لا داهاتن و وەستانیش مەترسییەک.

ئەوەی لە مرۆڤ دا مەزنە ئەمەیە کە ئەو پردێکە نە ئامانج؛ ئەوەی کە لە مرۆڤ دا دەکرێ خۆشت بوێ ئەمەیە کە ئەو قۆناغێکە و ئاوابوونێک.

خۆشم دەوێن ئەوانەی کە هەر بۆیە دەژین چونکە دەزانن ئاوا دەبن، چونکە ئەوان بەسەرچوانن.

خۆشم دەوێن بەسووکدانەرە گەورەکان، چونکە رێزدانەرانی گەورەن و پەیکانەکانی تاسەن بەرەو بەستێنێکی دی.

خۆشم دەوێن ئەوانەی کە بۆ ئاوابوون و بەخت بوونی یەکەم هەسێرەکان لە هۆ ناگەڕێن، بەڵکەم خۆ بۆ زەوی بەخت دەکەن هەتا رۆژێک زەوی هی بەرزەمرۆڤ بێ.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە دەژی هەتا تێبگا و لەبەر ئەوە دەیەوێ تێبگا هەتا بەرزەمرۆڤ بژی و ئاوا ویستیاری ئاوابوونی خۆیەتی.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە کار دەکا و ئیختراع دەکا هەتا ماڵێک بۆ بەرزەمرۆڤ بنیات بنێ و زەوی و گیاندار و گیا بۆ ئەو تەیار دەکا: چونکە ئاوا ویستیاری ئاوابوونی خۆیەتی.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە ئاکارباشی خۆی خۆش دەوێ، چونکە ئاکارباشی ویستی ئاوابوونە و پەیکانێکی تاسەیە.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە لە رووح دڵۆپێک بۆ خۆی ناهێڵێتەوە، بەڵکەم دەیەوێ بە تەواوەتی ببێتە رووحی ئاکارباشی خۆی. بەمجۆرە، وەک رووح پێ دەنێتە سەر پرد.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە ئاکارباشی خۆی دەکاتە مەیل و چارەنووسی خۆی و



بەمجۆرە بۆ ئاکارباشی خۆی هێشتا دەیەوێ بژی یا ئیدی نەژی.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە ئاکارباشییەکی زۆری ناوی. چونکە یەک ئاکاری باش سەرووترە لە دوو ئاکاری باش، و یەک ئاکاری باش گوریسێکی قایمترە بۆ ئەوە کە چارەنووسی خۆی پێهەڵواسێ.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە رووحی، بۆ خۆی خۆ لە کیس دەدا، کە نە سپاسی دەوێ و نە سپاس دەکا: چونکە هەمیشە دەبەخشێ و خۆی لەبەر چاو نیە.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە کاتێک تاس بە قازانجی دادەکەوێ، شەرمەزار دەبێتەوە و دەپرسێ: ئایا من قوماربازێکی فێڵەزانم؟ ـ چونکە ئەو داخوازی فەوتانە.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە لە پێشەوەی ئاکارەکانی دا وتەی زێڕین دادەمەزرێنێ و هەمیشە پتر لەوەی کە بەڵێن دەدا بە جێی دێنێ، چونکە داخوازی ئاوا بوونی خۆیەتی.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە داهاتوان بە هەق دادەنێ و رابوردوان رزگار دەکا: چونکە دەیەوێ گیان لە سەر کاری ئێستاییان بەخت بکا.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە خودای خۆی تەمێ دەکا، چونکە ئەویینداری خودای خۆیەتی: کەوایە دەبێ بە غەزەبی خوداکەی بفەوتێ.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە رەوانی لە برین وێکەوتنیش دا قووڵە و ئەزموونێکی چووکە دەتوانێ بیفەوتێنێ: کەوایە بە شادییەوە بە سەر پرد دا دەڕوا.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە رەوانی لێوڕێژە، وەها کە خۆی لە بیر دەکا و شتەکان هەموو لە دەروونی ئەو دان: کەوایە هەموو شت دەبێتە هۆی ئاوا بوونی.

خۆشم دەوێ ئەوەی کە گیانازاد و دڵازادە: بەمجۆرە سەری لە دەروونی دڵی دایە؛ بەڵام دڵەکەی ئەو بەرەو ئاوا بوون دەبا.

خۆشم دەوێ گشت ئەوانەی کە وەک دڵۆپگەلی قورسن و یەک یەکە لە هەوری تاری وەستاو لە سەر مرۆڤەکان دادەکەون: ئەوانە مزگێنیدەرانی برووسکن و وەک مزگێنیدەران بەخت دەبن.

بڕوانن! منم مزگێنیدەرێکی برووسک و دڵۆپێکی قورس لە هەور: و ناوی ئەم برووسکە بەرزەمرۆڤە.»

## ٥

زەردەشت کە ئەم قسانەی گوت، دیسان روانیە خەڵک و بێدەنگ بوو. بە دڵی خۆی گوت: ئەوانە رادەوەستن و پێدەکەنن. ئەوانە لە من ناگەن. من زارێک نیم بۆ ئەم گوێیانە.

ئایا دەبێ لە پێشدا گوێیەکانیان دابکوتی هەتا فێر بن کە بە چاو ببیسن؟ ئایا دەبێ هەروەک دەهۆڵ و مۆعیزەکەرانی تۆبە هاوار بکەی؟ یان ئەوانە تەنیا بڕوایان بە لاڵەپەتەکانە؟

ئەوانە شتێکیان هەیە کە پێی بایین. ناوی چیە ئەوەی کە ئەوانە بایی دەکا؟ پێیدەڵێن «فەرهەنگ»، هەر ئەوە کە ئەوانە لە بزنەوانەکان جیا دەکاتەوە.

لە بەر ئەوەیە، پێیان خۆش نیە کە وشەی «سووک» سەبارەت بە خۆیان ببیسن. کە وایە من دەگەڵ غرووریان قسە دەکەم.

کەوایە من لە دەگەڵ هەرە بەسووک دانراوانی ئەوان قسە دەکەم: و ئەو **دوامرۆڤە!**

زەردەشت وەهای بە خەڵک گوت:

«هەنووکە کاتی ئەوەیە کە مرۆڤ ئامانجی خۆی دیاری بکا. هەنووکە کاتی ئەوەیە کە مرۆڤ تۆمی بەرزترین هیوای خۆی دابچێنێ.

زەوی و زارەکەی هێشتا بۆ ئەو ئەوەند کە پێویستە بە پیتە. بەڵام ئەم خاکە رۆژێک فەقیر و پووچەڵ دەبێ و ئیدی دارێکی بەرزی لێناڕسکێ.

داخەکەم، زەمانێک دادێ کە مرۆڤ ئیدی پەیکانی تاسەی خۆی پتر لە مرۆڤ نەهاوێژێ و زێی کەوانەکەی وژە لە بیر بکا.

بە ئێوە دەڵێم: مرۆڤ دەبێ لە دەروونی دا بێنەزمییەکی هەبێ هەتا بتوانێ هەسێرەیەکی سەماکەر بزێنێ. بە ئێوە دەڵێم کە هێشتا بێنەزمییەکتان تێدا هەیە.

داخەکەم، زەمانێک دادێ کە مرۆڤ نایەوێ ئیدی هەسێرەیەکی سەماکەر بزێنێ. داخەکەم، سەردەمی هەرە بەسووک دانەرانی مرۆڤ دادێ، مرۆڤێک کە ئیدی نەتوانێ خۆی بە سووک دانێ.



بڕوانن! دوامرۆڤ نیشانی ئێوە دەدەم.

ئەوین چیە؟ ئافراندن چیە؟ تاسە چیە؟ هەسێرە چیە؟ ـ دوامرۆڤ وەها دەپرسێ و چاو دادەگرێ.

زەوی چووکە بۆتەوە و دوامرۆڤ، کە هەموو شت چووک دەکاتەوە لە سەری، هەڵبەزهەڵبەزیەتی. رەگەزی ئەو، وەک کێچ بنەبڕ نابێ، دوامرۆڤ درێژترین تەمەنی هەیە.

«ئێمە بەختیاریمان ئیختراع کردوە» ـ دوامرۆڤ وەها دەڵێ و چاو دادەگرێ.

ئەوان ئەو مەڵبەندانەی کە ژیانیان تێدا دژوارە بە جێ هێشتوە: چونکە مرۆڤ پێویستی بە گەرما هەیە. هێشتا هاوسایان خۆش دەوێ و خۆی تێهەڵدەسوون: چونکە مرۆڤ پێویستی بە گەرما هەیە.

نەخۆش کەوتن و بەدگومان بوون بە گوناه دەژمێرن؛ بە ئەسپایی هەنگاو هەڵدێنێتەوە. گەوجە ئەو کەسەی کە هێشتا بە سەر بەرد یا مرۆڤ دا هەڵدەنگوێ!

جارجار هەندێک ژار کە خەیاڵی خۆش دەبەشێ و لە ئاکام، ژارێکی زۆر بۆ مەرگێکی خۆش.

هێشتا کار دەکا، چونکە کار چەشنێک رابواردنە، بەڵام وریان کە ئەم رابواردنە بێتاقەتیان نەکا.

ئیدی نە کەس دەوڵەمەند دەبێ و نە دەستکورت. کە ئەمانە هەردووک دەردی گرانن. کێ هێشتا هەر دەیەوێ دەستەڵاتدار بێ؟ کێ ژێر دەست؟ کە ئەمانە هەردووک دەردی گرانن.

گەلەیەک، بەبێ شوان! هەموو یەک شتیان دەوێ و هەموو وەک یەکن. هەر کەس جگە لەوە هەست بکا بە پێی خۆی دەچێتە شێتخانە.

هەرە وریاکانیان دەڵێن: «پێشتر هەموو دونیا شێت بوون،» و چاو دادەگرن.

زیرەکن و هەرچی کە قەوماوە، دەیزانن: لەبەرئەوە گاڵتە کردنیان تەواو بوونی نیە. هێشتا دەگەڵ یەک بەکێشە دێن، بەڵام زوو دەگەڵ یەک پێکدێنەوە ـ دەنا ئەم کارە گەدە لە کەلک دەخا.

بۆ رۆژ، برێک خۆشی خۆیان هەیە و بۆ شەویش برێک خۆشی: بەڵام قەدری سڵامەتی خۆیان دەگرن.

«ئێمە بەختیاریمان ئیختراع کرد» ـ دوامرۆڤەکان وەها دەڵێن: و چاو دادەگرن.

لێرە دا یەکەم مۆعیزەی زەردەشت ـ کە بە «پێشوتار» یش ناودێر کراوە ـ تەواو بوو، چونکە لێرە دا هەڵڵا و شادی ئاپوورەی خەڵک قسەکەیان بڕی. ئەوان هەرایان کرد: «زەردەشت، ئەم دوامرۆڤە بدە بە ئێمە. ئێمە وەک ئەم دوامرۆڤە لێبکە هەتا بەرزەمرۆڤ پێشکەشی تۆ بکەین!» لە دوایی خەڵک تێکڕا لە خۆشیان هوریایان کێشا و کردیانە تلیلی. بەڵام، زەردەشت غەم دایگرت و بە دڵی خۆی گوت:

ئەوان لە من ناگەن: من زارێک نیم بۆ ئەم گوێیانە.

گۆیا ماوەیەکی زۆر لە کوێستان ژیاوم و فرە گوێم لە جۆبار و درەختەکان گرتوە: ئێستا دەگەڵ ئەوان وەها قسان دەکەم دەڵێی بزنەوانەکان دەدوێنم.

رەوانم ئاسوودیە و رووناک، وەک کوێستان لە بەرەبەیان دا. بەڵام ئەوان بە ساردم تێدەگەن و بە گەمەکەرێکی بە خۆف.

هەنووکە چاوم لێدەکەن و پێدەکەنن: و هەروا کە پێدەکەنن لە منیش بێزارن. کەنینەکانیان سەهۆڵی تێدایە.

## ٦

بەڵام لە دوایی دا شتێک رووی دا کە هەر زارێکی بەست و هەر چاوێکی زەق کردەوە. چونکە لەم بەینە دا پەتباز کاری خۆی دەست پێکردبوو: ئەو لە دەربیچەیەکەوە هاتبوە دەر و بە سەر پەت دا، کە لە نێوان دوو بورج بە بان خەڵک و بازاڕ دا کێشرابوو، دەرۆیشت. هەر کە گەیشتە نێوەڕاستی رێگاکەی، دەربیچە جارێکی دی کراوە و کەسێک بە جلی رەنگاورەنگ، وەک ویشکەڕنەکان، دەرپەڕی و بە هەنگاوی خێرا بە دوای پێشوو دا چوو. ئەو بە دەنگی بە خۆفی هاواری دەکرد: «بڕۆ پێشێ، گۆج، بڕۆ پێشێ تەوەزەل، فێڵەزان، رەنگ پەڕاو! دەنا بە پاژنەم قدیلکەت دەدەم! تۆ لێرە لە نێوان بورجەکان دا چ دەکەی؟ جێی تۆ



نێو بورجە. دەبێ تۆ زیندانی بکەن. تۆ رێی لە خۆ باشترت گرتوە!» دەگەڵ هەر وشەیەک لێی نزیک و نزیکتر دەبۆوە، بەڵام ئەودەم کە تەنیا هەنگاوێک لێی لە پاش بوو، ئەو شتە بە خۆفە قەوما کە هەر زارێکی بەست و هەر چاوێکی زەق کردەوە: ئەو هاوارێکی دێواسای کرد و بە بان ئەو کەسەی دا کە لە سەر رێی بوو، بازی دا. بەڵام ئەوی دی کە غەنیمەکەی ئاوا سەرکەوتوو دیت، ئەقڵ و ئارامی لێبڕا، دارلەنگەری فڕێ دا و خێراتر لەو، وەک گەردەلوولێک لە پێ و دەست، کەوتە خوارەوە. بازاڕ و خەڵک وەک دەریای شڵەژاویان لێهات و بە تایبەت لەو شوێنەی کە دەبا کەلاک کەوتبا، هەموو شت لێک بڵاو بوو و بە سەر یەکدی دا کەوتن.

بەڵام زەردەشت لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد و کەلاک دروست لە نزیک ئەو داکەوت، زۆر تێشکاو و کوتراو، بەڵام هێشتا گیانی تێدا مابوو. دوای ماوەیەک پیاوی تێشکاو وەهۆش هاتەوە و زەردەشتی دیت کە لە بان سەری چۆکی داداوە. لە ئاکام گوتی: «تۆ لێرە چ دەکەی؟ لەمێژ بوو کە دەمزانی شەیتان پاڵم پێوەدەنێ. ئێستا ئەو بە کێشەکێش دەمباتە دۆزەخ. ئایا تۆ دەتەوێ بەری بگری؟»

زەردەشت وڵامی داوە: «هاوڕێم، بە شەرەفم سوێند ئەوەی گوتت هەر نیە: نە شەیتانێک لە ئارا دایە و نە دۆزەخێک. تەنانەت رەوانت زووتر لە لەشیشت دەمرێ: کەوایە لە هیچ شتێک مەترسە!»

کابرا بە شکەوە تێیڕوانی و ئەوجار گوتی: «ئەگەر ئەوەی کە دەیڵێی راست بێ، من بە لە کیس دانی ژیانم هیچ لە کیس نادەم. من هێند زێتر لە گیانلەبەرێک نیم کە بە لێدان و پارووی چووک سەمایان فێر کردوە.»

زەردەشت گوتی: «نا، قەت. تۆ مەترسیت کردە پیشەی خۆت و لەوە دا شتێکت نیە کە شایەنی بە چووک دانان بێ. ئێستا لە رێی پیشەکەت دا بەخت دەبی؛ هەر لەبەر ئەوە تۆ بە دەستەکانی خۆم دەنێژم.»

کە زەردەشت ئەوەی گوت، پیاوی خەریکی ئاویلکە دان لەوە پتر وڵامێکی نەداوە؛ بەڵام دەستی بزاوت، دەتگوت بۆ سپاس لە دەستی زەردەشت دەگەڕێ.

## ٧

لەم بەینە دا تاریکان داهات و بازاڕ لە تاریکی دا نوقم بوو. ئەودەم خەڵک بڵاوەیان کرد، چونکە تەنانەت پرسایی و ترسیش ماندوو دەبن. بەڵام زەردەشت لە سەر زەوی، لە پەنا مردوو، دانیشت و نوقمی خەیاڵ بوو. بەمجۆرە زەمانی لە یاد کرد. بەڵام لە ئاکام شەو داهات و بایەکی سارد هەڵیکردە سەر ئەو تەنیایە. ئەودەم زەردەشت هەستا و بە دڵی خۆی گوت:

بە راستی، زەردەشت ئەمرۆ چ ماسیەکت گرت! ئەو نەک مرۆڤ بەڵکەم کەلاکێک بوو!

ژیانی مرۆڤ ترسناکە و هێشتا بێمانا: ویشکەڕنێک دەتوانێ ئاکامێکی شوومی بۆ پێکبێنێ.

دەمەوێ مرۆڤەکان فێری مانای بوونیان بکەم: بەرزەمرۆڤ کە برووسکەیەکە لە هەوری رەشی مرۆڤ. بەڵام هێشتا لێیان دوورم و مانای من دەگەڵ ماناکانی ئەوان هاوزمان نیە. بۆ مرۆڤ، من شتێکم لە نێوان گەپچاڕێک و کەلاکێک دا.

شەو تاریکە و رێگاکانی زەردەشت تاریک. وەرە ئەی هاوڕێی سارد و سڕم! تۆ دەبەمە شوێنێک کە لەوێ بە دەستەکانی خۆم بتنێژم.

## ٨

کە زەردەشت ئەو قسانەی بە دڵی خۆی گوت، کەلاکی لە کۆڵ نا و وەڕێ کەوت. هێشتا سەد هەنگاوێک نەڕۆیشتبوو کە پیاوێک بە دزی بۆ لای هات و لە گوێی دا چپەیەکی کرد ـ بڕوانە! ئەو ویشکەڕنی بورج بوو کە قسەی دەکرد.

ئەو گوتی: «زەردەشت، لەم شارە دوور کەوە. لێرە گەلێک لە تۆ بێزارن. پیاوچاکان و دادخوازان لە تۆ بێزارن و تۆ بە دوژمن و بە سووک دانەری خۆیان دەزانن. دیندارانی دینی بە هەق لە تۆ بێزارن و تۆ بۆ خەڵک بە مەترسی دادەنێن. شانست هەبوو کە بە تۆ پێکەنین و تۆ بە راستی وەک ویشکەڕنێک قسەت کرد. شانست هەبوو کە دەگەڵ ئەم سەگە تۆپیوە بوویە هاوڕێ. تۆ بەم چەشنە خۆ چووک کردنەوەت، ئەمرۆ خۆت رزگار کرد. بەڵام لەم شارە دوور کەوە و دەنا سبەی بە سەر تۆ دا باز دەدەم، وەک بازی زیندوویەک بە سەر مردوویەک



دا.» کە ئەوەی گوت، ون بوو. بەڵام زەردەشت بە نێو کۆڵانە تاریکەکان دا هەروا دەڕۆیشت.

لە بەر دەروازەی شار گۆڕهەڵکەنەکان تووشی بوون؛ ئەوان مەشخەڵەکانیان لە رووی ئەو گرت؛ زەردەشتیان ناسیەوە و قاقا پێی پێکەنین: «زەردەشت سەگی تۆپیو دەرباز دەکا؛ چ باشە کە زەدەشتیش بۆتە گۆڕهەڵکەن! چونکە دەستەکانی ئێمە لەوە پاکترن کە گلاوی بکەین. ئایا زەردەشت دەیەوێ پارووی شەیتان بدزێ؟ سەرکەتوو بی! نۆشی گیانت بێ! بەڵام ئەگەر شەیتان لە زەردەشت دزتر بێ چی؟ ئەو هەردووکیان دەدزێ و هەر دووکیان قووت دەدا!» ئەودەم تێکڕا پێکەنین و سەریان پێکەوە ناوە.

زەردەشت هیچی نەگوت و بە رێی خۆی دا رۆیشت. کە دوو سەعاتێک رێی بڕی و لە لێڕ و زەلکاوەکان تێپەڕی و گەلێک لوورەی گورگە برسیەکانی بیست، برسیایەتی زۆری بۆ ئەویش هێنا. ئاوا لە بەر دەرگای ماڵێکی تەنیا، کە چرایەکی تێدا دایسا، وەستا.

زەردەشت گوتی: «برسیایەتی هەر وەک رێگرێک شالاوی بۆ هێناوم. برسیایەتیم لە لێڕەکان و زەلکاوەکان و لە ناخی شەوەوە شالاوی بۆ هێناوم.

برسیایەتیم خوویەکی سەیرە. ئەو پتر دوای تێپەڕینی ژەمە نان لێم پەیدا دەبێ؛ و ئەمرۆ تەواوی رۆژ نەهاتوە: هەتا ئێستا لە کوێ گیرسابۆوە؟»

لە دوایی زەردەشت لە دەرگای ماڵەکەی کوتا. پیاوێکی پیر، چرا بە دەست، وەدیار کەوت و پرسی: «کێیە بۆ لای من و خەوی ئالۆزی من هاتوە؟»

زەردەشت گوتی: «زیندوویەک و مردوویەک. شتێکم بۆ خواردن و خواردنەوە بدەیە، من تەواوی رۆژ ئەوەم لە بیر کردبوو. ئەقڵ دەڵێ: هەر کەس برسییەک تێر بکا، رەوانی خۆی تازە دەکاتەوە.

پیرەمێرد دوور بۆوە بەڵام زوو گەڕاوە و نان و شەرابی پێشکەشی زەردەشت کرد و گوتی: «ئێرە بۆ برسییان ناوچەیەکی نامۆیە. لەبەر ئەوەیە کە لێرە دەژیم. گیاندارەکان و مرۆڤەکان لێرە دێنە لای منی دوورەپەرێز. بەڵام بە هاوڕێکەشت بفەرموو بخوا و بخواتەوە، ئەو لە تۆ ماندووترە.» زەردەشت وڵامی داوە: «هاوڕێکەم مردوە، ناچار کردنی دژوارە.» پیرەمێرد، بە رووترشییەوە گوتی: «من

کارم بەوە نیە. هەر کەس کە دەرگای ماڵی من بکوتێ هەرچی کە پێشکەشی دەکەم دەبێ وەری بگرێ. بیخۆن و بە سڵامەت!»

دوای ئەو زەردەشت دوو سەعاتی دیکەش، خۆ سپاردە بە رێ و شۆقی هەسێرەکان، رێی بڕی؛ چونکە خووی بە شەوگەڕی گرتبوو و پێی خۆش بوو لە سیمای هەرچییەک کە خەوتوە، بڕوانێ. بەڵام کاتێک کە کازیوە سەری هەڵدا، زەردەشت خۆی لە لێڕەوارێکی چڕ دا بینی و ئیدی رێگایەک لە بەری دیار نەبوو. ئەودەم مردووی دە نێو دارێکی هڵۆڵ لە سەرەوەی خۆی دانا چونکە دەیەویست لە دەست گورگەکانی بپارێزێ؛ خۆشی لە سەر زەوی بە شینکە داپۆشراو درێژ بوو و دەستبەجێ خەوی لێکەوت، بە لەشێکی شەکەت بەڵام بە رەوانێکی ئاسوودە.

## ٩

زەردەشت زۆر خەوت و نە تەنیا بەرەبەیان بەڵکەم بەیانیش بە سەر رووی دا تێپەڕی. بەڵام لە ئاکام، چاوی هەڵێنا: زەردەشت حەیران سەیری لێڕ و بێدەنگی کرد و حەیران روانیە خۆی. ئەودەم مینا دەریاوانێک کە لە پڕ چاوی بە ویشکانی بکەوێ، گورج راپەڕی و شاد بوو، چونکە راستەقینەیەکی نوێی دیتبوو. ئەودەم بە دڵی خۆی گوت:

پڕشنگێک لە من دەر کەوتوە: پێویستم بە هاودەم هەیە، هاودەمانی زیندوو ـ نەک هاودەمانی مردوو و ئەو کەلاکانەی کە بۆ هەر کوێم بوێ بتوانم بیانبەم.

نا، پێویستم بە هاودەمانی زیندوو هەیە کە لاگری من بن، چونکە داخوازی لاگری لە خۆن ـ و بۆ لایەنێک دەچن کە من دەچم.

پڕشنگێک لە من دەرکەوتوە: زەردەشت نە دەگەڵ خەڵک بەڵکە دەگەڵ هاودەمەکانی قسە دەکا، زەردەشت نابێتە شوان و سەگی گەلە!

لە بەر ئەوە هاتووم کە گەلێک لە گەلە دوورخەمەوە. خەڵک و گەلە لە من تووڕە دەبن و شوانەکان زەردەشت بە دز دادەنێن.

من دەڵێم شوان، بەڵام ئەوان خۆ بە چاکان و دادخوازان دادەنێن، من دەڵێم شوان بەڵام ئەوان خۆ بە دیندارانی دینی هەق دادەنێن.



بڕواننە چاکان و دادخوازان! لە کێ پتر لە هەموو کەس بێزارن؟ لەوەی کە دەپی بایەخەکانیان تێک بشکێنێ، لە شکێنەر، لە یاساشکێن: کەچی ئەو ئافرێنەرە.

بڕواننە دیندارانی گشت دینەکان! لە کێ پتر لە هەموو کەس بێزارن؟ لەوەی کە دەپی بایەخەکانیان تێک بشکێنێ، لە شکێنەر، لە یاساشکێن: کەچی ئەو ئافرێنەرە.

ئافرێنەر لە هاودەمان دەگەڕێ، نە لە کەلاک و گەلە و دیندارەکان. ئافرێنەر لەو ئافرێنەرانە دەگەڕێ کە بایەخە نوێیەکان لە سەر دەپە نوێیەکان دەنووسنەوە.

ئافرێنەر لە هاودەمان و دروێنەوانان دەگەڕێ، چونکە هەموو شت لای ئەوان بۆ دروێنە گەیشتوون. بەڵام سەد داسی دەوێ و نیە؛ هەر بۆیە گوڵبەرەکان دەپچڕێ و تووڕەیە.

ئافرێنەر داواکاری هاودەمانێکە کە دەزانن چلۆن داسەکان لە ساو بدەن. ئەوان بە وێرانکەر ناودێر دەکرێن و بە سووک دانەرانی چاکە و خراپە. بەڵام ئەوان دروێنەوان و شادخوازن.

زەردەشت لە ئافرێنەر، دروێنەوان و شادخوازان دەگەڕێ: ئەو چ کاری بە گەلە و شوان و کەلاکەکان هەیە.

وە تۆ ئەی یەکەم هاودەمم، ماڵاوا! تۆم چاک لە نێو داری هڵۆڵت دا چاڵ کرد، تۆم چاک لە گورگەکان شاردەوە.

بەڵام کاتی ئەوە داهاتوە کە لە تۆ جوێ بمەوە. لەو کازیوە هەتا ئەم کازیوە راستەقینەیەکی تازە رووی تێکردووم.

من نە دەبمە شوان و نە گۆڕهەڵکەن. ئیدی دەگەڵ خەڵک قسە ناکەم؛ ئەوە دواین جار بوو کە دەگەڵ مردوویەک قسەم کرد.

من تێکەڵی ئافرێنەران، دروێنەوانان، شادخوازان دەبم و پەلکەزێڕینە و پەیژەی بەرزەمرۆڤیان گشت پێنیشان دەدەم.

ستڕانی خۆم بۆ دوورەپەرێزان و هاودوورەپەرێزان دەڵێم؛ و دڵی ئەو کەسەی کە هێشتا گوێیەکی بۆ نەبیستراوەکان هەیە لە بەختیاری خۆم داخنم.

ئامانجی خۆم رەچاو دەکەم و رێگای خۆ رەپێش دەگرم. بە سەر وچانگران و

تەوەزەلان دا باز دەدەم. بلا کە هەنگاوی من ئاوا بوونی ئەوان بێ.

## ١٠

زەردەشت ئەو قسانەی بە دڵی خۆ گوتبوو، کە هەتاو لە نیوەڕۆ وەستا. ئەودەم بەپرسەوە سەری هەڵبڕی، چونکە لە بان سەری خۆی سیڕەی مەلێکی بیست. بڕوانە! هەڵۆیەک لە جەغزێکی هەراو دا لە حەوا دەخولاوە و مارێکی پێوە هەڵواسرابوو، بەڵام نەک وەک نێچیرێک، بەڵکە وەک دۆستێک: چونکە خۆی لە ملی هەڵۆ هاڵاندبوو.

زەردەشت گوتی: «ئەوانە گیاندارەکانی منن!» و لە قووڵایی دڵیەوە هەستی بە خۆشی کرد.

«باییترین گیاندار لە ژێر هەتاو و ژیرترین گیاندار لە ژێر هەتاو: ئەوان بۆ هەواڵ دەستکەوتن وەدەرکەوتوون.

دەیانەوێ بزانن کە زەردەشت هێشتا زیندوویە. بە راستی، ئایا هێشتا زیندووم؟

ژیانی نێو مرۆڤم لە ژیانی نێو گیانداران پێ پڕمەترسیترە. زەردەشت بە رێگا پڕ مەترسییەکان دا رێ دەبڕێ. بلا گیاندارەکانم رێبەرم بن!»

کە ئەوەی گوت، قسەکانی پیری نوورانی لە لێڕەوار وەبیر هاتنەوە و ئاخێکی هەڵکێشا و وەهای بە دڵی خۆی گوت:

«خۆزیا ژیرتر بام! خۆزیا، وەک مار، لە بنەڕەت ژیر بووبام!

بەڵام داواکاری نەلوانم، کە وایە لە غرووروم داوا دەکەم کە هەمیشە هاودەمی ژیرییم بێ.

وە ئەگەر رۆژێک ژیرییم جێم بێڵێ ـ ئاخ کە ئەو حەزی لە فڕینە! بلا ئەودەم غرووروم دەگەڵ شێتایەتییم هەڵفڕێ!»

وەهای دەست پێکرد ئاوا بوونی زەردەشت.

## سەبارەت بە سێ شێوەگۆڕکە

سێ شێوەگۆڕکەی گیانتان بۆ ناو دەبەم: چلۆن گیان دەبێتە وشتر و وشتر شێر و لە ئاکام شێر، منداڵ.

گیان گەلێک شتی قورسی هەیە، ئەو گیانە بەهێزە سێبوورەی کە ڕێزگرتن تێیدا هێلانەی چێ کردوە: هێزەکەی ئاواتەخوازی قورس و قورسترین بارە.

گیانی سێبوور دەپرسێ: قورس کامەیە؟ ئاوا وەک وشتر ییخ دەخوا و دەیەوێ کە بە چاکی باری بکەن.

گیانی سێبوور دەپرسێ: قورسترین شت کامەیە، ئەی پاڵەوانان، هەتا لە کۆڵمی بنێم و بە هێزی خۆم شاد بم؟

ئایا ئەوە نیە: بێحورمەت کردنی خۆ بۆ بریندار کردنی غرووری خۆ؟ ئیزن بە گەوجایەتی خۆ دان بۆ درەوشانەوە هەتا گاڵتە بە زانایی خۆی بکا؟

یان ئەوەیە: دەست لە دڵخواز هەڵگرتن ئەودەم کە سەرکەوتنی خۆی جەژن دەگرێ؟ بە چیای بەرز هەڵگەڕان بۆ وە خولیا خستنی خولیاگەر؟

یان ئەوەیە: پێخۆر ساز کردن لە بەڕوو و گیای زانست و لەبەر خاتری راستەقینە لە برسێتی رەوان رەنج بردن؟

یان ئەوەیە: نەخۆش کەوتن و ناردنەوەی پەرستارەکان بۆ ماڵ و دۆستایەتی کردن دەگەڵ کەڕان کە قەت خواستی تۆ نابیسن؟

یان ئەوەیە: وە نێو ئاوی پیس کەوتن، هەرکات کە ئەمە ئاوی راستەقینە بێ و بۆقی سارد و وەزەخی گەرم لە خۆ نەتاراندن؟

یان ئەوەیە: خۆش ویستنی ئەو کەسانەی کە ئێمەیان پێ سووکە؛ دەستی دۆستایەتی بۆ لای تاپۆ درێژ کردن، ئەودەم کە دەیەوێ ئێمە بترسێنێ؟

گیانی سێبوور گشت ئەو شتە هەرە قورسانە لە کۆڵ دەنێ و وەک وشترێکی بارلێنراو کە بە غار دەچێتە سارا، بۆ لای سارای خۆی هەلینگ دەدا.

بەڵام لە چۆلترین سارا، شێوەگۆڕکەی دووهەم دەقەومێ: لێرە گیان دەبێتە شێر، بەڵام دەیەوێ ئازادی وە چنگ خا و لە سارای خۆی دا ببێتە سەرۆک.



ئەو لێرە دا لە دوایین سەرۆکی خۆی دەگەڕێ و دەگەڵ ئەو و دوایین خودای خۆی دوژمنایەتی هەیە. ئەو دەیەوێ بۆ سەرکەوتن بەرەنگاریی ئەژدیهای مەزن بکا.

چیە ئەو ئەژدیها مەزنەی کە گیان لەمە پتر نایەوێ ئەو بە سەرۆک و خودای خۆی دابنێ؟ ئەژدیهای مەزن ناوی «تۆ دەبێ»یە. بەڵام گیانی شێر دەڵێ: «من دەمەوێ!»

«تۆ دەبێ» بەر ڕێگای لێدەگرێ. ئەو گیاندارێکی پووڵەکەداری زێڕین ورشەیە کە لە سەر هەر پووڵەکەیەک «تۆ دەبێ» وەک زێڕ دەدرەوشێتەوە.

بایەخەکانی هەزار ساڵە لە سەر ئەم پووڵەکانە دەدرەوشێنەوە و بەهێزترین ئەژدیها وەها دەڵێ: «بایەخی شتەکان گشتی لە سەر من دەدرەوشێنەوە.»

«بایەخەکان گشتیان هەتاکوو ئێستا ئافراون و منم گشتی بایەخە ئافراوەکان. بە راستی «من دەمەوێ» ئیدی ناتوانێ لە ئارا دابێ!» ـ ئەژدیها وەها دەڵێ.

برایان، بۆچ لە گیان دا پێویستی بە شێر هەیە؟ بۆچی گیانداری بارەبەر، کە لێبوور و ڕێزگرە، بەس نیە؟

ئافراندنی بایەخە نوێیەکان ـ کارێکە کە شێریش نایتوانێ؛ بەڵام ئازادی ئافراندن بۆ خۆ، بۆ ئافراوی تازە ـ ئەوە کارێکە کە لە دەستەڵاتی شێر دایە.

ئافراندنی ئازادی بۆ خۆ و دەربڕینی «نا»یەکی پیرۆز تەنانەت لە ئاست ئەرکیش دا: بۆ ئەوە پێویستی بە شێر هەیە، برایان.

ماف ستاندن بۆ بایەخە نوێیەکان، بۆ گیانی سێبووری ڕێزگر، بە سامترین ستاندنە. بە راستی، لە روانگەی ئەوەوە ئەم کارە رفاندنە و ئیشی گیاندارێکی رفێنەر.

رۆژگارێک ئەو وەک پیرۆزترین شت ئەوینداری «تۆ دەبێ» بوو: بەڵام نووکە دەبێ لە پیرۆزترین شتیش دا گومان و خۆبڕوایی ببینێ، هەتا ئازادی لە چنگی ئەوینی خۆی برفێنێ: بۆ ئەم رفانە پێویستی بە شێرە.

بەڵام، برایان، بێژن: چیە ئەوەی کە منداڵ دەیتوانێ و شێر نایتوانێ؟ بۆچی ئەو شێرە رفێنەرە دەبێ ببێتە منداڵ؟

منداڵ، بێگوناهی و فەرامۆشییە، سەرەتایەکی نوێیە، یارییەکە، چەرخێکە خۆگەڕ، یەکەمین جووڵە، ئا ـ گوتنێکی پیرۆزە.

بەڵێ، برایان، بۆ یاری ئافراندن، ئا ـ گوتنێکی پیرۆز پێویستە: گیان ئێستا داخوازی ویستی **خۆ**یەتی. دونیا بزرکردوو، دونیای **خۆی** وەچنگ دەخاتەوە.

سێ شێوەگۆڕکەی گیانم بۆ هەڵدان: چلۆن گیان دەبێتە وشتر و وشتر شێر و لە ئاکام شێر، منداڵ.

وەهای گوت زەردەشت و ئەودەم لە شارێک دەژیا کە ناوی «مانگای ڕەنگاوڕەنگ» بوو.

## سەبارەت بە فێرکردنی ئاکارباشی

زەردەشت پەسنی زانایەکی بیست کە سەبارەت بە خەو و ئاکارباشی قسەی جوان دەکا و لەبەر ئەوە گەلێک ڕێزی لێدەنرا و پاداشتی وەردەگرت ـ و لاوەکان هەموو لە دەورەی کۆ دەبوونەوە. زەردەشت چوە لای و دەگەڵ لاوەکان لە کۆڕەکەی دانیشت. و زانا وەهای گوت:

ڕێز و شەرم لە ئاست خەو! ئەوە یەکەم شتە! لە بەدخەوان و شەونخوونان خۆ بپارێزن!

تەنانەت دزیش لە ئاست خەو دا شەرمنە و لە مەودای شەو دا هەمیشە بە ئەسپایی و پێدزە تێدەپەڕێ. بەڵام کێشکچی شەو بێشەرمە و کەڕەنای خۆی بە بێشەرمییەوە دەگێڕێ.

خەوتن هونەرێکی بچووک نیە: بۆ ئەو پێویستە کە سەراسەری ڕۆژ بەخەبەر بی.

ڕۆژانە دەبێ دە جار بە سەر خۆت دا زاڵ بی: چونکە ئەم کارە باش ماندووت دەکا و بۆ ڕەوان وەک تریاک وایە.

ئەوجار دەبێ دە جار دەگەڵ خۆت ئاشت بیەوە: چونکە زاڵ بوون دەبێتە هۆی ژیانتاڵی و هەر کەس ئاشت نەبووبێتەوە خراپ دەخەوێ.

ڕۆژانە دەبێ دە ڕاستەقینە بدۆزیەوە: دەنا شەوانەش خەریکی دۆزینەوەی



ڕاستەقینە دەبی و ڕەوانت برسی دەمێنێتەوە.

ڕۆژانە دەبێ دە جار پێبکەنی و شاد بی: دەنا گەدەی تۆ، ئەم باوکەی پەژارە، شەوانە ئازارت دەدا.

کەم کەس ئەوەی دەزانن: بەڵام بۆ باش خەوتن، دەبێ گشت ئاکارە باشەکانت هەبێ. ئایا شاهیدی بە درۆ بدەم؟ ئایا زینا بکەم؟

ئایا تەماح لە کڵفەتی هاوسا بکەم؟ ئەوانە هیچکامیان دەگەڵ خەوی خۆش سازگار نین.

تەنانەت کەسێک کە ئاکارەباشەکانیشی بە تەواوی هەیە، دیسان دەبێ شتێک بزانێ، ئەویش دەخەو کردنی ئاکارەباشەکانە دە کاتی خۆی دا.

هەتاکوو ئەو ژنە خڕیلە خوێن شیرنانە، لە سەر تۆ، ئەی بەدبەخت، دەگەڵ یەک بە کێشە نەیەن!

ئاشتی دەگەڵ خودا و هاوسا: خەوی خۆش وەها داوا دەکا. هەروەها ئاشتی دەگەڵ شەیتانی هاوسا! دەنا شەوانە دێتە زگت.

ڕێز بۆ کاربەدەستان و بە گوێ کردنیان و تەنانەت ڕێز بۆ کاربەدەستانی خواروخێچ: خەوی خۆش وەهای دەوێ. من چ دەتوانم بکەم کە دەستەڵات بە قاچی خواروخێچیش ڕێ بڕینی پێخۆشە؟

هەمیشە ئەو کەسەم پێ بە باشترین شوانە کە مێگەلەکەی بۆ باشترین مێرغوزاری زەنوێر و زەمەند دەبا: چونکە ئەوە پێوەندی دەگەڵ خەوی خۆش هەیە.

شانازی زۆر و پاشەکەوتی گەورەم ناوێن، چونکە گورچووبڕن. بەڵام بەبێ ناوێکی باش و پاشەکەوتێکی چووکەش ناکرێ ئاسوودە بخەوی.

کۆڕی چووکی هاودەمانم پێ لە کۆڕی هاودەمی خراپ باشترە: بەڵام هاودەمەکان دەبێ بە کات بێن و بە کات بڕۆنەوە. ئەوە دەگەڵ خەوی خۆش سازگارە.

«گیان هەژاران»یش لام خۆشەویستن. ئەوان خەو زیادتر دەکەن. ئەوان بەختەوەرن، بە تایبەت ئەگەر هەمیشە هەقیان پێبدرێ.

رۆژ وەها بە سەر ئاكارباش دا تێدەپەڕێ. كە شەو دابێ، خۆ دەپارێزم لەوەی كە خەو بانگ بكەم، ئەو خودایەی ئاكارباشی پێیخۆش نیە كە بانگ بكردرێ!

بەڵكە، بیر دەكەمەوە كە سەراسەری رۆژ چم كردوە و بیرم لە چی كردۆتەوە و بە كاوەخۆ وەک گا، بە كاوێژ، لە خۆم دەپرسم: ئەرێ، دە زاڵ بوونەكەت چ بوون؟

چ بوون دە ئاشتی و دە راستەقینە و دە پێكەنینەكەت كە دڵتیان رازی كردبێ؟

هەروا لە سەر ئەوانە وچان دەگرم و لە لانكەی چل خەیاڵی خۆم دا رادەژێم، لەپڕ، خەو، ئەو بانگ نەكراوە، ئەو خودایەی ئاكارباشی، بە سەر من دا زاڵ دەبێ.

خەو چاوەكانم دەكوتێ و چاوەكانم قورس دەبن. خەو دەست لە زارم هەڵدەسوێ و زارم ئاوەڵە دەمێنێتەوە.

بە راستی، ئەو بەڕێزترین دزە، بە پێدزە دێتە زگم و خەیاڵەكانم لێدەدزێ: ئەودەم من وەک ئەم كورسیە گێژ دەوەستم.

بەڵام ئیدی هێندە ناوەستم: چون، ئەودەم دەحەسێمەوە.

زەردەشت كاتێک قسەكانی زانای بیست، لە دڵە خۆی دا پێكەنی: چونكە لەو قسانە پڕشنگێكی بۆ دەركەوتبوو. و وەهای بە دڵی خۆی گوت:

ئەم زانایە بە چل خەیاڵیەوە لە روانگەی منەوە گەوجێكە: بەڵام دڵنیام كە رێ و چارەی خەوتن باش دەزانێ.

بەختیار ئەو كەسەیە كە لە نزیک ئەم زانایە ماڵی هەیە! وەها خەوێک ئاهۆیە، بەڵێ، تەنانەت لە دیوارێكی ئەستووریش بڕ دەكا و بڵاو دەبێتەوە.

لە فێر كردنیشی دا جادوویەک هەیە و لاوەكان بێهۆ لە كۆڕی وێژەری ئاكارباشی دا دانەنیشتوون.

ئەوەیە زانستی ئەو: بەخەبەر بە هەتا باش بخەوی. بە راستی ئەگەر ژیان مانایەكی نەبا و من ناچار بام بێمانایییم هەڵبژاردبا، بۆ من هەڵبژاردەترین بێمانایی هەر ئەوە دەبوو.



نووكە لێم روونە كە مرۆڤ ئەودەم كە بە شوێن وێژەرانی ئاكارباشییەوە بوو، پتر لە هەموو شتێک بە شوێن چیەوە بوو: بە شوێن خەوێكی خۆش و ئاكارباشی خاشخاشكانەوە بوو!

زانست لای هەموو ئەم زانا فێركەرانە، خەوتنی بێ خەون دیتن بوو: بۆ ژیان مانایەكی باشتریان نەدەناسی.

ئەمڕۆكەش تاقمێک هەر وەک ئەم وێژەرەی ئاكارباشین و هەمیشە ئاوا راستوێژ نین: بەڵام رۆژگاریان بەسەر چوە و ئیدی پتر لەوە بە پێوە نابن. چونكە هەر ئێستاكە راكشاون.

خەواڵووكان بەختەوەرن، چونكە بەم زوانە دەبێ لێی بخەون.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە خەڵكی ئاخرەت

رۆژێک زەردەشتیش، وەک هەموو **خەڵكی ئاخرەت** گومانی خۆی بۆ ئەوپەڕی مرۆڤ نارد. ئەودەم دونیای ئافراوی خودام بە كارێكی كۆڵەوار و دەردەدار هاتە بەر چاو.

ئەوسا دونیام بە خەونێک و بە شێعرێكی هەڵبەستراوی خودایەک هاتە بەر زەین؛ هەڵمێكی رەنگین لەبەر نیگای نارەزایەتییەكی خودایانە.

چاكە و خراپە، خۆشی و رەنج، و من و تۆ لە بەر زەینم بوون بە هەڵمێكی رەنگین لە پێش چاوەكانی ئافرێنەر. ئافرێنەر دەیەویست چاو لە سەر خۆی هەڵگرێ، هەر بۆیە دونیای ئافراند.

بۆ دەردەدار چاو لە سەر دەردی خۆ هەڵگرتن و خۆ بزر كردن، خۆشییەكی مەستانەیە. رۆژێک دونیا لەبەر چاوم بوو بە خۆشییەكی مەستانە و خۆ بزر كردن.

رۆژێک دونیام وەها هاتە بەر چاو: ئەم دونیا هەرمانە ناتەواوە، نەقشێكە لە دژایەتییەكی هەرمان، نەقشێكی ناتەواو و خۆشییەكی مەستانەیە بۆ ئافرێنەرە ناتەواوەكەی ئەو.

ئاوا منیش، وەک هەمووخەڵکی ئاخرەت، جارێکان گومانی خۆم ناردە ئەوپەڕی مرۆڤ. ئایا، بە راستی، بەوپەڕی مرۆڤ؟

ئاخ، برایان، ئەو خودایەی کە من ئافراندم، وەک هەموو خوداکان دەستکردی مرۆڤ و شێتایەتی مرۆڤ بوو!

ئەو مرۆڤ بوو و تەنیا بەشێکی هەژارانە لە مرۆڤ و من: ئەم تاپۆیە لە دەروونی پۆلوو و ژیلەمۆی منەوە بۆ لای من هات. بەراستی، لەو لاوە بۆ لای من نەهات!

چ قەوما، برایان؟ من بە سەر خۆم، بە سەر ئەو دەردەدارە دا زاڵ بووم، من ژیلەمۆکەی خۆم بردە کوێستان و بڵێسەیەکی بە گڕترم بۆ خۆم هەڵایساند. بڕوانن! تاپۆ لە من تارا!

نووکە بڕوا هەبوون بە وەها تاپۆگەلێک بۆ منی چاک بۆوە هۆی دەرد و عەزابە، نووکە بۆ من هۆی دەرد و بێحورمەتییە. بە خەڵکی ئاخرەت وەها دەڵێم.

دەرد و بێهێزی بوو کە گشت ئاخرەتەکانی ساز کرد و ئەو شێتایەتییە کورتە سەرکەوتووییە کە تەنیا دەردەدارترین کەسان پێیدەگەن.

ماندوویەتی بوو کە گشت خوداکان و ئاخرەتەکانی ئافراند، ماندوویەتییەک کە دەیەوێ بە بازێک، بازی مەرگ، بگاتە ئاخر؛ ماندوویەتییەکی هەژار و نەفام، کە تەنانەت چیدی «ویستن» ی ناوێ.

باوەڕم پێبکەن، برایان! ئەوە لەش بوو کە لە لەش ناهومێد بوو ـ کە ئەنگوستەکانی گیانی فریودراوی خۆی لە دیوارەکانی ئاخری هەڵسوو.

باوەڕم پێبکەن، برایان! ئەوە لەش بوو کە لە زەوی ناهومێد بوو ـ کاتێک بیستی کە زگی **بوون** دەگەڵ ئەو دەدوێ.

ئەودەم ویستی کە بە سەر و تەنیا بە سەر، بە نێو دیوارەکانی ئاخری دا تێپەڕێ و خۆ بگەیەنێتە «دونیای دی» .

بەڵام «دونیای دی» زۆر لە مرۆڤ شاراوەیە، ئەو دونیا نامرۆڤانەی لە مرۆڤ بەری کە «هیچ» ێکی ئاسمانییە و زگی بوون دەگەڵ مرۆڤ جگە لە چەشنی مرۆڤ نادوێ.

بە راستی، سەلماندنی بوونی گشتی دژوارە و وەقسە هێنانیشی دژوار.



سەرەڕای ئەوە، برایان پێم بڵێن، مەگەر هەر ئەوە نیە کە شتە هەرە سەیرەکان باشتر لە هەر شتێک سەلمێندراون؟

ئادی، ئەم منە و شێواویی و دژایەتی من، لە بوونی خۆیان راستتر لە هەموان دەدوێن ـ ئەم منە ئافرێنەرە، خوازیارە، بایەخدانەرە، کە دەستەڵات و بایەخی شتەکانە.

ئەم راستوێژترین بوونەوەرە، ئەم منە، لە لەش دەدوێ و دیسان ئاواتەکەی لەشە، تەنانەت ئەودەم کە شێعر دەهۆنێتەوە و خەیاڵ دەرێسێ و بە باڵی شکاویەوە باڵەفرکەیەتی.

من هەر دێ و باشتر فێرە قسە دەبێ: هەر چەند پتر فێر دەبێ، بۆ لەش و زەوی وشە و شەرەفی زێتر دەدۆزێتەوە.

منی من غرورێکی تازەی فێر کردم و من ئەوەی فێرە مرۆڤ دەکەم: ئیدی سەری خۆ لە نێو رەڵمی شتەکانی ئاسمانی رۆنەنان، بەڵکە ئازادانە ئەو لە کۆڵ نان، وەک سەرێکی زەمینی کە بۆ زەوی مانا دەئافرێنێ.

من مرۆڤ فێرە ویستێکی نوێ دەکەم: ویستنی هەر ئەو رێگایەی کە مرۆڤ کوێرانە بڕیویەتی و بە باش زانینی ئەو و لێلانەدانی، بە پێچەوانەی نەخۆشەکان و سەرەمەرگەکان!

نەخۆشەکان و سەرەمەرگەکان بوون کە قینیان لە لەش و زەوی هەڵگرت و ئاسمان و دڵۆپەخوێنە کڕدراوەکانیان ساز کرد: بەڵام تەنانەت ئەم ژارەشیرین و غەمێنەرەشیان لە لەش و زەوی وەرگرتەوە.

دەیانەویست لە چارەڕەشی خۆیان راکەن و هەسێرەکان گەلێک لەوان دوور بوون. ئەوسا ئاخێکیان هەڵکێشا: «خۆزیا بۆ خۆدزینەوە بەرەو بوونێکی دی و بەختیارییەکی نوێ رێگاگەلێکی ئاسمانی هەبا!» ئەودەم رێگاگەلی نهێنی و قومە خوێنەکانیان بۆ خۆیان دیتەوە.

ئەم سپلانە پێیان وابوو کە نووکە لە لەشی خۆیان و لەم زەوییە جیا بوونەتەوە. بەڵام لەرز و سەرخۆشی جیابوونەوەی خۆیان لە کێ دەزانن؟ بە لەشەکانی خۆیان و بەم زەوییە.

زەردەشت دەگەڵ نەخۆشان لەسەرەخۆیە. بە راستی، لە شێوەی ئۆقرە گرتن

و له سپڵەییان قەڵس نیە، بڵا کە بێنە نێو ریزی چاک بوان و زاڵ بوان و لەشێکی بەرزتر بۆ خۆیان بافرێنن!

هەروەتر زەردەشت لەو چاک بۆوەی کە بە دڵۆڤانییەوە دەڕوانێتە خەیاڵەکانی خۆی و نیوەشەوانە بە دزی بە پەنا گۆڕی خوداکەی دا تێدەپەڕێ، قەڵس نیە. بەڵام فرمێسکەکانی ئەو بۆ من هێشتا نیشانەیەکن لە نەخۆشی و لەشی نەخۆش.

لە نێو شاعیران و خوداپەرستان دا هەمیشە خەڵکی نەخۆش زۆر بوون: ئەوان رک و کینیان لە پیاوی زانا دەبێتەوە و هەروەتر لە لاوترین ئاکارباشی کە ناوی «راستی» یە.

ئەوان هەمیشە ئاوڕ لە رۆژگارە تاریکەکان دەدەنەوە: لەو رۆژگارانە، بە راستی بێبڕوایی و بڕوا شتێکی دیکە بوو و تووڕەیی ئەقڵ هاوتایەتی دەگەڵ خودا بوو و گومان بە گوناه دادەندرا.

من ئەو شێوە خودایانە زۆر باش دەناسم: ئەوان دەیانەوێ خەڵک ئیمانیان پێیان هەبێ و گومان گوناه بێ و زۆر باش دەزانم کە ئەوان پتر لە هەموو شتێک ئیمانیان بە چیە.

بە راستی، نە بە ئاخرەت و دڵۆپە خوێنە کڕدراوەکان کە پتر لە هەموان ئیمانیان بە لەش هەیە و لەشیان بۆ ئەوان هەر ئەو «شتەی نێو خۆ» یانە.

بەڵام لەش بۆ ئەوان شتێکی نەخۆشانەیە و زۆریان پێخۆشە کە لە پێستی خۆیان بێنە دەر. لەبەر ئەوە، گوێ دەدێرنە موعیزەکەرانی مەرگ و خۆیان ئاخرەت موعیزە دەکەن.

برایان، لە جیات ئەوە چاک گوێ لە هاواری لەش بگرن، ئەوە هاوارێکە پاکتر و دروستتر.

لەشی ساغ، لەشی تەواو و رێک و پێک، پاکتر و دروستتر قسە دەکا: و باسەکەی لەمەڕ مانای زەوییە.

وەهای گوت زەردەشت.



## سەبارەت بە بەسووکدانەرانی لەش

دەمەوێ قسەی خۆم دەگەڵ بەسووکدانەرانی لەش بێنمە گۆڕ. نامەوێ سەرلەنوێ فێر بن و سەرلەنوێ فێر کەن، بەڵکە، تەنیا ماڵاوایی لە لەشیان بکەن ـ و بەمجۆرە لاڵ بن.

«من لەش و رەوانم» ـ منداڵ وەها دەڵێ و بۆچ مرۆڤ نابێ وەک منداڵ قسە بکا؟

بەڵام پیاوی وریای زانا دەڵێ: من بە تەواوەتی لەشم و جگە لەو هیچ و رەوان تەنیا وشەیەکە بۆ شتێک لە نێو لەش دا.

لەش ئەقڵێکی مەزنە، زۆربەیەکە دەگەڵ یەک هەست، شەڕێک و ئاشتییەک، گەلەیەک و شوانێک.

کاکە، ئەقڵی بچووکت، کە بە «گیان»ی ناو دەبەی ئامرازی لەشی تۆیە، ئامراز و لەیستووکێکی چووک بۆ ئەقڵی مەزنت.

دەڵێی «من» و شانازی بەو وشەیە دەکەی. بەڵام لەوە مەزنتر ـ کە ناتەوێ باوەڕت پێیهەبێ ـ لەشی تۆیە و ئەقڵە مەزنەکەی ئەو، کە «من» ناڵێ، بەڵام «من» بەکار دێنێ.

ئاکامی ئەوەی هەست هەستی پێدەکا و ئەوەی گیان دەیناسێ هیچکات لە خودی ئەو دانیە. بەڵام هەست و گیان دەیانەوێ بە تۆ بسەلمێنن کە ئەوان ئاکامی هەموو شتێکن: هەتا ئەم رادەیە خۆخوازن.

هەست و گیان ئامراز و لەیستووکن: لە پشت ئەوان دا خۆ شاردراوەتەوە. خۆ بە چاوەکانی هەست دەگەڕێ و بە گوێیەکانی گیان دەبیسێ.

خۆ هەمیشە دەبیسێ و دەگەڕێ: هەڵدەسەنگێنێ، زاڵ دەبێ، داگیر دەکا، وێران دەکا. ئەو فەرمان دەدا و لە سەر «من»یش فەرماندەرە.

کاکە، لە پشتەوەی بیر و هەستەکانت فەرماندەرێکی بە هێز وەستاوە، زانایەکی نەناسیاو ـ کە ناوی خۆ یە. ئەو لە لەشی تۆ دا دەژی، ئەو لەشی تۆیە.

لە لەشت دا ئەقڵ لە باشترین زانایيت پترە و کێ دەزانێ لەشی تۆ بە راستی بۆ پێویستی بە باشترین زانایيت هەیە؟

خودی تۆ بە منی تۆ و بازی لەخۆبایییانەی پێدەکەنێ و بە خۆ دەڵێ، «ئەم باز و فڕینانەی بیر لای من چین؟ ڕێگایەکە نێوبڕ بۆ لای ئامانجی من. منم بەندی نێوکی من و هاندەری بۆچوونەکانی.»

خۆ بە من دەڵێ: «لێرە هەست بە ئێش بکە!» ئەوسا ئەو رەنج دەبا و بیر دەکاتەوە کە چلۆن دوایی بە رەنجی خۆی بێنێ ـ و بۆ ئەوە دەبێ بیر بکاتەوە.

خۆ بە من دەڵێ: «لێرە هەست بە خۆشی بکە!» ئەوسا ئەو شادی دەکا و بیر دەکاتەوە کە چلۆن دیسان خۆش بێ ـ و بۆ ئەوە بیر دەکاتەوە.

دەمەوێ دەگەڵ بەسووکدانەرانی لەش قسە بکەم. بە سووک دانانیان ڕێزی ئەوانە. چیە ئەوەی ڕێز و سووکایەتی و بایەخ و ویستنی ئافراند؟

خۆی ئافرێنەر ڕێز و سووکایەتی ئافراند، خۆشی و رەنجی ئافراند. لەشی ئافرێنەر گیانی هەروەک دەستێک بۆ ویستی خۆی ئافراند.

ئێوە بەسووکدانەرانی لەش، تەنانەت بەبێ ئەقڵی و بە سووک دانانتان، خزمەتی خودی خۆ دەکەن. بە ئێوە دەڵێم: خۆیەکەتان دەیەوێ بمرێ و لە ژیان خۆ بکێشێتەوە.

خۆیەکەتان ئیدی ناتوانێ ئەو کارەی بکا کە پتر لە هەموو شتێک دەیەوێ، یانی ئەوپەڕی خۆ ئافراندن: ئەوەیە کە ئەو پتر لە هەموو شتێک دەیەوێ؛ ئەوەیە تەواوی تاسەی ئەو.

بەڵام نووکە بۆ ئەو کارە زۆر دەرنگە. لەبەر ئەوە خۆیەکەتان داخوازی فەوتانە، ئەی بەسووکدانەرانی لەش.

خۆیەکەتان داخوازی فەوتانە و لەبەر ئەوە ئێوە بوونە بەسووکدانەرانی لەش! چونکە ئیدی ئەوپەڕی خۆ ئافراندنتان لە دەست نایە.

لەبەر ئەوە، نووکە لە زەوی و ژیان تووڕەن. لە نیگای خێلانەی بە سووک دانانی ئێوە دا ئێرەییەکی پێنەزانراو هەیە.

من بە ڕێی ئێوە دا ناڕۆم، ئێوە ئەی بەسووکدانەرانی لەش! ئێوە بۆ من ئەو پردانە نین کە بەرەو بەرزەمرۆڤم بەرن!

وەهای گوت زەردەشت.



## سەبارەت بە تاسەکان و شادیەکان

کاکە، ئەگەر ئاکارباشییەکت هەیە و ئەو ئاکارباشییە هی تۆیە، لە خاوەنیەتی دا دەگەڵ هیچکەس شەریک نی.

بێگومان، دەتەوێ ناودێری بکەی و بیلاوێنیەوە: دەتەوێ گوێی بکێشی و دڵت پێی لەخۆ بێتەوە.

بڕوانە! ناوی ئەو لە نێوان تۆ و خەڵک دا هاوبەش بوە و تۆ بە ئاکارباشییت چوویە ریزی خەڵک و گەلەوە.

وا باشترە کە بڵێی: «ئەوەی ڕەوانم ئازار دەدا و زارم شیرین دەکا و هۆی برسیایەتی دەروونمە، نادرکێندرێ و بێناوە.

بلا ئاکارباشیت پلەبەرزتر لەوە بێ کە ناوەکان بتوانن دەگەڵی ناسیاو بن: و ئەگەر پێویستە باسی بکەی، لەوە کە بە زمانێکی تێکهالاو قسە بکەی شەرمەزار مەبە.

وەها بڵێ و بە زمانی تێکهالاو بڵێ: «ئەوەیە چاکەی **من** و ئەوەم خۆش دەوێ. بەمجۆرە بە گشتی جێی خۆشحاڵی منە. من چاکەم تەنیا بەمجۆرە دەوێ.

نە وەک ئایینێکی خودا دەمەوێ، نەوەک قانوون یا پێویستی مرۆڤ؛ بلا نەبێ ئەو کەسەی کە ڕێ پێشاندەری من بۆ ڕێگاکانی مەلەکووت و بەهەشتە .

ئەوەی کە من ئەوینداری ئەوم، ئاکارباشییەکی زەوینییە؛ ژیریی کەم تێدایە و ئەقڵی گشتیش لە هەموان کەمتر.

بەڵام، ئەم مەلە لە پەنای من هێلانەی چێ کردوە: هەر بۆیە خۆشم دەوێ و بە خێوی دەکەم ـ نووکە لە پەنام لە سەر هێلکە زێڕنەکانی هەڵدەنیشێ.»

وەها دەبێ بە زمانی تێکهالاوەوە بە ئاکارباشی خۆت هەڵبلێی.

سەردەمایەک تۆ تاسەگەلێکت هەبوو کە ئەوان بە خراپەیان ناو دەبرد. بەڵام نووکە، تەنیا خاوەنی ئاکارەباشەکانی خۆتی: ئەوان لە کانگای تاسەکانتەوە سەر هەڵدەدەن.

مەزنترین ئامانجت لە دڵی ئەو تاسەیانە نا: ئەودەم ئاکارەباشەکان و

شادیەکانت گووران.

تۆ لە رەگەزی توورەکان بی یا لە هەوەسبازەکان یا ئیماندارە توندەکان یا رق ئەستوورەکان:

لە ئاکام تاسەکانت هەموو بوونە ئاکارباشی و شەیتانەکانت هەموو بوونە فریشتە.

سەردەمایەک سەگی درِت لە ژێرخانی خۆت دا هەبوون: کەچی لە ئاکام ئەوان بوون بە مەل و سترانبێژانی دەنگخۆش.

بە ژارەکانی خۆت هەتوانت بۆ خۆت ساز کرد: مانگای غەمت دۆشی: نووکە شیری شیرینی گوانی دەخۆیەوە.

لەوە بەدوا هیچ خراپەیەک لە تۆوە سەر هەڵنادا، مەگەر ئەو خراپەی کە لە کێشەی نێوان ئاکارباشییەکانت سەر هەڵدەدا.

کاکە، ئەگەر تۆ بەختیار بی تاکە ئاکارێکی باشت دەبێ و بەس: ئاوا سووکتر بە سەر پرد دا دەرۆی.

ئاکارباشی زۆر هەوی پێک هێنانی کەسایەتییە، بەڵام چارەنووسێکی دڵتەزێنە؛ گەلێک کەس روویان لە سارا کرد و خۆیان کوشت، چونکە لە شەڕ و شەرگەی ئاکارەباشەکان وە گیان هاتبوون.

کاکە، ئایا شەڕ و کێشە خراپە؟ بەڵام ئەم خراپە، پێویستە. ئێرەیی و بەدگومانی و خراپەوێژی لە نێوان ئاکارەباشەکانت دا پێویستە.

بڕوانە چلۆن هەر کام لە ئاکارەباشەکانت ئاواتەخوازی بەرزترین جێگایە: ئەو هەموو گیانتی دەوێ، هەتا گیانت جاڕدەری ئەو بێ. ئەو هەموو هێزی تۆی لە تووڕەیی، رق و ئەوین دا دەوێ.

هەر ئاکارێکی باش ئێرەیی بە ئاکارەباشەکانی دیکە دەبا و ئێرەیی شتێکی بەسامە، وێدەچێ ئاکارباشییەکان بە ئێرەیی بفەوتێن.

کەسێک کە ئاگری ئێرەیی دایبگرێ، لە ئاکام وەک دووپشک چزووی ژارداری خۆی بۆ لای خۆی دەگەڕێنێتەوە.

ئاخ براکەم، قەت ئاکارباشییەکت نەدیوە کە باسی خراپەی خۆی بکا و بە



خۆیەوە بدا؟

مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی: و لەبەر ئەوە دەبێ ئاکارە باشەکانت خۆش بوێ ـ چونکە بەوان دەفەوتێی.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە تاوانکاری رەنگ بزڕکاو

ئێوە قازییەکان و قوربانیکەران هەتا حەیوان مل کەچ نەکا، تەمای کوشتنەوەی ناگرن؟ بڕوانن، تاوانکاری رەنگ بزڕکاو ملی کەچ کردوە و لە چاوەکانیەوە سووکایەتی گەورە قسە دەکا.

ئەو لە نێو ئەو چاوە دا وەها دەڵێ: «منی من شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی: منی من بۆ من سووکایەتی گەورەی مرۆڤە.»

کە ئەو لە سەر خۆ قەزاوەتی کرد بەرزترین دەمی ئەو بوو. مەهێڵن کە پیاوی بەرزەوەکراو بۆ نزمایی خۆی بگەڕێتەوە!

ئەو کەسەی کە لە وەها لە خۆی داخدارە، جگە لە مەرگی لە نەکاو دەرووییەکی دیکەی نیە.

کوشتارێک کە ئێوە قازییەکان دەیکەن دەبێ لەبەر هاودەردی بێ نەک تۆڵە و بزانن کە بەم کوشتارە، ئێوە خودی ژیان بە هەق دەکەن!

ئاشت بوونەوە دەگەڵ ئەو کەسەی کە دەیکووژن بەس نیە؛ ئەگەر پەشێوییتان ئەوینی بەرزەمرۆڤ بێ، بەمجۆرە ئێوە زیندوو مانەوەتان بەهەق دەکەن!

دەبێ بێژن «دوژمن»، نەک «بەدخواز»؛ دەبێ بێژن «نەخۆش»، نەک «رەزیل»؛ دەبێ بێژن «گەوج»، نەک «گوناهکار».

و تۆ ئەی قازیی سوور، ئەگەر تەواوی ئەوەی کە هەتا ئێستا لە بیرت دا ئەنجامت داوە، بە دەنگی بەرز گوتبات، گشتیان هاواریان دەکرد کە: «دوور بێ ئەم چەپەڵیە، ئەم کرمە ژاراوییە!»

بەڵام بیر شتێکە، ئاکار شتێکی دیکە و وێنەی ئاکار شتێکی دیکەیە: چەرخی هۆکاریی لە نێوانیان دا ناگەڕێ.

خەیاڵێک ئەم پیاوە رەنگ بزڕکاوەی رەنگ بزڕکاو کرد. ئەودەم کە دەستی بۆ کار دەبرد قەوەی بە کاری خۆی دەشکا: بەڵام کاتێک ئەو کارە کردرا، لە خەیاڵی دا نەگونجا.

نووکە هەمیشە خۆی وەک کەسێک دەبینێ کە کارێکی کردوە. من ئەوە بە شێتایەتی ناو دەبەم. فەرع لەو دا وەک ئەسڵی لێهاتوە.

جەغزێک بە دەوری مریشک دا کێشان ئەو هەڵدەفریوێنێ؛ خەتێک کە ئەو کێشای ئەقڵی بەستەزمانی ئەوی هەڵفریواند. من ئەوە بە شێتایەتی دوای هەڵوێست دەزانم.

گوێ بگرن، ئەی قازییەکان! شێتایەتییەکی دیکەش هەیە: شێتایەتی بەر لە هەڵوێست. ئاخ کە ئێوە ئەوەند کە پێویستە نەچوونە ناخی ئەو رەوانەوە!

قازیی سوور وەها دەڵێ: «ئەم تاوانبارە بۆچی دەستی لە جەنایەت دا؟ ئەو بە تەمای دزی بوو.» بەڵام من بە ئێوە دەڵێم: رەوانی ئەو داوای خوێن دەکا نەک دزی: ئەو تینووی نەشەی کێرد بوو!

بەڵام ئەقڵی بەستەزمانی ئەو، ئەم شێتایەتییەی هەست پێنەکرد و ئەوی ئاوا هەڵفریواند و گوتی: «چ کەلکی هەیە خوێن؟ لانی کەم ناتەوێ دزییەکیش بکەی؟ تۆڵەیەک بستێنیەوە؟»

ئەو گوێی لە ئەقڵی بەستەزمانی گرت و قسەی ئەو وەک سورب قورسایی لە سەر کرد ـ بەمجۆرە هەروا کە جەنایەتی دەکرد، دزیشی دەکرد. ئەو نەیدەویست لە شێتایەتییەکەی شەرمەزار بێ.

نووکە دیسان سوربی گوناە قورسایی لە سەر دەکا و دیسان ئەقڵی بەستەزمانی ئەو وەها سست، وەها لە کەلک کەوتوو، وەها قورس بوە.

ئەگەر تەنیا توانیبای سەری بلەقێنێتەوە، باری دادەکەوت: بەڵام کێ دەتوانێ ئەم سەرە بلەقێنێتەوە؟

چیە ئەم مرۆڤە؟ کۆمایەک نەخۆشی کە لە رێگای گیانەوە دونیا داگیر دەکەن و لەوێ وەدوای نێچیری خۆیان دەکەون.

چیە ئەم مرۆڤە؟ ماشەرێک ماری کێوی کە دەگەڵ یەک کەمتر دەحاوێنەوە ـ کەوایە، هەر کامیان رێی خۆیان دەگرنە بەر و لە دونیا دا وەدوای نێچیری خۆیان



دەکەون.

ئەم لەشە بەستەزمانە چاو لێکەن! ئەوەی کە ئەم لەشەی ئازار دەدا و داوای دەکرد، ئەم رەوانە بەستەزمانە لەبەر خۆی لێکیداوە!، لێکیداوە کە ئەوە تاسەی جەنایەتە و تەماحی نەشەی کێرد.

ئەوەی ئێستا نەخۆش بکەوێ، ئەوەی ئێستا خراپ بێ، خراپە پەلاماری دەدا: ئەوەی کە ئازاری بدا ئازاری دەدا. بەڵام رۆژگاری دیکەش هەبوە و چاکە و خراپەی دیکەش.

رۆژگارێک شک و ویستی خۆخواز خراپە بوو. لەو رۆژگارە دا نەخۆش دەبوو بە دانەری ئایینی نوێ و جادووگەر و، وەک دانەری ئایینی نوێ و جادووگەر عەزابی دەدیت و دەیەویست کە عەزاب بدا.

بەڵام ئەم قسەیەتان بە گوێ دا ناچێ. بە من دەڵێن کە ئەم قسەیە زیان بە پیاوچاکانی نێو ئێوە دەگەیەنێ. بەڵام پیاوچاکانی ئێوە لای من چ رێزێکیان هەیە!

لە زۆر شتی پیاوچاکانی ئێوە بێزم هەڵدەستێ؛ بەڵام بە راستی، نەک لە خراپەیەک کە لە دەروونیان دایە. خۆزیا ئەوان شێتایەتییەکیان هەبا کە پێی فەوتابان وەک ئەم تاوانکارە رەنگ بزڕکاوە.

بە راستی، ئاواتم دەخواست شێتایەتییەکەیان ناوی راستەقینە یا ئەمەگداری یا عەداڵەت با. بەڵام ئەوان ئاکارباشیان بۆ ئەوە هەیە کە زۆر و لە ئاسوودەیی خەفەتبار دا بژین.

من دەسگرەیەکم لە پەنا لافاو، ئەوەی کە توانای خۆ پێهەڵواسینی هەیە، با خۆم پێهەڵواسێ! بەڵام شەقەی بن هەنگڵی ئێوە نیم.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە خوێندنەوە و نووسین

لە نێوان گشت نووسراوەکان دا تەنیا ئەوم خۆش دەوێ کە کەسێک بە خوێنی خۆی نووسیبێی. بە خوێن بنووسە هەتا بەوە بگەی کە خوێن گیانە.

دە خوێنی بێگانە گەیشتن سانا نیە: لە چاو پێداخشێنەران بێزارم.

ئەوەی کە خوێنەر بناسێ، ئیدی بۆ خوێنەر کارێک ناکا. سەدەیەکی دیکە لە وەها خوێنەرانێک، گنخانی گیانی بە دواوە دەبێ.

ئەوەی کە هەر کەس ئیزنی فێربوونی خوێندنەوەی هەبێ، لە ئاکام دا نەک هەر نووسین، بەڵکە بیر کردنەوەش دەفەوتێنێ.

رۆژگارێک گیان خودا بوو و لە دوایی بوو بە مرۆڤ و نووکە دەبێتە عەوام.

ئەوەی کە بە خوێن و زمانی بیر دەنووسێ، نایەوێ نووسراوەکانی بخوێننەوە، بەڵکەم دەیەوێ لەبەری بکەن.

کورتترین رێ لە کوێستان دا دونداودوندە؛ بەڵام بۆ ئەوە تۆ قاچی درێژت پێویستە. زمانی بیرەکان دەبێ دوندەکان بن و ئەوانەی کە رووی قسەیان تێیە، کەڵەگەت و باڵابەرز.

هەوا ناسک و پاکە، مەترسی نزیک و گیان لێوڕێژ لە بەدخوازییەکی شاد: ئەوانە لێک دێنەوە.

دەمەوێ جندۆکە لە دەورەم بن، چونکە من بوێرم. بوێرێک کە تاپۆکان دەتارێنێ و بۆ خۆیان جندۆکە دەخوڵقێنن ـ بوێریی، دەیەوێ پێبکەنێ.

من ئیدی لەمە پتر هەستەکانم دەگەڵ ئێوە بەش ناکەم: ئەو هەورەی کە من لە ژێر پێم دەیبینم، ئەم رەشایی و قورساییەی کە پێکەنینم پێیدێتێ ـ ئەوە هەمان هەوری بە گرمەی ئێوەیە.

ئێوە ئەودەم کە ئاواتەخوازی عرووجن، چاو لە سەرەوە دەکەن و من چاو لە خوارەوە ـ چونکە عرووجم کردوە.

کێ دەتوانێ لە نێو ئێوە دا هەم پێبکەنێ و هەم عرووجی کردبێ؟

ئەو کەسەی کە دەچێتە سەر ترۆپکی بەرزترین کێو، بە هەموو نمایشە



غەمێنەرەکان و بە راستی دانانی غەمێنەرەکان پێدەکەنێ.

ئەقڵ ئێمەی وەها دەوێ: کەمتەرخەم، فێڵەزان، دڕ. ئەو ژنە و تەنیا هەر شەڕکەرانی خۆش دەوێ.

ئێوە بە من دەڵێن: «بەرگەی ژیان گرتن دژوارە» کەوایە غرووری بەرەبەیان و تەسلیمی شەوانەتان لە چیە؟

بەرگەی ژیان گرتن دژوارە: بەڵام خۆت وا ناسک و نازدار مەنوێنە! ئێمە هەموومان نێرەکەر و ماکەری باشی بارەبەرین!

ئێمە چ پێوەندییەکمان بە غونچەی گوڵەباغێکەوە هەیە کە بە وێکەوتنی ئاونگێک وە لەشی، لەشی دەلەرزێ؟

ئەوە راستە: ئێمە ژیانمان خۆش دەوێ، نەک لەبەر ئەوەی کە خوومان بە ژیان گرتوە بەڵکەم لەبەر ئەوەی کە خوومان بە خۆشەویستی گرتوە.

ئەوین هەمیشە برێک شێتایەتی تێدایە. بەڵام شێتایەتییش هەمیشە برێک ئەقڵی تێدایە.

هەروەتر، بە بڕوای من، کە نێوانم دەگەڵ ژیان هەیە، پەپوولەکان و پۆرگەکانی سابوون و هەمووی ئەوانەی لە نێو مرۆڤ دا لە رەگەزی ئەوانن، بەختیاری لە هەموو کەس باشتر دەناسن.

دیتنی باڵەفڕکەی ئەم رەوانە چووک و سووک و شێت و بزۆزە زەردەشت دەخاتە گریان و گۆرانی گوتن.

تەنیا بڕوام بەو خودایە هەیە کە سەما کردن بزانێ.

و کاتێک شەیتانەکەی خۆم دیت، ئەوم بە زیپک و زاکون، پڕ و تەواو، مەند و بە هەیبەت هاتە بەر چاو: ئەو گیانقورسی بوو ـ و بە هۆی ئەوەوەیە کە هەموو شت دادەکەوێ.

پیاو بە پێکەنینەوە دەکووژێ نە بە رق. رابە هەتا «گیانقورسی» بکووژین!

کە رێ رۆیشتن فێر بووم، ئەوسا خەریکی راکردن بووم؛ کە فێرە فڕین بووم؛ ئەوسا ئیدی پێویستم بەوە نیە کە بۆ جووڵانەوە، بمجووڵێننەوە.

نووکە سووکبارم، نووکە دەفڕم، نووکە من خۆم لە ژێر پێی خۆم دا دەبینم.

نووکە خودایەک لە دەروونی من دا سەما دەکا.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە داری سەر کێو

چاوی زەردەشت دیتبووی کە لاوێک خۆی لێدەپارێزێ. تاریکانێک، هەروا کە بەتەنێ لە سەر کێوەکانی ئاقاری شارێک بە ناوی «مانگای رەنگاورەنگ» دەخولاوە ـ بڕوانە! لە نێوان رێ لاوەکەی دیت کە پاڵی وە دارێک داوە و بە نیگایەکی ماندوو چاوی لە دۆڵ بڕیوە. زەردەشت دەستی لەو دارە دا کە لاوەکە لە پەنای هەڵتروشکابوو و وەهای گوت:

«ئەگەر ویستبام ئەم دارە بە دەستەکانم راتلەکێنم، نەمدەتوانێ.

بەڵام بایەک کە ئێمە نایبینین ئازاری دەدا و بۆ هەر لایەک کە بیەوێ لاری دەکاتەوە. دەستەکانی نادیار لە هەموان سەختتر ئێمە ئازار دەدەن و لارمان دەکەنەوە.»

بەم وتەیە، لاو راچڵەکا، هەستا و گوتی: «دەنگی زەردەشت دێتە گوێم و هەنووکە بیرم لەو دەکردەوە.»

زەردەشت وڵامی داوە: «بۆ لەوە دەترسێی؟ مرۆڤیش هەروەک ئەم دارە وایە.

ئەو هەرچی پتر بیەوێ بەرەو بەرزایی و رووناکی خۆ هەڵکێشێ، ریشەکانی بە هێزتر بۆ نێو زەوی دەکشێن، بۆ نێو قووڵایی، بۆ نێو تاریکی ـ بۆ نێو خراپە رۆدەچن.»

لاو هاواری کرد: «ئادی، بۆ نێو خراپە! تۆ چلۆن توانیت رەوانی من بدۆزییەوە؟»

زەردەشت بزەیەکی هاتێ و گوتی: «هەندێک رەوان نادۆزرێتەوە مەگەر لە پێشدا ئەوان ساز بکەی.»

لاو جارێکی دی هاواری کرد: «ئادی، بۆ نێو خراپە!

راست دەکەی زەردەشت. لەو دەمەوە کە خوازیاری بەرزایی بووم ئیدی بڕوام بە خۆ نەما و چ کەسیش بڕوای بە من نیە. بۆ وای لێهات؟



بەلەز دەگۆڕدرێم: ئەمرۆم دوێنێم رەد دەکاتەوە. کاتی سەرکەوتن زۆر جار بە سەر پلیکانەکان دا باز دەدەم ـ هیچ پلیکانێک لێم خۆش نابێ.

ئەودەم کە لە بەرزاییم، خۆم هەمیشە تەنیا دەبینم. کەس دەگەڵم نادوێ. سۆزی تەنیایی دەملەرزێنێتەوە. لە بەرزایی چم دەوێ؟

بە سووک دانان و تاسەم دەگەڵ یەک هەڵدەدەن: هەرچی پتر سەردەکەوم، پتر رقم لەو کەسەیە سەر دەکەوێ. ئەو لە بەرزایی چی دەوێ؟

چ شەرمەزارم لە سەرکەوتن و هەڵخلیسکانی خۆ! چەند بە هەناسەبڕکەم پێدەکەنم! چ بێزارم لەوەی دەفڕێ! چ شەکەتم لە بەرزایی!»

ئالێرە دا لاو بێدەنگ بوو و زەردەشت لە دارێک کە لە پەنای وەستا بوون، خورد بۆوە و وەهای گوت:

«ئەم دارە لێرە تەنیا لە سەر کێو وەستاوە. ئەو لە بەرزاییەکی دوور لە مرۆڤ و گیانلەبەران رسکاوە.

ئەگەر ویستبای دەم بکاتەوە، کەسی گیر نەدەکەوت کە تێیبگا؛ ئەو وەها بەرز رسکاوە.

نووکە چاوەڕێیە و چاوەڕێ ـ چاوەڕێی چیە؟ ئەو لە نزیک شوێنگەی هەورەکان دەژی: لەوانەیە چاوەڕێی یەکەمین برووسک بێ؟»

کە زەردەشت ئەم قسانەی گوت، لاو بە خۆ راوەشاندن هاواری کرد: «ئادی، زەردەشت، راست دەکەی. ئەودەم کە خوازیاری بەرزایی بووم، تاسەی فەوتانی خۆم هەبوو و تۆی ئەو برووسکەی کە چاوەڕێی بووم! بڕوانە! لەو ساتەوە تۆ لە نێومان پەیدا بووی، من چم لێهاتوە؟ ئێرەیی بە تۆ بردنە کە منی تێکشکاندوە!»

لاو وەهای گوت و هۆڕهۆڕ گریا. بەڵام زەردەشت دەستی لە شانی هاڵاند و ئەوی دەگەڵ خۆ برد. دوای ئەوە کە ماوەیەک رۆیشتن، زەردەشت وەها وەقسە هات:

«ئەم [گریانە] کزەم لە جەرگ دێنێ. چاوەکانت باشتر لە قسەکانت تەواوەتی ئەو مەترسیانەی کە لە بۆسەی تۆ دان بۆم باس دەکەن.

تۆ هێشتا ئازاد نی. تۆ لە ئازادی دەگەڕێی و گەڕانت تۆی شەکەت و بێخەو کردوە.

خوازیاری بەرزاییە هەراوەکانی، رەوانت تینووی هەسێرانە. بەڵام خوو خراپەکانیشت تینووی ئازادین.

سەگەدڕەکانت خوازیاری ئازادین؛ ئەودەم کە گیانت بۆ رەها کردنی هەموو گرتیەکان هەوڵ دەدەن، ئەوان لە لانەکانیان دا لە خۆشیان دەوەڕن.

بە چاوی من تۆ هێشتا زیندانییەکی کە بیر لە ئازادی دەکاتەوە؛ ئاخ، رەوانی وەها زیندانییەک زیرەک دەبێ، بەڵام هەروەتر فێڵەزان و خراپیش دەبێ.

پیاوی ئازادەگیانیش دەبێ خۆ پاک کاتەوە. چونکە لە زیندان و چەپەڵی هێشتا شتگەلێکی تێدا ماوە. چاوەکانی هێشتا پێویستە پاک بنەوە.

ئا، مەترسییەک کە لە بۆسەی تۆ دایە دەیناسم. بەڵام بە ئەوین و هیوام سوێندت دەدەم کە ئەوین و هیوات دامەنێ!

هێشتا خۆت بە نەجیب دەناسی و خەڵکیش تۆ بە نەجیب دەناسن، هەر ئەوانەی کە بەدخوازی تۆن و بە چاوی بەد دەڕواننە تۆ. بزانە کە نەجیب لەمپەری سەر رێی هەموانە.

نەجیب لەمپەری سەر رێی پیاوچاکانیشە: و ئەگەر ئەو بە چاک ناو بەرن، تەمایان لە سەر رێ لابردنی ئەوە.

نەجیب دەیەوێ شتێکی نوێ و ئاکارباشییەکی نوێ بخولقێنێ. بەڵام پیاوچاک، کۆنەی دەوێ و کۆنە راگرتن.

مەترسییەک کە لە بۆسەی پیاوی نەجیب دایە پیاوچاک بوون نیە، بەڵکە بێشەرمیی گاڵتەجاڕ و وێرانکەر بوونە.

مخابن، نەجیبگەلێک دەناسم کە بەرزترین هیوایان وەلا ناوە و نووکە بە خراپە باسی گشت هیوا مەزنەکان دەکەن.

نووکە بە بێشەرمی دەگەڵ خۆشی کەم خایەن دەژین و لە درێژایی رۆژ دا بە دەگمەن ئامانجێکیان هەیە.

ئەوان گوتیان: «گیانیش هەوسە.» ئەودەم باڵەکانی گیانیان شکا: نووکە گیانیان لێر و لەوێ بەرەڵڵایە و ئەوەی دەیجوون چەپەڵی دەکەن.

سەردەمایەک بیریان دەکردەوە ببنە پاڵەوان: نووکە هەوەس پەرستن.



پاڵەوانەتی لای ئەوان هۆی مەینەت و ترسە.

بەڵام بە ئەوین و هیوام سوێندت دەدەم: پاڵەوانی نێو گیانی خۆت وەلا مەنێ! بەرزترین هیواکانی خۆت بە پیرۆز دابنێ!»

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە موعیزەکەرانی مەرگ

موعیزەکەرانی مەرگ هەن: و زەوی پڕە لەوانەی کە دەبێ تەرکی ژیانیان بۆ موعیزە بکەن.

زەوی پڕە لە زێدەکان، فرە ـ زۆران ژیانیان فەوتاندوە. بلا لە بەر تەماحی «ژیانی هەرمان» لەم ژیانەیان بکشێنەوە.

موعیزەکەرانی مەرگ بە «زەردەکان» و «رەشەکان» ناو دەبەن. بەڵام دەمەوێ ئەوان بە رەنگەکانی دیکەش بە ئێوە نیشان بدەم.

کەسانی سامناکی وا هەن کە گیانداریکی درندەیان لە دەروون دا هەیە و جگە لە هەوەس و خۆخۆری رێگایەکی دیکەیان نیە و تەنانەت هەوەسیشیان هەر خۆخۆرییە.

ئەوانە تەنانەت هێشتا نەبوونە مرۆڤ، ئەم سامناکانە: بلا هەتا تەرکی ژیان موعیزە بکەن و خۆیان کۆچی دوایی بکەن!

هەروەتر هەن ئەوانەی کە رەوانیان سیلدارە: ئەوانە هێشتا نەهاتوونە سەر دنیا، مردن دەست پێدەکەن و گیرۆدەی ئامۆتەکانی ماندوویی و بەشخوراویین.

ئەوان ئاواتی مەرگیان هەیە و لە سەر ئێمەیە کە ئاواتەکەیان بە رەوا دابنێین! وریا بن لە بە ئاگا هێنانی ئەم مردوانە و شکاندنی ئەم تابووتە زیندوانە!

تووشی نەخۆشێک یا پیرێک یا جەندەکێک دەبن و گورج دەڵێن: «ژیان پووچە!»

بەڵام ئەوان تەنیا خۆیان پووچن، خۆیان و چاوەکانیان کە جگە لە یەک لایەنی ژیان چ نابینن.

ئەوان لە ژێر بارستی پەشێویی دا نوقم بوون و تاسەباری کارەساتگەلێکی

چووکن کە مەرگ هێنەرن: بەمجۆرە چاوەڕێن و ددانیان دەچیرەوە دەبەن.

یان دەست لە شیرنیات دەدەن و بەم کارە گاڵتە بە منداڵەتی خۆیان دەکەن. بە قانگەلاشکی ژیانی خۆیانەوە دەنووسێن و بە قانگەلاشکەوە نووسانیشیان بە گاڵتەی دەگرن.

ئەقڵیان وەها دەڵێ: «بێئەقڵە ئەوەی کە دەژی. بەڵام، ئێمەش ئاوا بێئەقڵین! و ئەوە دروست بێئاقلانەترین شتە لە ژیان دا!»

«ژیان هەر رەنجە» ـ تاقمێکی دیکە وەها دەڵێن و درۆ ناکەن: کەوایە چارەیەک بدۆزەوە کە کاری تۆ دوایی بێ! چارەیەک بدۆزەوە کە ئەم ژیانە، کە هەر رەنجە، دوایی پێبێ!

بێلە ئامۆتەی ئاکارباشیتان ئەوە بێ: «تۆ دەبێ خۆ بکوژی! تۆ دەبێ خۆ بڕفێنی!»

تاقمێک لە موعیزەکەرانی مەرگ وەها دەڵێن: «هەوەس گوناهە، وەرەن خۆ بپارێزین و بێ منداڵ بمێنینەوە!»

تاقمێکی دیکە دەڵێن: «زان بە ژانە، بۆچی دیسان بزێین؟ مرۆڤ تەنیا گیانداری بەدبەخت دەزێنێ!» ئەوانەش موعیزەکەرانی مەرگن.

تاقمی سێهەم دەڵێن: «بەزەیی پێویستە. ئەوەی هەمە وەریبگرن، چۆنم ئاوام وەرگرن! بەو پێیە کەمتر بە ژیان دەبەستریمەوە!»

ئەگەر بە دڵ و بەگیان بەزەییدار بان، ژیانیان لە هاوساکانیان تاڵ دەکرد. بەدخوازیی ـ چاکەی راستەقینەی ئەوان بوو.

بەڵام ئەوان دەیانەویست ژیان دوایی پێبێ: چ پەیوەندییەکی بە ئەوانەوە هەبوو کە بە زنجیر و خەڵاتەکانیان ئەوانی دی لێک ببەستنەوە.

ئێوەش، ئەی ئەوانەی کە ژیان بۆتان کارێکی سەخت و پڕ لە عەزابە: ئایا لە ژینی درێژ ماندوو نەبوون؟ ئایا بۆ موعیزەی مەرگ زۆر نەگەیون؟

ئێوە کە هەمووتان کاری دژوار و شتی زووتێپەڕ، نوێ و نامۆتان پێخۆشە ـ ئێوە دەگەڵ خۆتان هەڵناکەن، هەولی ئێوە راکردنێکە و ویستتان فەرامۆش کردنی خۆ.



ئەگەر بڕوایەکی پتەوترتان بە ژیان هەبا، کەمتر لەم ساتە دا خۆتان بە لا دادەدا. بەڵام ئێوە لە خۆتان دا نە هێندە تاقەتی چاوەڕوانیتان هەیە ـ نە تاقەتی تەنبەڵی!

دەنگی ئەوانەی کە موعیزەی مەرگ دەکەن، لە هەموو شوێنێک دەنگ دەداتەوە: و زەوی پڕە لەوانەی کە دەبێ موعیزەی مەرگیان بۆ بکردرێ.

مەرگ یا «ژیانی هەرمان» ـ ئەو دوانە لای من یەکن بەڵام بە مەرجێک کە زوو بەرەو ئەولا بارگەیان تێکەوەپێچن.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە شەڕ و شەڕکەران

ئێمە نامانەوێ باشترین دوژمنەکانمان لێمان خۆش بن و هەروەتر ئەوانەی کە بەدڵ و بەگیان خۆشمان دەوێن. کەوایە بێڵن با راستەقینەکەتان پێبڵێم.

برا شەڕکەرەکانم! بەدڵ و بەگیان خۆشم دەوێن. منیش لە ئێوە بووم و هەم. هەرەوتر من باشترین دوژمنی ئێوەم. کەوایە بێڵن با راستەقینەکەتان پێبڵێم.

بێزاری و ئێرەیی دڵەکانتان دەناسم. ئێوە هێند گەورە نین کە بێزاری و ئێرەیی نەناسن. کەوایە هێند گەورە بن کە لە هەبوونیان شەرمەزار نەبن.

ئەگەر ناتوانن پیرۆزی چازان بن، لانی کەم ببنە پیاوی شەڕکەری ئەوان. پیاوی وا هاوڕێ و پێشەنگی ئەو پیرۆزانەن.

گەلێک سەرباز دەبینم: بریا گەلێکم پیاوی شەڕکەر دیتبا! پۆشاکەکانیان بە جلی «یەکسان» ناو دەبەن؛ بلا ئەوەی کە دایدەپۆشن یەکسان نەبێ!

دەبێ وەها کەسانێک بن کە چاوەکانتان هەمیشە لە دوژمن بگەڕێ ـ لە دوژمنەکانتان! و لە یەکەم نیگای تاقمێک لە ئێوە دا بێزارییەک هەیە.

دەبێ دوژمنەکانتان بدۆزنەوە و شەڕەکەتان هەڵایسێنن ـ شەڕێک لەبەر بڕواکانتان: و ئەگەر بڕواتان ببەزێ، راستوێژی ئێوە دەبێ هێشتا هاواری سەرکەوتن بەرز کاتەوە!

ئاشتیتان دەبێ وەک چەکی شەڕەتازەکان خۆش بوێ و ئاشتی کورت پتر لە

ئاشتی درێژ.

پەندتان نادەم کە کار بکەن، بەڵکە خەبات بکەن. پەندتان نادەم کە ئاشت بنەوە، بەڵکە سەرکەوتوو بن. کارتان خەبات بێ، ئاشتیتان سەرکەوتن.

مرۆڤ تەنیا ئەودەمەی دەتوانێ بێدەنگ بێ و ئاسوودە پاڵ داتەوە کە تیر و کەوانێکی هەبێ: دەنا قسە دەکا و بە کێشە دێ. ئاشتیتان سەرکەوتن بێ!

ئێوە دەڵێن: شتی باش تەنانەت شەڕیش پیرۆز دەکا؟ بە ئێوە دەڵێم: شەڕی باشە کە هەر شتێک پیرۆز دەکا.

شەڕ و بوێری پتر لە «هاوساخۆشەویستی» کاری مەزنیان کردوە. بەزەییتان نا، بەڵکە دلێریتان چارەڕەشەکانی رزگار کردوە.

دەپرسن: «چاک کامەیە؟» دلێریی چاکە. بێڵن با کیژۆڵەکان بڵێن: «چاک بوون ئەوەیە کە هاوکات هەم جوانە و هەمیش بزوێنەرە.»

ئێوە بە دڵڕەق دادەنێن: بەڵام دڵتان رووڕاستە و من شەرمنی دڵاوایەتانم خۆش دەوێ. ئێوە لە هەڵکشانتان شەرم دەکەن و خەڵک لە داکشانیان.

ئێوە ناحەزن؟ کەوایە، براکانم، بە پلەبەرزییەوە خۆتان بە جلی ناحەزان، داپۆشن!

کاتێک رەوانتان گەورە بێ، بەفیز دەبێ و لە پلەبەرزی ئێوە دا بەدخوازی هەیە. ئێوە دەناسم.

لە بەدخوازی دایە کە بەفیز و بێهێز تووشی یەک دێن. بەڵام خراپ لە یەکدی دەگەن. ئێوە دەناسم.

ئێوە تەنیا ئەو دوژمنانەتان هەبێ کە لێیان بێزارن، نەک ئەو دوژمنانەی کە بە سووکیان بزانن. دەبێ شانازی بە دوژمنی خۆتان بکەن: ئەودەم سەرکەوتنی دوژمنەکانتان سەرکەوتنی ئێوەش دەبێ.

راپەڕین ـ شەڕەفی بەردەیە: بلا شەڕەفی ئێوە فەرمانبەر بێ! فەرمانەکانتان هەمان فەرمانبەریتان بێ!

بۆ شەڕکەری باش زایەڵەی «تۆ دەبێ» خۆشترە لە «من دەمەوێ» و ئەوەی کە لە لاتان رێزی هەیە دەبێ لە پێشدا مەودای فەرمانی پێبدەن.



ئەوینتان بە ژیان، ئەوین بە بەرزترین هێواتان بێ: و بەرزترین هیواتان بەرزترین بڕوای ژیان بێ!

بەڵام بێڵن با بەرزترین بڕواتان فەرمان پێبدەم ـ و ئەمەش ئەوەیە: مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی.

وەهای تێپەڕ بکەن ژیانی فەرمانبەری و شەڕکەری خۆتان! چ کەلکی هەیە تەمەنێکی درێژ؟ کامە شەڕکەر دەیەوێ خۆی لێببوێرن؟

لە ئێوە نابوێرم. بەدڵ و بەگیان خۆشم دەوێن، برا شەڕکەرەکانم!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە بوتی نوێ

لە شوێنێک هێشتا گەلەکان و مێگەلەکان هەن، بەڵام لای ئێمە نا، برایان: لێرە دەوڵەتەکان هەن.

دەوڵەت؟ دەوڵەت چیە؟ کە وایە گوێ هەڵخەن هەتا نووکە وتاری خۆم سەبارەت بە مەرگی گەلەکان بۆ ئێوە دەربڕم.

دەوڵەت ساردترین دێوەزمەی ساردە. هەروەتر بە ساردی درۆیان دەکا: و ئەم درۆیە لە زاری بۆ دەرەوە دەخزێ کە «منی دەوڵەت، هەمان گەلم.»

ئەمە درۆیە! ئەوانەی کە گەلەکانیان ئافراند و لە بان سەریان ئەوین و ئیمانێکیان هەڵواسی ئافرێنەران بوون: و بەمجۆرە خزمەتی ژیانیان کرد.

بەڵام فەوتێنەرانن ئەوانەی داو بۆ زۆران دەنێنەوە و ناوی دەنێن دەوڵەت: ئەوان یەک شمشیر و سەد تەماح لە بان سەری ئەوان هەڵداوەسن.

لەو شوێنەی کە هێشتا گەلێک ماوە، نازانن دەوڵەت چیە و لەو وەک چاوی پیس و پێشێلکەری داب و نەرێت و مافەکان بێزارن.

ئەم دروشمە بە دەستی ئێوە دەسپێرم: هەر گەلێک بە زمانی «باش و خراپ»ی خۆی قسە دەکا. هاوساکەی لەم زمانە ناگا. ئەو بە پێی نەرێت و مافی خۆی ئەم زمانەی داڕشتوە.

بەڵام دەوڵەت بە هەموو زمانە باش و خراپەکانیەوە درۆ دەکا؛ و هەرچی بیڵێ

درۆیە ـ و هەرچی کە هەیەتی دزێتییە.

هەموو شتێکی درۆیە؛ ئەم گیاندارە پێوەدەرە بەو ددانانەی کە دزیویەتی پێوە دەدا، نێو دەروون و هەناویشی درۆیە.

تێکەڵ کردنی زمانی «باش و خراپ»: من ئەو دروشمە وەک دروشمی دەوڵەت بە ئێوە دەسپێرم. بە راستی، ئەوە دروشمی ویستی مەرگە! بە راستی، ئەوە ئاماژەیەکە بە موعیزەکەرانی مەرگ!

فرە ـ زۆران دەزێن: دەوڵەتیان بۆ زێدەکان ساز کردوە!

بڕوانە کە فرە ـ زۆران چلۆن هەڵدەفریوێنێ، چلۆن ئەوان دەدڕێ و دەیانجوێ و کاوێژیان دەکا!

«لە من مەزنتر لە سەر زەوی چی دیکە نیە؛ منم ئەنگوستی بە پیتی خودا!» ـ دێوەزمە وەها دەبۆڵێنێ و تەنیا گوێ درێژەکان و بیرکورتەکان نین کە بە چۆک دادەکەون!

ئاخ، ئەو تەنانەت لە گوێی ئێوە دا، ئێوە مەزن رەوانەکانیش، درۆ بێشۆقەکانی دەچرپێنێ! ئاخ، ئەو پەی بە دڵە ئەنگڕاوەکان دەبا کە خوازیاری فەوتاندنی خۆیانن!

ئادی، ئەو پەی بە ئێوە دەبا، ئێوە زاڵ بوان بە سەر کۆنەخودا دا! ئێوە لە خەبات ماندوو بوون و نووکە ماندوویەتیتان خزمەتی بوتی نوێ دەکا!

ئەو پێیخۆشە پاڵەوانەکان و شۆڕەسوارەکان لە دەوری خۆ کۆ کاتەوە ـ ئەم بوتە نوێیە! ئەو پێیخۆشە لە بەر تینی هەتاوی ویژدانەکان خۆ گەرم کاتەوە ـ ئەم دێوەزمە ساردە!

ئەگەر ئەو بپەرستن، هەموو شتێکتان دەداتێ، ئەم بوتە نوێیە: بەمجۆرە شۆقی زانیاری و زیتەی چاوە بە شکۆکانتان لێدەکڕێتەوە.

بەڵام ئەو دەیەوێ ئێوە وەک دانێک بۆ هێنانە نێو داوی فرە ـ زۆران بە کار بێنێ! ئادی، ئامرازێکی دۆزەخیان ساز کردوە، ئەسپێکی مەرگ کە زرینگەی زێڕ و زەمبەری مەزنایەتی خودایی لێ بەرز دەبێتەوە!

ئادی، لێرە بۆ زۆران مەرگێکیان ساز کردوە کە خۆی پێ ژیانە: بە راستی، خزمەتێکی بە دڵ و بە گیانە بۆ هەموو موعیزەکەرانی مەرگ!



دەوڵەت لەو شوێنەیە کە گشت کەس، لە چاک و خراپ، ژار بخۆنەوە: دەوڵەت لەو شوێنەیە کە گشت کەس، لە چاک و خراپ، خۆ بەخت بکەن: دەوڵەت لەو شوێنەیە کە خۆکوژی کەم کەمەی گشت کەس ناوی «ژیان» بە خۆوە بگرێ.

بڕواننە ئەم زێدەیانە! ئەوان کارەکانی سازێنەران و خەزێنەی زانایان دەدزن و دزراوەکانی خۆیان بە «فەرهەنگ» ناو دەبەن ـ و هەموو شتێک لە دەستی ئەوان دا دەبێتە نەخۆشی و بەڵا.

بڕواننە ئەم زێدەیانە! هەمیشە نەخۆشن. زەرداوی خۆیان دێننەوە و ناوی دەنێن رۆژنامە. یەکدی قووت دەدەن، بەڵام ناتوانن یەکدی هەزم بکەن.

بڕواننە ئەم زێدەیانە! پارە کۆ دەکەنەوە و سەرەڕای ئەوە هەژارتر دەبن. بە شوێن دەستەڵاتەوەن، ئەم بێهێزانە، و یەکەم کەرەسەی دەستەڵات: پارەی زۆرە!

بڕواننە هەڵڕووسکانی ئەم مەیموونە گورج و گۆڵانە! لە سەر و گوێلاکی یەکدی سەردەکەون و بەمجۆرە یەکدی لە قوڕ و لیتە هەڵدەکێشن و لە قووڵایی رۆدەچن.

تێگرا خوازیاری نزیک بوونەوە لە تەختن: ئەمە شێتایەتییانە؛ هەر دەڵێی بەختیاری لە سەر تەخت دانیشتوە! وا هەیە قوڕ و لیتە لە سەر تەخت دانیشتوە و واش هەیە کە تەخت لە سەر قوڕ و لیتەیە!

ئەوانە هەموو لە روانگەی منەوە شێتگەل و مەیموونگەلی هەڵڕووسکاو و گیانلەبەرانی بە جموجۆڵن. بوتەکەیان، ئەو دێوەزمە ساردە، لای من بۆگەنە: لای من، ئەم بوتپەرستانە هەموویان بۆگەنن.

برایان، ئایا دەتانەوێ لە بەر هالاوی لمبۆزە و تەماحەکانیان قڕ بن؟ وا باشترە پەنجەرەکان بشکێنن و بۆ هەوای ئازاد باز بدەن.

لە بۆی گەند خۆ بپارێزن! خۆ بپارێزن لە بوتپەرستی زێدەکان!

لە بۆی گەند خۆ بپارێزن! خۆ بپارێزن لە دووکەڵی ئەم قوربانیانەی مرۆڤ!

زەوی هێشتا بۆ مەزن رەوانەکان هەراوە. هێشتا گەلێک شوێن بۆ تەنیاکان و جووتەکان بەتاڵە، شوێنگەلێک کە لە ئاقارەکانی بۆنی خۆشی دەریا ئارامەکان دێ.

دەرگاکانی ژیانی ئازاد هێشتا لە سەر مەزن رەوانەکان ئاوەڵەیە. بە راستی

ئەوەی کەمتری هەبێ، ئەویان کەمتر دەبێ: بژی کەم هەژاری!

لەو جێیەی کە دەوڵەت کۆتایی دێ، مرۆڤێک دەست پێدەکا کە زێدە نیە؛ لەوێ سترانی مرۆڤی پێویست ـ ئەم ورینگە تاکانە و بێهاوتایە ـ دەست پێدەکا.

لەو جێیەی کە دەوڵەت کۆتایی دێ ـ بڕوانن، برایان! پەلکەزێڕینە و پردەکانی بەرزەمرۆڤ نابینن؟

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە مێشەکانی بازار

راکە، هاوڕێم، بۆ نێو تەنیاییت راکە! تۆ لە بەر هات و هەرای گەورەپیاوان کەڕ و لەبەر چزووی بچووکان بریندار دەبینم.

لێڕەوار و رەوەز باش دەزانن کە چلۆن دەبێ دەگەڵ تۆ بێدەنگ بن: ببەوە بە دارێک کە خۆشت دەوێ، هەر ئەو دارە بە لک وپۆیە کە ئارام و گوێڕایەڵ بە سەر دەریا دا شۆڕ بۆتەوە.

لەو جێیەی کە تەنیایی کۆتایی دێ بازاڕ دەست پێدەکا و لەو جێیەش کە بازاڕ دەست پێدەکا، هات و هەرای دەورگێڕانی گەورە و وزەی مێشە ژاردارەکان دەست پێدەکا.

لە دونیا دا شتە هەرە باشەکانیش بێنرخن ئەگەر کەسێک نەبێ نمایشیان بدا: خەڵک ئەم نمایشدەرانە بە «گەورەپیاو» ناو دەبەن.

خەڵک لە گەورە، لە ئافرێنەر، ناگەن. بەڵام بۆ تەواوی نمایشدەرەکان و دەورگێڕانی شتە گەورەکان، هەستیان دەبزوێ.

دونیا، بە دەوری داهێنەرانی بایەخە نوێیەکان دا دەگەڕێ: بە گەڕێکی نادیار. بەڵام خەڵک و ناوبانگی، بە دەوری نمایشدەران دا دەگەڕێن: وەهایە «گەڕی دونیا.»

نمایشدەر خاوەن رووحە؛ بەڵام ویژدانی رووحەکەی کەمە. ئەو هەمیشە بڕوای بەو شتە هەیە کە پتر لە هەر شتێکی دیکە بڕوا پێک دێنێ ـ بڕوا بە ئەو!

سبەی ئەو بڕوایەکی تازەی هەیە و دووسبەی بڕوایەکی تازەتر. ئەو، هەر وەک



خەڵک، هەستێکی تیژی هەیە و ئاو و هەوایەکی جۆراوجۆر.

بە بڕوای ئەو ئاوەژوو کردنەوە، سەلماندنە. شێت کردن، رازی کردن. و خوێن لای ئەو باشترین بەڵگەیە.

راستەقینەیەک کە هەر بگاتە گوێی هەستیارەکان، بە درۆ و پووچی دەزانێ. بە راستی، ئەو تەنیا بڕوای بەو خودایانە هەیە کە لە دونیا دا قاوەقاوی زۆر ساز دەکەن!

بازار پڕە لە ویشکەڕنە بە فیزەکان ـ و خەڵک شانازی بە پیاوە گەورەکانی خۆیان دەکەن! ئەوان بۆ خەڵک خوداکانی ئەم کاتەن.

بەڵام کات زۆریان بۆ دێنێ و ئەوانیش زۆر بۆ تۆ دێن و لە تۆش ئا یا نایان دەوێ. مخابن، تۆ دەتەوێ کورسیەکەت لە نێوان لاگری و دژایەتی دابنێی؟

ئەی ئەویندارى راستەقینە، ئێرەیی بەم موتڵەقخوازانە و زۆرهێنەرانە مەبە! راستەقینە قەت خۆی بە باسکی هیچ موتڵەقخوازێکەوە هەڵناوەسیوە.

لە دەست ئەم لەنەکاوانە بۆ پەناگای خۆت بگەڕێوە: تەنیا لە بازاڕ دایە کە بە «ئا؟» یا «نا؟» هێرش بۆ سەر کەسێک دەبەن.

چاڵاوە قووڵەکان گشتیان لە سەرەخۆ بە ئەزموون دەگەن: دەبێ درێژماوەیەک چاوەڕێ بمێننەوە هەتا بزانن کە چ لە قووڵاییان کەوتوە.

کارگەلی گەورە هەموویان دوور لە بازاڕ و ناوبانگی دەکردرێن. دامەزرێنەرانی بایەخە نوێیەکان هەمیشە دوور لە بازاڕ و ناوبانگی دا ژیاون.

راکە، هاوڕێم، بۆ نێو تەنیاییت راکە! دەبینم کە مێشە ژاردارەکان پێیانەوە داوی. راکە بۆ ئەو شوێنەی کە بای توند و فێنکی لێدێ.

بۆ نێو تەنیاییت راکە! تۆ لە بچووک و بەزەیی بزوێنەران گەلێک نزیک ژیاوی. لە تۆڵەی شاراوەیان راکە! ئەوان لە ئاست تۆ دا جگە لە تۆڵە چی دیکە نین.

پتر لەوە بۆ تاراندنیان دەست رامەوەشێنە! ئەوان گەلێکن و چارەنووسی تۆ مێش تاراندن نیە.

ئەم بچووک و بەزەیی بزوێنەرانە لە رادە بەدەرن و، گەلێک بینای سەرکەش بە دڵۆپەکانی باران و گیابژارەکان کاول کراون.

تۆ بەرد نی، کەچی بە گەلێک دڵۆپ نێوبۆش بووی و هێشتاش دڵۆپگەلێکی زۆری دیکە دەتقەڵەشێن و لەتت دەکەن.

تۆ لە دەست مێشەکانی بازار جاڕز دەبینم و لە سەر سەد جێی لەشت برینی خوێناوی دەبینم، بەڵام غروورت تەنانەت نایەوێ تووڕەش بێ.

ئەوان بەوپەڕی بێگوناهیەوە داوای خوێن لە تۆ دەکەن. ڕەوانە بێخوێنەکانیان تینووی خوێنە و لەبەر ئەوەیە بەوپەڕی بێگوناهیەوە پێوەدەدەن.

بەڵام تۆ ئەی قووڵ، ڕەنجت لە برینە بچووکەکانیش دا گەلێک قووڵە و بەر لەوەی چاک بییەوە هەمان کرمە ژاردارەکە لە سەر دەستت دەخزێ.

غرووورت پتر لەوەیە کە ئەم ورکەخۆرانە بکووژی. بەڵام وریا بە کە چارەنووست هەڵگری هەموو بێدادە ژاراوییەکەیان نەبێ.

لە دەورت بە وزەوز پێتهەڵدەڵێن: بەڵام پێهەڵکوتنیان جگە لە خۆ ڕێک خستن چی دیکە نیە. دەیانەوێ لە پێست و خوێنت نزیک بنەوە.

وەک خودایەک یا شەیتانێک بە تۆ هەڵدەڵێن، لە لات دەپاڕێنەوە، هەروەک لای خودا یا شەیتانێک. ئەمە چ کەلکی هەیە! ئەوانە دەلاڵێنەوە و دەپاڕێنەوە و هیچی دیکە.

لەوانەیە بە ڕووخۆشییەوە بۆ لات بێن. بەڵام ئەمە هەمیشە زیرەکی ترسەنۆکانەیە. بەڵێ، ترسەنۆکەکان زیرەکن!

بە ڕەوانە تەنگەکەیان زۆر بیر لە تۆ دەکەنەوە ـ و هەمیشە لە تۆ سامناکن! ئاکامی زۆر بیر کردنەوە لە هەر شتێک، سامناکییە.

تۆ لەبەر تەواوی ئاکارەباشەکانت سزا دەدەن و تەنیا لە خەتاکانت خۆش دەبن.

لەبەر ئەوە کە دڵاوا و دادگەری، دەڵێی: «چ تاوانێکیان هەیە کە ژیانیان بچووکانەیە.» بەڵام ڕەوانی تەنگیان بیر دەکاتەوە کە «هەر ژیانێکی گەورە تاوانە.»

تەنانەت ئەودەم کە چاکەشیان دەگەڵ دەکەی وا هەست دەکەن کە ڕقت لێیانە و لە بنەوە چاکەکەت بە خراپە وڵام دەدەنەوە.



غرووری بێدەنگتیان پێ ناخۆشە؛ ئەگەر جارێک خۆت وەها بە چووک دابنێی کە پووچ دیاری بدەی، شاد دەبن.

بە ناسینی شتێک لە کەسێک دا ئەو شتە لەو دا دەسووتێنن. کەوایە، لە بچووکان خۆ بپارێزە!

لە ئاستت دا هەست بە چووکی دەکەن و نزمایەتیان لە تۆڵەی شاراوەیان دا شۆق دەداتەوە و دەگەشێتەوە.

نەتدەزانی گەلێک جاران کە لێیان نزیک دەبوویەوە، لاڵ دەبوون و هێزیان، هەروەک دووکەڵی ئاگری دامرکاو، جێی دەهێشتن؟

ئادی، هاوڕێم، تۆ بۆ هاوڕەگەزەکانت وەک وێژدانێکی عەزابدەری، لەبەر ئەوە کە شیاوی تۆ نین. هەر بۆیە لە تۆ بێزارن و تاسەباری مژتنی خوێنی تۆن.

هاوساکانت هەمیشە مێشە ژاردارەکان دەبن و، ئەوەی کە لە تۆ دا گەورەیە، هەر ئەوە دەبێ کە ئەوان ژاردارتر و مێشانەتر بکا.

ڕاکە، هاوڕێم، بۆ نێو تەنیایت ڕاکە ـ بۆ ئەو جێیەی کە بای توند و فێنکی لێدێ! چارەنووسی تۆ مێش تاراندن نیە.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە داوێنپاکی

لێرەوارم خۆش دەوێ. ژیان لە شارەکان خراپە: لەوێ هەوەسباز زۆرن.

ئایا باشتر نیە کە وەگیر قاتڵێک کەوی هەتا وەگیر خەیاڵەکانی ژنێکی هەوەسباز؟

بڕواننە ئەم پیاوانە: چاوەکانیان دەڵێن کە لە سەر ڕووی زەوی شتێکی باشتر لە خەوتن دەگەڵ ژنێک ناناسن.

بنی ڕەوانەکانیان لیتەیە؛ و ئامان ئەگەر لیتەکەشیان خاوەن گیان بێ.

خۆزیا ئێوە لانی کەم هەروەک گیانداران کامل بووبان! بەڵام گیاندار بێگوناهن.

ئایا ئێوە بۆ کوشتنی هەستەکانتان پەند دەدەم؟ پەندی من بە ئێوە ئەمەیە کە

هەستەکان بێگوناهن.

ئایا ئێوە بە داوێنپاکی پەند دەدەم؟ داوێنپاکی لای هەندێک کەس ئاکارباشییە، بەڵام لای گەلێک کەس کەمتاکورت ڕەزیلییە.

ئەوان زۆر لە سەرەخۆن: بەڵام دێڵەسەگی هەوەس لە نێو هەر کارێکیانەوە بە ئێرەییەوە دەڕوانێتە دەرەوە.

لە بەرزاییەکانی ئاکارباشییەوە هەتا بێهەستیی گیان، ئەم گیاندارە و بێئۆقرەییەکەی بە دوایانەوە.

کاتێک دێڵەسەگی هەوەس پلێکی گۆشت نەدرێتێ، زۆر چاک دەزانێ کە چلۆن کوتە رووحێک گەدایی بکا.

شین و شەپۆڕ و هەرچی کە دڵتەزێنە پێتان خۆشە؟ بەڵام من لە دێڵەسەگەکەتان بەدگومانم.

چاوگەلێکی گەلێک بێبەزەتان هەیە و بە تەماحەوە دەڕواننە دەردەداران. مەگەر تەماحی ئێوە جلێکی دیکەی دەبەر نەکردوە و ناوی خۆی نەناوە بەزەیی؟

هەروەها ئەو مەتەڵەتان بۆ دێنمەوە: گەلێک کەس دەیانەویست شەیتانی نێو دەروونی خۆیان بتارێنن و خۆیان بوونە بەراز.

بۆ هەر کەس کە داوێنپاکی دژوارە، دەبێ خۆی لێ بپارێزێ: هەتا داوێنپاکی ئەو نەبێتە رێگای دۆزەخ ـ یانی ڕێگای گلاو و لیتەی رەوان.

ئایا لە شتگەلی چەپەڵ دەدوێم؟ بەڵام ئەمە، بە بڕوای من، خراپترین کار نیە، نەک ئەودەم کە ڕاستەقینە چەپەڵە، بەڵکە ئەودەم کە تەنکە، پیاوی زانا بە نابەدڵییەوە لە ئاوەکەی دەپەڕێتەوە.

بە ڕاستی، کەسانی وا هەن لە بنەڕەتەوە داوێنپاکن: ئەوان دڵاسوودەترن و لە ئێوە باشتر و پتر پێدەکەنن.

ئەوان بە داوێنپاکیش پێدەکەنن و دەپرسن: «داوێنپاکی چیە؟

ئایا داوێنپاکی گەوجایەتی نیە؟ بەڵام ئەم گەوجایەتیە خۆی رووی لە ئێمە کرد نەک ئێمە لە ئەو.

ئێمە جێگا و دڵمان دا بەم میوانە: نووکە دەگەڵ ئێمە دەژی ـ بلا هەر چەند



دەیەوێ بمێنێتەوە!»

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە دۆست

زاهیدی خەڵوەنشین وەها بیر دەکاتەوە: «یەک لە لای من هەمیشە زۆرە؛ هەمیشە یەک جار یەک ـ لە ئاکام دا دەبێتە دوو!

من و من هەمیشە دەگەڵ یەک نوقمی وتووێژین. ئەگەر دۆستێک لە ئارا دا نەبێ، چۆن دەتوانم بەرگەی ئەوە بگرم؟»

بۆ زاهیدی خەڵوەنشین، دۆست هەمیشە کەسی سێهەمە. کەسی سێهەم چێوپەمەیەکە کە ناهێڵێ وتوێژی ئەو دوانەی دی نوقم بێ.

ئاخ، چەندە قووڵایی بۆ خەڵوەنشینیان هەیە. لەبەر ئەوە ئاوا تاسەباری دۆستێک و بەرزایی ئەون.

بڕوای ئێمە سەبارەت بە خەڵکی دی، دەیدرکێنێ کە لە کوێ پێمان خۆشە بڕوامان بە خۆ هەبێ. تاسەی ئێمە بۆ دۆستێک درکێنەری ئێمەیە.

گەلێک جار کە تەنیا دەمانەوێ بە خۆشەویستییەوە بە سەر ئێرەیی دا بازد بدەین، وا هەیە کە هێرش دەبەین و دوژمنێک بۆ خۆمان دادەتاشین هەتا هێرشکەرییمان داپۆشین.

«لانی کەم دوژمنم بە!» وەها دەڵێ ڕێزێکی ڕاستەقینە کە ناوێرێ خوازیاری دۆستایەتی بێ.

ئەوەی خوازیاری دۆستێک بێ، دەبێ ئامادە بێ شەڕیشی بۆ بکا، بۆ شەڕ هەڵایساندنیش پیاو دەبێ بتوانێ ببێ بە دوژمن.

پیاو دەبێ ڕێزی دوژمنی نێو دۆستەکەی بگرێ. دەتوانی هێند لە دۆستەکەت نزیک بیەوە کە لایەنی نەگری؟

لە دۆستەکەت دا دەبێ باشترین دوژمنت هەبێ. ئەودەم کە دژایەتی دەکەی دەبێ پتر لە هەمیشە دڵت لێی نزیک بێ.

دەتەوێ لە لای دۆستەکەت رووت بیەوە؟ لەبەر ڕێزی دۆستەکەتە کە خۆت وەها

که هەی دەنوێنی؟ بەڵام ئەو لەبەر ئەو کارەت تۆی بە فەوتاوی دەوێ!

ئەوەی کە لە خودی خۆی شتێک ناشارێتەوە، خوێن وەکوڵ دێنێ: ئەو هەموو هۆیەتان بۆ ترسان لە رووتی هەیە! ئادی، ئەگەر خودا بوویان، دەتانتوانی لە جلەکانتان خەجاڵەت بنەوە!

تۆ قەت ناتوانی خۆت بۆ دۆستەکەت ئەوجۆرەی کە شیاوە برازێنیەوە: کەوایە تۆ دەبێ بۆ ئەو پەیکانێک و تاسەیەک بی بۆ بەرزەمرۆڤ.

هەتا ئێستا دۆستەکەت بە خەوتوویی دیوە تا بزانی روخساری چلۆن دەنوێنێ؟ روخساری دۆستەکەت بە هەر حاڵ چۆنە؟ هەر ئەو روخسارەی تۆیە لە ئاوێنەیەکی ناساف و ناتەواو دا.

هەتا ئێستا دۆستەکەت بە خەوتوویی دیوە؟ ئایا لەوەی کە دۆستەکەت وەها دەنوێنێ رانەچڵەکاوی؟ ئەی دۆست، مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی.

دۆست دەبێ لە پەی پێبردن و بێدەنگی دا شارەزا بێ: نابێ بخوازی کە هەموو شت ببینی. خەونەکەت دەبێ بۆت روون کاتەوە کە دۆستەکەت لە بەخەبەری دا چ دەکا.

بەزەیی تۆ دەگەڵ ئەو دەبێ پەی بردن بەوە بێ کە لە پێشدا بزانی ئایا دۆستەکەت داخوازی بەزەییە یا نا. لەوانەیە ئەو لە تۆ دا تەنیا چاوی گەش و نیگای هەرمانی خۆش بوێ.

بەزەیی دەگەڵ دۆست دەبێ خۆ لە ژێر توێکڵێکی ئەستوور دا بشارێتەوە وەها کە بۆ قەڵەشاندنی، ددانێکت لە پێناوی دا بشکێ. وەها بەزەییەک جوانی و چێژێکی دەبێ.

ئایا تۆ بۆ دۆستەکەت هەوای پاک و تەنیایی و نان و دەرمانی؟ گەلێک کەس هەن کە ناتوانن زنجیری خۆیان بپسێنن، بەڵام دەتوانن زنجیرپسێنی دۆستەکەیان بن.

ئایا کۆیلەی؟ کەوایە ناتوانی دۆست بی. ئایا زۆرداری؟ کەوایە ناتوانی دۆستت هەبێ.

لەمێژە کە کۆیلەتی و زۆرداری لە ژن دا شاراوەن. لەبەر ئەوەیە کە ژن توانای دۆستایەتی نیە: ئەو تەنیا ئەوین دەناسێ.



ئەوینی ژن لە بەرابەر هەرچییەکی کە خۆشی نەوێ بێدادگەر و کوێرە. تەنانەت لە ئەوینی وریایانەی ژن دا هێشتاش هەر هەڵمەت و برووسک و شەو لە پەنای رووناکی دان.

ژن هێشتا توانایی دۆستایەتی نیە. ژنەکان هێشتا پشیلە و مەلن. یا بە لانی زۆرەوە، مانگان.

ژن هێشتا توانایی دۆستایەتی نیە. بەڵام ئێوە پیاوەکان، پێم بڵێن، کامەتان توانایی دۆستایەتیتان هەیە؟

ئاخ لە دەست دەستکورتی ئێوە پیاوەکان و لەچەری رەوانتان! ئەوەندی کە ئێوە دەیدەن بە دۆستەکەتان من دەیدەم بە دوژمنەکەم و پێی دەستکوریش نابم.

دۆستایەتی هەیە: بلا کە دۆستیش هەبێ!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە هەزار و یەک ئامانج

زەردەشت گەلێک وڵات و گەلێک گەلی دیت: بەمجۆرە چاکە و خراپەی زۆرێک لە گەلەکانی دۆزیەوە. زەردەشت لە سەر رووی زەوی هێزێکی مەزنتری لە چاکە و خراپە نەدیت.

هیچ گەلێک بێ هەڵسەنگاندن ناتوانێ بژی؛ بەڵام ئەگەر خوازیاری پاراستنی خۆی بێ نابێ بەمجۆرە هەڵیسەنگێنێ کە هاوساکەی دەیکا.

زۆر شت کە ئەم گەلە بە چاکەی ناو دەبا؛ ئەوی دی بە هۆی شەرم و ئابڕووچوونی دادەنێ: من وەهام دیتوە. گەلێک شتم بینیوە کە لێرە بە خراپە ناوی دەبەن و لەوێ بە جلی رازاوە باڵای دادەپۆشن.

قەت هاوسا لە هاوساکەی نەگەیشتوە؛ رەوانی ئەو هەمیشە لە هەڵە و خراپەی هاوساکەی سەری سوڕماوە.

لە بان سەری هەر گەلێک دەپێک لە کارە چاکەکان هەڵواسراوە. بڕوانە! ئەمە دەپی زاڵ بوونەکانی ئەوە؛ بڕوانە! ئەمە دەنگی «ویستی دەستەڵاتی» ئەوە.

شیاوی پەسن لای ئەو شتێکە کە دژوار دەنوێنێ و ئەوەی کە دژوار و ناچار

خۆ دەنوێنێ، بە چاکەی دادەنێ؛ و ئەوەی کە لە دەروونی بەرزترین نیازیەوە هەڵدەقوڵێ، ئەو دگمەنە، ئەو دژوارترینە ـ بە پیرۆز دادەنێ.

ئەوەی کە ئەو دەکاتە فەرماندەر و سەرکەوتوو و درەوشاوە، هاوساکەی لێی دەترسێ و ئێرەیی پێدەبا، لای ئەو بەرز و یەکەمین و پێوانە و مانای هەموو شتێکە.

بە راستی، کاکە، بە ناسینی نیاز و وڵات و ئاسمان و هاوساکانی گەلێکە کە دەکرێ پەی بە قانوونی دەستەڵاتەکان و پەی بەوە بەری کە بۆچی بەم پەیژەیە دا بۆ لای هیواکانی هەڵدەکشێ.

«هەمیشە یەکەم بە و سەرتر: گیانی بوێرت نابێ چ کەسی خۆش بوێ، جگە لە دۆست» ـ ئەم [وتەیە] گیانی یوونانی دەلەرزێنێتەوە: ئەو بەم [رێنوێنیە] رێبازی گەورەیی خۆی دەبڕێ.

«راستویژی و ئەنگێوەیی لە کەمانگەری دا» ـ ئەو دوانە لە روانگەی ئەو گەلەوە کە ناوی من لەوانەوە، بەرێز و دژوار بوو: ناوێک کە بۆ منیش هەم بەرێزە و هەمیش دژوار.

«رێز لە دایک و باوک نان و بەدڵ و بەگیان سەر لەسەر ویستی ئەوان دانان»: گەلێکی دیکە ئەم دەپی زاڵ بوونەیان لە بان سەری خۆیان هەڵواسی و پێی بەهێز و هەرمان بوون.

«ئەمەگ دانەوە و بۆ خاتری ئەمەگ، خوێن و شەرەف لە سەر ئامانجە خراپ و پڕمەترسییەکانیش لە مەترسی خستن»: گەلێکی دیکە بە وەها ئامۆتەیەک بە سەر خۆیان دا زاڵ بوون و بە وەها زاڵ بوونێک لە هیواگەلی گەورە، پڕبار و بەبار بوون.

بە راستی، مرۆڤ گشت چاکە و خراپەیەکیان، خۆیان بە خۆیان داوە. بە راستی، ئەوەیان وەرنەگرتوە، ئەوەیان نەدیوەتەوە و وەک دەنگێکی ئاسمانی بۆیان نەهاتۆتە خوارەوە.

بۆ یەکەم جار مرۆڤ بایەخی بۆ شتەکان دانا هەتا خۆی پێبپارێزێ ـ بۆ یەکەم جار ئەو بوو کە مانای بۆ شتەکان ئافراند، مانایەکی مرۆڤانە! لەبەر ئەوە خۆی بە «مرۆڤ» ناو دەبا، یانی: هەڵسەنگێنەر



سەنگاندن ئافراندنە: ببیسن، ئەی ئافرێنەران! سەنگاندن خۆی گەنج و گەوهەرێکی پڕ بایەخە بۆ هەموو شتێکی هەڵسەنگێندراو.

تەنیا لە رێگای هەڵسەنگاندنە کە بایەخ دەردەکەوێ و: بێ هەڵسەنگاندن گوێزی **بوون** پووک دەبێ. ببیسن، ئەی ئافرێنەران!

گۆڕانی بایەخەکان ـ یانی گۆڕانی ئافرێنەران. ئەوەی کە دەبێ ئافرێنەر بێ هەمیشە دەفەوتێنێ. لە پێشدا گەلەکان ئافرێنەر بوون لە دوایی تاکە کەسەکان. بە راستی، کەس خۆی تازەترین ئافراوەیە.

سەردەمایەک گەلەکان دەپێک لە کارە چاکەکانیان لە بان سەری خۆیان هەڵدەواسی. ئەوینێک کە داخوازی فەرماندەری بوو و ئەوینێک کە داخوازی فەرمانبەری، پێکەوە ئەم دەپەیان دەخوڵقاند.

لەزەتی مێگەل بوون کۆنترە لە لەزەتی «من» بوون و هەتا سەردەمایەک کە ویژدانی ئاسوودە بە مێگەل دابنێن، تەنیا ویژدانی نائاسوودەیە کە دەڵێ «من».

بە راستی، منی فێڵەزانی بێ ئەوین، کە قازانجی خۆی لە قازانجی زۆران دا دەبینی، سەرەتای مێگەل نیە، بەڵکە فەوتانی ئەوە.

هەمیشە ئەوینداران و ئافرێنەران چاکە و خراپەیان ئافراندوە. ئاگری ئەوین و ئاگری تووڕەیی لە ناوی گشت ئاکارباشییەکانەوە گڕ دەگرێ.

زەردەشت گەلێک وڵات و گەلێک گەلی دیت: زەردەشت لە سەر زەوی هێزێکی مەزنتری لە کارەکانی ئەوینداران، کە چاکە و خراپەیان ناو ناوە، نەدیت.

بە راستی، هێزی ئەم پەسن و لۆمەیە غوولێکە. برایان، پێم بڵێن، کێ دەتوانێ دەستەمۆی بکا؟ کێ دەتوانێ زنجیر لە هەزار ملەکەی ئەم غوولە بخا؟

هەتا ئێستا هەزار ئامانج لە ئارا دابوون، چونکە هەزار گەل لە ئارا دا بوون. تەنیا ئەوەی هێشتا لە ئارا دا نیە زنجیرێکە بۆ هەزار مل، ئەوەی لە ئارا دا نیە ئامانجێکە. مرۆڤایەتی هێشتا ئامانجێکی نیە.

بەڵام، برایان، پێم بڵێن، ئەوەی کە مرۆڤایەتی هێشتا ئەو ئامانجەی نیە، ئایا جگە لەوەیە کە «مرۆڤایەتی» خۆی هێشتا لە ئارا دا نیە؟

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە هاوساخۆشەویستی

لە دەورەی هاوسا کۆ دەبنەوە و بۆ ئەم مەبەستە وشەگەلی جوانتان هەیە. بەڵام بە ئێوە دەڵێم: هاوساخۆشەویستی ئێوە ناخۆشەویستی ئێوەیە دەگەڵ خۆتان.

لە خۆتانەوە بۆ لای هاوسا رادەکەن و دەتانەوێ لەوە دا ئاکارباشییەک ساز کەن: بەڵام من لەوە دا «لەخۆبوردوویی» ئێوە دەبینم.

«تۆ» کۆنترە لە «من»؛ «تۆ» بە پیرۆز داندراوە، بەڵام «من» هێشتا نا؛ لەبەر ئەوە مرۆڤ روو لە هاوسا دەنێ.

ئایا ئێوە بۆ هاوساخۆشەویستی پەند دەدەم؟ بەڵکە پەندتان دەدەم کە لە هاوسا راکەن و ئەویینداری دوورترین بن!

بەرزتر لە ئەوینی هاوسا ئەوین بە دوورترین و داهاتوانە. ئەوین بە شتەکان و تاپۆکان لەبەر چاوم هێشتا بەرزتر لە ئەوین بە مرۆڤە.

کاکە، ئەم تاپۆیەی کە لە پشت سەری تۆ بەڕێوەیە، لە تۆ جوانترە. بۆچی گۆشت و ئێسکەکانتی نادەیەی؟ بەڵام تۆ هەراسانی و بۆ لای هاوساکەت رادەکەی.

تاقەتی خۆتان نیە و ئەوەند کە پێویستە خۆتان خۆش ناوێ: نووکە دەتانەوێ هاوساتان بە ئەوین هەڵفریوێن و خۆتان بە خەتای ئەو زێڕاوی بکەن.

بریا تاقەتی هیچ هاوسایەک و هەروەتر هاوساکانی ئەوانیشتان نەبا، ئەودەم ناچار بۆ خۆتان لە خۆتان هاوڕێیەکتان بە دڵی لێوڕێژەوە دەخوڵقاند.

هەر کات بتانەوێ چاکەکانی خۆتان هەڵدەن، شاهیدێک بانگ دەکەن و کاتێک ئەوتان ناچار کرد کە ئێوە بە باش دابنێ، خۆشت خۆ بە باش دادەنێی.

درۆزن تەنیا ئەوە نیە کە دژی زانایی خۆی قسە بکا، بەڵکە راست ئەوەیە کە دژی نەزانی خۆی قسە دەکا. ئێوە ئاوا بە پێچەوانە لە خۆتان دەدوێن و درۆ دەگەڵ خۆتان و هاوساکەتان دەکەن.

گەوج وەها دەڵێ: «تێکەڵاو بوون دەگەڵ خەڵک کەسایەتی دەفەوتێنێ بە



تایبەت ئەگەر کەسێک کەسایەتییەکی نەبێ.»

یەک بۆ دۆزینەوەی خۆ روو لە هاوسا دەنێ و ئەویدی بۆ دەرباز کردنی خۆ. ناخۆشەویستی ئێوە دەگەڵ خۆ تەنیاییتان لێدەکاتە زیندان.

دوورەکان تاوانی ئەوینی ئێوە بە هاوساکان دەبژێرن، و کاتێک پێنج کەس لە دەوری یەک بن، ئەوەی کە شەشەمە هەمیشە دەبێ بمرێ.

جەژن و ئاهەنگەکانیشتانم خۆش ناوێ: چونکە دەورگێڕی زۆرم تێدا دیون و بینەرەکانیش لە کردار دا هەر دەورگێڕن.

هاوڕێ فێرە ئێوە دەکەم نەک هاوسا. بڵا هاوڕێ بۆ ئێوە جەژنی زەوی بێ و بەرکوتێک لە بەرزەمرۆڤ.

هاوڕێ فێرە ئێوە دەکەم و دڵە لێوڕێژەکەی ئەو، بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ خۆشەویستی دڵەلێوڕێژەکان بێ، دەبێ بزانێ کە چلۆن [وەک] هەوری [هەڵمژ] بێ.

ئەو هاوڕێیە فێرە ئێوە دەکەم کە جەهان لەو دا ساز و تەیار کراوە و بۆتە مەکۆی چاکە ـ ئەو هاوڕێ ئافراوەی کە هەمیشە جەهانێکی ساز و تەیار کراوی بۆ دیاری کردن پێیە.

و هەر ئەوجۆرەی کە جەهان لەبەر ئەو لێک بڵاو ببۆوە، دیسان لەبەر ئەو چین چین وێکدێتەوە، هەر وەک گوورانی چاکە لە خراپە و ئامانج لە پێشهات.

داهاتوو و دوورترین، بڵا هانەی ئەمڕۆت بێ؛ لە هاوڕێیەکەت دا دەبێ بەرزەمرۆڤت هەر وەک هانەیەکی خۆت خۆش بوێ.

برایان، ئێوە بە هاوساخۆشەویستی پەند نادەم: پەندی من بە ئێوە ئەوین بە دوورترینە.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە ڕێبازی ئافرێنەر

کاکە، دەتەوێ بچیە نێو خەڵوەوە؟ دەتەوێ ڕێگایەک بۆ نێو خۆت بدۆزیەوە؟ تاوێک وچان بگرە و گوێم لێبگرە.

گەلە وەها دەڵێ: «ئەوەی کە دەگەڕێ، خۆی چ سانا ون دەبێ. هەر چەشنە خەڵوەیەک خەتایە» ـ و تۆ ماوەیەکی زۆر لە نێو گەلە دابووی.

دەنگ و هەرای گەلە هێشتا لە نێو تۆ دا دەنگ دەداتەوە، و ئەودەم کە دەڵێی: «ویژدانی من ئیدی دەگەڵ ئێوە یەک نیە» لەم وتەیە دا دەردێک و گازندەیەک هەیە.

بڕوانە، ئەم دەردە خۆی گووراوی هەمان ویژدانە و دوایین پرشنگی ئەو ویژدانە هێشتاش ڕووناکی دەخاتە سەر مەینەتت.

بەڵام، تۆ بە تەمای کە بە ڕێبازی مەینەتی خۆت دا بڕۆی کە ڕێبازێکە بەرەو خۆیی خۆت؟ کەوایە ماف و هێزی خۆتم بۆ ئەو پێنیشان بدە!

ئایا تۆ هێزێکی تازە و مافێکی تازەی؟ یەکەمین جووڵە؟ چەرخێکی خۆگەڕ؟ دەتوانی هەسێرەکان ناچار بکەی لە دەورت بگەڕێن؟

ئاخ، تەماحی بەرزایی چ زۆرە و موچڕکی بەرزەفڕان چ زۆر! نیشانم بدە کە تۆ یەکێک لەو تەماحکار و بەرزەفڕانە نی!

ئاخ، چەندە بیروباوەڕی مەزن هەن کە کاریان پتر لە کاری پادەم نیە: با دەردەدەن و بەتاڵتر دەبن.

خۆت بە ئازاد ناو دەبەی؟ دەمەوێ بیروباوەڕی فەرماندەر بە سەر تۆ دا ببیسم، نە ئەوە کە تۆ لە بەندێک ڕزگار بووی.

ئایا وەها کەسێک هەی کە **شایەنی** ڕزگاری لە بەندێک بی؟ گەلێک کەس هەن کە بە فڕێ دانی [بەندی] بەندایەتی، دوایین شتی بە نرخی خۆیان فڕێ داوە.

ئازاد لەچی؟ زەردەشت چ ئیشی بەمە داوە؟ بەڵام چاوەکانت دەبێ بە ڕوونی خەبەرم پێبدەن: ئازاد **بۆ چی**؟

ئایا دەتوانی «چاکە و خراپە» ی خۆت بدەیە خۆت؟ دەتوانی ویستی خۆت وەک قانوونێک لەبان سەری خۆت هەڵواسی؟ دەتوانی قازیی و بەڕێوەبەری



قانوونی خۆت بی؟

سامناکە تەنیا مانەوە لە ئاست چوار چاوی قازیی و بەڕێوەبەری قانوونی خۆ. وەهایە حاڵی هەسێرەیەکی تووڕ هەڵدراو بۆ نێو بۆشایی فەزا و بۆ نێو هەناسەی ساردی تەنیایی.

ئەمڕۆ هێشتا لە زۆران دڵێشاوی، تۆ ئەی تاکانە: ئەمڕۆ هێشتا خاوەنی تەواوی بوێریی و هیواکانتی!

بەڵام ڕۆژێک تەنیایی وە تەنگت دێنێ. ڕۆژێک غروورت پشتی دەچەمێتەوە و بوێریت ددانی دەچیرەوە دەبا. ڕۆژێک هاوار دەکەی: «من تەنیام!»

ڕۆژێک ئیدی بەرزایی خۆت نابینی و نزمی خۆت لەبەر چاو دەبینی. تەنانەت بەرزاییت وەک تاپۆیەک تۆ هەراسان دەکا. ڕۆژێک هاوار دەکەی کە «هەموو شت درۆیە!»

هەستگەلێک هەن تەمای کوشتنی خەڵوەنشینیان هەیە، کەچی ئەگەر سەرنەکەون خۆیان دەبێ بمرن! بەڵام تۆ توانایی جەنایەتکار بوونت هەیە؟

کاکە، ئایا هەتا ئێستا وشەی «بەسووک دانان» ت ناسیوە؟ هەروەتر عەزابی دادخوازیت بۆ دادخواز بوون لە بەرانبەر ئەوانەی کە تۆ بە سووک دادەنێن؟

زۆر کەس ناچار دەکەی ڕای خۆیان سەبارەت بە تۆ بگۆڕن. ئەوان ئەوەت بە گران لە سەر دەنووسن. تۆ لەوان نزیک بوویەوە و بەو حاڵەش لەوان تێپەڕی. قەت لەوە لێت خۆش نابن.

تۆ لەوان پێشتر و سەرتر دەڕۆی: بەڵام هەتا زیادتر سەر کەوی چاوی ئێرەیی، بە چووکترت دەبینێ. بەڵام ئەوەی کە دەفڕێ لە هەموان بێزرێزترە.

دەبێ بڵێی: «ئێوە چلۆن دەتوانن دەگەڵ من دادخواز بن کە من بێدادی ئێوە وەک بەشی خۆم هەڵدەبژێرم.»

زوڵم لە خەڵوەنشین دەکەن و پیسایی پێدادەدەن. بەڵام، کاکە، ئەگەر دەتەوێ هەسێرەیەک بی، لەبەر ئەوە نابێ لە سەریان کەمتر بدرەوشێیەوە!

لە چاکان و دادخوازان خۆ بپارێزە! ئەوان هەر کەس کە خۆی ئاکارباشی خۆی بنیات بنێ بە دڵ و بە گیان لە خاچی دەدەن ـ ئەوان لە خەڵوەنشین بێزارن.

له ساویلکەی پیرۆزیش خۆ بپارێزە: ئەو هەر شتێکی ناساویلکە بە ناپیرۆز دادەنێ، بێشک، ئەو کایە بە ئاگریشی پێخۆشە ـ کایە دەگەڵ دەستەچیلەی ئاگر.

لە هێرشی ئەوینیشت خۆ بپارێزە! خەڵوەنشین دەستبەجێ دەستی دۆستایەتی بۆ لای هەر کەسێک کە تووشی دەبێ درێژ دەکا.

دەستت نا بەڵکە دەبێ پەنجەت لە نێو دەستی گەلێک کەسان بنێی: و پێم خۆشە کە پەنجەت جنجرووکیشی هەبێ.

بەڵام خراپترین دوژمنێک کە تووشی دەبی، هەمیشە خودی خۆتی؛ خۆت لە ئەشکەوت و لێڕەوارەکان دا لە بۆسەی خۆ دا دەبی.

ئەی تەنیا، تۆ بەرەو خۆیەتی خۆ بەڕێوەی! و ڕێگات بە پەنا خۆیەتی و حەوت شەیتانەکەت دا تێدەپەڕێ.

خودی خۆت لە دین وەرگەڕاو و جادووگەر و پەیامبەر وگەوج و گومانکەر و ناپیرۆز و ڕژد دەبی.

دەبێ خوازیاری سووتن لە ئاگری خۆ دابی. بێ بوونە خۆڵەمێش، چۆن دەتەوێ نوێ بیەوە؟

ئەی تەنیا، تۆ بە ڕێبازی ئافرێنەریی دا دەڕۆی: دەتەوێ لە حەوت شەیتانەکەت خودایەک بۆ خۆت بافرێنی.

ئەی تەنیا، تۆ بە ڕێی ئەوینداریی دا دەڕۆی: ئەویندارى خۆتی و لەبەر ئەوە سووکایەتی بە خودی خۆت دەکەی، هەروەک ئەوینداران کە سووکایەتی دەکەن.

ئەویندار دەیەوێ بافرێنێ چوونکە بێزارە! ئەوەی کە قەت لە خۆشەویستی خۆی بێزار نەبوە لە ئەوین چ دەزانێ؟

کاکە، بە ئەوین و ئافرێنەریتەوە بڕۆ نێو خەڵوەوە؛ و عەداڵەت ماوەیەک دوای تۆ بە لۆژەلۆژ بە دوات دا دێ.

کاکە، بە فرمێسکەکانی منەوە بڕۆ نێو خەڵوەوە. خۆشم دەوێ ئەوەی کە دەیەوێ سەرتر و بەرزتر لە خۆ بافرێنێ و بەمجۆرە فەنا دەبێ.

وەهای گوت زەردەشت.



## سەبارەت بە ژنانی پیر و جحێڵ

«زەردەشت بۆ وا شەرمن و بە پەنامەکی بە نێوان تاریکان دا دەڕۆی؟ ئەوە چیە کە وا بە وریایی لە بن عەباکەت دا شاردووتەوە؟

ئایا خەزێنەیەکە کە خەڵاتیان کردووی؟ یا منداڵێکە بۆ تۆ زاندراو؟ یا ئەی هاوڕێی بەدکاران، خۆشت نووکە ڕێی دزانت گرتۆتە بەر؟»

زەردەشت گوتی: «کاکە، بە ڕاستی، ئەوە خەزێنەیەکە پێم خەڵات کراوە: ڕاستەقینەیەکی بچووکە دەگەڵ خۆم دەیبەم.

بەڵام وەک منداڵێکی بچووک بزۆزە و ئەگەر بەر زاری نەگرم بە دەنگی بەرز دەقیژێنێ.

ئەمڕۆ، هەروا کە بە ڕێی خۆم دا دەڕۆیشتم، لەو کاتەی دا کە هەتاو ئاوا دەبێ، ژنێکی پیرم تووش هات و وەها دەگەڵ ڕەوانم دوا:

«زەردەشت دەگەڵ ئێمە ژنەکانیش زۆر دواوە؛ بەڵام سەبارەت بە ژن هیچی بە ئێمە نەگوتوە.»

من وڵامم داوە: «سەبارەت بە ژن تەنیا دەگەڵ پیاوان دەبێ قسە بکەی.»

ئەو گوتی: «دەگەڵ منیش سەبارەت بە ژن بدوێ. من ئەوەندە پیرم کە دەستبەجێ لە بیری دەکەم.»

من داوای پیرێژنم بە جێ هێنا و ئاوام پێگوت:

هەموو شتێکی ژن پەردەکە و هەموو ئەوشتانەی ژنیش تەنیا یەک چارەی هەیە ـ ئەویش ناوی زگپڕییە.

پیاو بۆ ژن کەرەسەیەکە: ئامانج هەمیشە منداڵە. بەڵام ژن بۆ پیاو چیە؟

پیاوی ڕەسەن دوو شتی دەوێ: مەترسی و کایە. هەر بۆیە ژنی وەک پڕ مەترسیترین کایە دەوێ.

پیاو دەبێ بۆ شەڕ بار بێن و ژن بۆ حەساندنەوەی شەڕکەران: ئیشەکانی دیکە گەوجایەتین.

شەڕکەر میوەی زۆر شیرنی پێخۆش نیە. هەر بۆیە ژنی خۆش دەوێ؛ تەنانەت

شیرنترین ژنیش تاڵە.

ژن لە پیاوێک باشتر منداڵ دەناسێ، بەڵام منداڵێتی لە پیاو دا پترە لە ژن.

لە پیاوی رەسەن دا منداڵێک شاراوەیە کە دەیەوێ کایەی بکا. رابن، ژنەکان، منداڵ لە پیاو دا بدۆزنەوە!

بڵا ژن لەیستووکێک بێ پاک و گەش، وەک گەوهەرێک، پڕشنگدار لە ئاکارباشی دونیایەک کە هێشتا لە ئارا دا نیە.

بڵا لە ئەوینتان دا تیشکی هەسێرە بدرەوشێتەوە! هیواتان ئەمە بێ: «بڵا کە بەرزەمرۆڤ بزێنم!»

لە ئەوینتان دا بڵا بوێری بێ! بە ئەوینتان دەبێ هەڵمەت بەرنە سەر ئەو کەسەی کە خۆفتان تێدەخا.

بڵا ئەوینی ئێوە شانازی ئێوە بێ! هەتا پتر لەوە خۆشتان بوێن کە خۆشیان دەوێن و لەم کارە دا قەت دووهەمین مەبن.

پیاو دەبێ لە ژن بترسێ، کاتێک کە ژن بێزارە: چونکە پیاو تەنیا لە قووڵایی رەوانی دا درِە، کەچی ژن بەدزاتە.

ژن لە هەموان پتر لە کێ بێزارە؟ ـ ئاسن بە ئاسنرِفێن ئاوای گوت: «لە هەموان پتر لە تۆ بێزارم، چونکە رادەکێشی، بەڵام ئەوەند توانا نی کە بۆ خۆتی بکێشی.»

بەختیاری پیاو ئەمەیە: من دەمەوێ. بەختیاری ژن ئەمەیە: ئەو دەیەوێ.

ژنێک کە بە هەموو ئەوینیەوە گوێرِایەڵە ئاوا بیر دەکاتەوە: بروانە، هەنووکە جەهان کامل بوە!»

ژن دەبێ گوێرِایەڵ بێ هەتا بۆ سەرایی خۆی قووڵاییەک بدۆزێتەوە. دەروونی ژن سەراییە، توێژێکی بزۆک و پرِ لە فەرتەنە لە سەر تەنکاوێک.

بەڵام دەروونی پیاو قووڵە و رووبارەکەی لە ئەشکەوتەکانی ژێرزەوینی دا هاژەی دێ. ژن هەست بە هێزی دەکا، بەڵام تێیناگا.

ئەودەم پیرێژن وڵامی دامەوە: «زەردەشت گەلێک وتەی ناسکی دەربرِی، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە هێشتا بۆ ئەمە زۆر لاون.



سەیرە کە زەردەشت ژنان کەم دەناسێ و سەرەرِای ئەوە سەبارەت بەوان راست دەکا! بەڵام ئایا ئەمە لە بەر ئەوە نیە کە هیچ کردەوەیەک لە ژنان بە دوور نیە؟

ئێستا بۆ سپاس، راستەقینەیەکی بچووک وەربگرە! هەڵبەت من بۆ ئەو ئەوەند کە پێویست بێ پیرم.

بیپێچەوە و دەمی بگرە: دەنا بە دەنگی بەرز هاوار دەکا، ئەم راستەقینە بچووکە!

گوتم: «ئەی ژن، راستەقینە بچووکەکەت بدە بە من!» پیرێژن وەهای گوت:

«بۆ لای ژنان دەچی؟ قەمچی لە بیر مەکە!»

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە مارانگەستە

رۆژێک زەردەشت لە گەرمان لە بن دارە هەنجیرێک خەوتبوو و باسکەکانی لە سەر رووی دانابوو کە مارێک گەیشتە سەری و بە ملیەوە دا، وەها کە زەردەشت لە ئێشان قیژاندی. کە باسکی لە سەر رووی لابرد، مارەکەی دیت. مار چاوەکانی زەردەشتی ناسیەوە و خەجڵاو لە خۆی هاڵا و تەمای هەڵاتنی گرت.

زەردەشت گوتی: «نا، راوەستە! هێشتا سپاسی منت وەرنەگرتوە! تۆ لە کاتی خۆی دا منت لە خەو هەستاند. من هێشتا رێگەیەکی دوور و درێژم لە بەرە.» مار غەمین گوتی: «رێگەکەت کورتە. ژاری من دەتکوژێ.» زەردەشت بزەیەکی هاتێ و کوتی: «لە کوێ ئەژدیهایەک بە ژاری مارێک مردوە! وەرە ژارەکەت وەرگرەوە! تۆ ئەوەند دەوڵەمەند نی کە ئەوەم پێببەخشی.» ئەودەم مار جارێکی دیکانە لە ملی هاڵاوە و برینەکەی لێستەوە.

کە زەردەشت رۆژێک ئەم بەسەهاتەی بۆ مریدەکانی گێرِاوە، پرسیان: «زەردەشت: حیکمەتی حیکایەتی تۆ چیە؟» زەردەشت لەم بارەوە وەهای وڵام داوە:

پیاوچاکان و دادخوازان من بە فەوتێنەری ئەخلاق دادەنێن: حیکایەتی من دژی ئەخلاقە.

که دوژمنێکت هەیە، خراپەی بە چاکە وڵام مەدەوە: چونکە پێی دەشکێتەوە. لە جیات ئەوە بیسەلمێنن کە ئەو لە هەقی ئێوە دا چاکەی کردوە.

رق هەڵگرتن باشترە لە شکاندنەوە! ئەگەر تووکتان لێبکەن، پێم خۆش نیە کە لە وڵام دا دوعا بکەن. ئێوەش کەمێک تووکی لێبکەن!

ئەگەر بێدادێکی گەورەتان لێبکەن، ئێوەش لەبری دەستبەجێ پێنج بێدادی چووکە بکەن. دڵتەزێنە دیتنی کەسێک کە بێداد ئەو ئازار دەدا.

ئایا پێشتر ئەوەتان بیستبوو کە بێدادی بەشکراو نیوەی دادە؟ و ئەو کەسەی کە دەتوانێ تاقەتی بێدادیی بێنێ دەبێ بەرگەشی بگرێ!

هەندێک تۆڵە ستاندنەوە مرۆڤانەترە لە هیچ و سزا دانتانم پێخۆش نیە ئەگەر ئەو سزایە بۆ تاوانبار ماف و شەرەفێکی تێدا نەبێ.

بە ناهەق دانانی خۆ مەزنانەترە لە بە هەق دانان، بە تایبەت ئەودەم کە هەق بە تۆ بێ. بۆ ئەم مەبەستە تەنیا دەبێ بە قەدەر پێویست دەوڵەمەند بی.

عەداڵەتی ساردی ئێوەم خۆش ناوێ؛ و لە چاوی قازییەکانتان دا هەمیشە جەلاد و پۆڵا ساردەکەی دەبینم.

پێمبڵێن، لە کوێ دەتوانم عەداڵەتێک بدۆزمەوە کە ئەوینێکە بە چاوی ئاوەڵەوە.

کەوایە ئەوینێکم بۆ بدۆزنەوە کە نە تەنیا باری گشت سزاکان بەڵکە باری گشت گوناهەکانیش هەڵگرێ.

کەوایە عەداڵەتێکم بۆ بدۆزنەوە کە هەموو کەس تەبرەئە دەکا، جگە لە قازییەکان!

دەتانەوێ ئەوەش ببیسن؟ لای ئەو کەسە کە دەیەوێ هەتا ناخی خۆی لاگری داد بێ، درۆزنییش بە مرۆڤدۆستی دادەندرێ.

بەڵام چۆن هەتا ناخی خۆم دەتوانم دادخواز بم؟ چلۆن دەتوانم بەشی هەموان بدەم؟ بۆ من هەر ئەوە بەسە کە ئەوەی هی منە بە هەموانی بدەم.

لە ئاکام، برایان، لە بێداد کردن لە دوورەپەرێزان خۆ بپارێزن. دوورەپەرێز چلۆن دەتوانێ لە بیر بکا؟ چلۆن دەتوانێ تۆڵەی بکاتەوە؟

دوورەپەرێز وەک چاڵاوێکی قووڵە. سانایە بەردێکی تێباوێی: بەڵام کاتێک



بگاتە بنی، پێم بڵێن، کێ دەتوانێ دەریبێنێتەوە؟

لە ئازار دانی دوورەپەرێز خۆ بپارێزن! بەڵام ئەگەر واتان کرد، خۆشی بکوژن!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە ژن و مێردایەتی و منداڵ

کاکە، تەنیا پرسیارێکم لێت هەیە؛ ئەم پرسیارە وەک قووڵپێوێک داوێمە نێو رەوانت هەتا بزانم چەندە قووڵە.

تۆ لاوی و ئاواتەخوازی منداڵ و زەماوەندی. بەڵام لێت دەپرسم: ئایا تۆ ئەو پیاوەی کە ئاواتی منداڵێکت شایەن **بێ**؟

ئایا تۆ سەرکەوتوو، بە سەر خۆ دا زاڵ، رێبەری هەستەکان و سەرۆکی ئاکارەباشەکانتی؟ وەهات لێدەپرسم.

یا ئەوەی کە لە دەروونی ئاواتەکانتەوە وە زمان دێ حەیوان و نیاز؟ یا تەنیایی؟ یا نەسازان دەگەڵ خۆیە؟

داواکارم سەرکەوتوویی و ئازادییت تاسەی منداڵێکیان لە دڵ دابێ. بۆ سەرکەوتوویی و ئازادی خۆ دەبێ یادمانی زیندوو بینا بکەی.

دەبێ بەرزتر و سەرتر لە خۆت بینا بکەی. بەڵام من دەمەوێ لە پێشدا خۆت بینا بکردرێی، بە لەش و رەوانێکی رێک و پێک.

نە تەنیا وەک خۆ، بەڵکە دەبێ سەرتر لە خۆ بڕسکێنی. بلا باغی ژن و مێردایەتی لەم کارە دا یاریدەدەرت بێ.

لەشێکی بەرزتر دەبێ بافرێنی، یەکەم جووڵە، چەرخێکی خۆگەڕ ـ ئافرێنەرێک دەبێ بافرێنی.

ویستی ئەو دووکەسە بە ژن و مێردایەتی ناو دەبەم کە کەسێک دەئافرێنن لە ئافرێنەرانی خۆیان سەرتر. ئەوەی من بە ژن و مێردایەتی دادەنێم، رێزی ئەم دوو کەسەیە بۆ یەکدی وەک داواکارانی وەها ویستێک.

ئەوەبێ مانا و راستەقینەی ژن و مێردایەتی تۆ. بەڵام، ئەوەی کە فرەزۆران،

ئەم زێدەیانە، ژن و مێردایەتی پێدەڵێن، ئاخ من دەبێ چ ناوێکی لێبنێم؟

ئاخ لەم جووت بوونەی هەژاریەتی رەوان! ئاخ لەم جووت بوونەی چەپەڵایەتی رەوان! لەم جووت بوونەی ئاسوودەیی خەفەتبار!

ئەوان گشت ئەمانە بە ژن و مێردایەتی ناو دەبەن و دەڵێن پەیوەندی ژن و مێردایەتیان لە ئاسمان بەستراوە.

دەی، من ئەوەم پێخۆش نیە، ئەم ئاسمانەی زێدەکان! نا، ئەوانەم خۆش ناوێن، ئەم گیاندارانەی لە داوی ئاسمان کەوتوو!

دوور بێ لە من ئەو خودایەی کە بە شەلەشەل بۆ پیرۆزبایی شتێک دێ کە خۆی پێکی نەهێناوە.

بە ژن و مێردایەتییەکی وەها پێمەکەنن! کامە منداڵ بیانووی گریان بۆ دایک و باوکی خۆی پێنیە؟

ئەم پیاوەم هێژا هاتە بەر چاو و بۆ مانای زەوی پێگەیشتوو: بەڵام کاتێک کە خێزانیم بینی، زەویم چەشنی ماڵی گێژ و دەبەنگان هاتە بەرچاو.

ئادی، کاتێک رووحانییەک و قازێکی مێ دەگەڵ یەک جووت دەبن پێمخۆشە زەوی لە داخان بهەژێ.

ئەمیان وەک پاڵەوانێک وە شوێن راستەقینە کەوت و لە ئاکام درۆیەکی چووکی رازاوەی وە چنگ خست: ئەوەی بە ژن و مێردایەتی خۆی ناو دەبا.

ئەوی دی لە هەڵسوکەوت دا سارد بوو و یەکی وەک خزمەتکار هەڵبژارد بەڵام بە جارێکی دۆستایەتی خۆی فەوتاند: ئەو بە ژن و مێردایەتی خۆی ناو دەبا.

ئەوی دی کلڵفەتێکی دەویست فریشتەخوو. بەڵام لەپڕ خۆی بوو بە غوڵامی ژنێک و، ئێستا خۆی دەبێ ببێتە فریشتە!

کڕیارانم بە گشتی پێ وریان و هەموویان چاوگەلێکی زیرەکیان هەیە: بەڵام هەرە زیرەکەکەشیان ژنی خۆی لە گۆترە دەکڕێ.

ئەوەی کە ئێوە پێیدەڵێن ئەوین، گەوجایەتیەکانی کەم خایەنن و، ژن و مێردایەتی ئێوە نەفامییەکی درێژ کە دوایی بە گەوجایەتی کەم خایەنەکان دێنێ.

ئەوینی ئێوە بە ژن و ئەوینی ژن بە پیاو، بریا هاودەردی دەگەڵ خوداکانی



دەردەدار و شاراوە با! بەڵام لە هەموان پتر مەیلی راکێشەری دوو حەیوان بۆ لای یەکدییە.

هەروەتر، باشترین ئەوینی ئێوەش جگە لە چیرۆکێکی راکێشەر و خۆشییەکی بە ژان نیە. کەچی ئەوین مەشخەڵێکە کە دەبێ رێگاکانی سەرووتان رووناک بکا.

دەبێ لە رادەبەدەر ئەویندار بی! کەوایە، لە پێشدا ئەویندار بوون فێر بن! و بۆ ئەوەی جامی تاڵی ئەوینتان بخۆنەوە!

لە جامی باشترین ئەوینەکانیش دا تاڵایی هەیە: بەمجۆرە تاسەی بۆ بەرزەمرۆڤ پێکدێنێ؛ بەمجۆرە لە تۆ دا، ئەی ئافرێنەر، تینوایەتی پێک دێنێ.

تینوایەتی ئافرێنەر، تیر و تاسەیەکە بۆ بەرزەمرۆڤ: پێمبڵێ، کاکە، ئایا ئەوەیە ویستی تۆ لە ژن و مێردایەتی؟

بە پیرۆزی دادەنێم وها ویستێک و وەها ژن و مێردایەتییەک.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە مەرگی خۆخواز

زۆران گەلێک درەنگ دەمرن و هەندێک گەلێک زوو. بەڵام «بە کاتی خۆ بمرە!» پەندێکە کە هێشتا زایەڵەیەکی نامۆی هەیە.

بە کاتی خۆ بمرە! زەردەشت وەها فێر دەکا.

بە راستی ئەوەی کە قەت دە کاتی خۆی دا ناژی، چلۆن دەتوانێ بە کاتی خۆ بمرێ؟ بریا قەت لە دایک نەبووبا! زێدەکان وەها پەند دەدەم.

بەڵام زێدەکانیش مەرگی خۆیان پێ گرینگە و تەنانەت پووچترین گوێزیش خوازیاری شکاندنە.

هەموو مەرگ بە گرینگ دادەنێن: بەڵام هێشتا جەژنی مەرگیان نەگرتوە. مرۆڤ هێشتا فێر نەبوون کە جوانترین جەژنەکان بە پیرۆز دابنێن.

مەرگی کاملکەر بە ئێوە نیشان دەدەم، ئەو مەرگەی کە بۆ زیندوەکان دەبێتە چزوویەک و بەڵێنێک.

ئەوەی کە بە کەماڵ گەیشتوە سەرکەوتوانە دە نێوان گەمارۆی چاوەڕوانان و

بەڵێندەران دا بە مەرگی خۆی دەمرێ.

مرۆڤ وەها دەبێ فێرە مردن بێ؛ و نابێ جەژنیش لەو شوێنانە هەبێ کە سەرەمەرگەکان سوێندی زیندوان بە پیرۆز دانانێن.

وەها مەرگێک باشترین مەرگە؛ بەڵام دووهەمین، مەرگ لە شەڕ دایە و بەفیڕۆ دانی رەوانێکی مەزن.

بەڵام، ئەوەی هەم خەباتکار و هەم سەرکەوتوو لێی بێزارن، مەرگی گاڵتەجاڕی ئێوەیە کە وەک دزان بە ئەسپایی دێ ـ و سەرەڕای ئەوە، ئەربابابە دێ.

مەرگی خۆم بۆ ئێوە داوا دەکەم، مەرگی خۆ خواز، چونکە لەبەر ئەوە بۆ لام دێ کە من خوازتوومە.

و کەی دەیخوازم؟ ـ ئەوەی کە ئامانج و میراتبەرێکی هەیە مەرگ ئەودەم دەخوازێ کە بۆ ئامانج و میراتبەرەکەی بە کاتی خۆی بێ.

و بۆ رێزدانان لە ئامانج و میراتبەری خۆ ئیدی لە پەرستگای ژیان تاجە گوڵێکی ژاکاو هەڵناوەسێ.

بە راستی، نامەوێ وەک شریت رێسەکان بم کە هەرچی رێسراوی خۆیان درێژتر دەکەن، خۆیان بۆ دواتر دەکشێننەوە.

گەلێک کەس بۆ سەرکەوتنەکان و راستەقینەکانی خۆیان زۆر پیر دەبن؛ زارێکی بێددان ئیدی مافی دەربڕینی هەر راستەقینەیەکی نیە.

هەر کەس کە خوازیاری ناوە، دەبێ بە کاتی خۆ لە شانازی بکشێتەوە و هونەری دژواری بە کات کشانەوە دەکار بێنێ.

ئەودەم کە خۆشترین تامەکانت هەیە نابێ بێڵی کە تۆ بە تەواوی بخۆن؛ ئەوانەی کە دەیانەوێ درێژماوەیەک لە سەر دڵان بن ئەوەی دەزانن.

سێوی ترشی وا هەن کە چارەنووسیان ئەوەیە کە هەتا دوایین رۆژی پاییز چاوەڕێ بمێننەوە: و لەپڕ گەییو و زەرد و گەنیو دەبن.

هەندێک لە پێشدا دڵیان پیر دەبێ و هەندێک لە پێشدا گیانیان؛ و هەندێک لە لاوەتی دا پیرن: بەڵام لاوەتی گەر درەنگ بێ، زۆر دەخایەنێ.



ژیان بۆ گەلێکان ناخۆشە: کرمێکی ژاراوی دەروونی دڵی دەجوێ. کە وایە لێگەڕێ با ببینێ کە مەرگ بۆ ئەو گەلێک باشترە.

گەلێک قەت شیرین نابن و هەر لە هاوین دا دەگنخێن. ترسە کە ئەوان بە لکەوە دەلکێنێ.

گەلێک فرە زۆر دەژین و ماوەیەکی درێژ لە سەر لکەکانیان بە هەڵواسراوی دەمێننەوە. بریا باهۆزێک هەڵیکردبایە و هەموو ئەم گنخاو و کرمێونانەی لە دار هەڵتەکاندبا!

بریا موعیزەکەرانی مەرگ بە پڕتاو بێن و باهۆزی راستی و تەکێنەرانی داری ژیان بن! بەڵام ئەوەی کە بە گوێم دەگا تەنیا موعیزەی ئارام ـ مردنە و سێبووری دەگەڵ ئەوەی کە «زەوینی» یە.

ئاخ، ئێوە سێبووری دەگەڵ ئەوەی کە زەوینییە موعیزە دەکەن؟ ئەوە شتە زەوینییەکانە کە دەگەڵ ئێوە پتر لە رادەی پێویست سێبوورن، دەگەڵ ئێوە کفروێژان!

بە راستی، زۆر زوو مرد ئەو عیبرانیەی کە موعیزەکەرانی ئارام ـ مردن شانازی پێوە دەکەن و هەر ئەو مەرگە زووگەییوە بەڵای گیانی زۆر کەسان بوو.

ئەو، ئەو عیسا عیبرانیە، لەبەر ئەوەی کە تەنیا فرمێسک و مالیخولیای عیبرانیەکانی دەناسی، و هەروەتر رقی چاکان و دادخوازان: تاسەی مەرگ بە سەری دا زاڵ بوو.

خۆزیا لە بیاوان ماباوە دوور لە چاکان و دادخوازان! ئەودەم لەوانەیە ژیان و ئەویندارى زەوی بوون فێر بووبا ـ و هەروەتر، پێکەنین!

بڕوام پێبکەن، برایان! ئەو زۆر زوو مرد؛ ئەگەر ئەو بە قەرا من ژیابا، بۆ خۆی ئامۆتەکانی خۆی رەد دەکردەوە. ئەو ئەوەندە نەجیب بوو کە رەدی کاتەوە!

بەڵام ئەو هێشتا خاو بوو. ئەوینی لاوەتی خاوە و بێزاری ئەو لە مرۆڤ و لە زەویش هەر خاوە. هەناو و باڵەکانی گیانی هێشتا بەستراو و قورسن.

بەڵام لە پیاو دا، منداڵەتی لە چاو لاو پترە و مالیخولیا کەمتر: ئەو ژیان و مەرگ باشتر دەناسێ.

ئەو ئازادە بۆ مەرگ و ئازاد لە مەرگ دا؛ و ئەودەم کە جێیەک بۆ ئا نەمابێ،

نای پیرۆز دەڵێ: ئەو مەرگ و ژیان ئاوا دەناسێ.

هاوڕێیانی من: نەکا مەرگتان کفرانی مرۆڤ و زەوی بێ. لە هەنگوینی ڕەوانتان ئاوا دەپاڕێمەوە.

لە مەرگتان دا دەبێ هێشتا گیان و ئاکارباشیتان، وەک سوورایی شەبەق بە دەوری زەوی دا بدرەوشێتەوە: دەنا تووشی مەرگێکی خراپ بوون.

من خۆم داخوازی وەها مەرگێکم، هەتا ئەوە کە ئێوە، هاوڕێیانم، لە بەر دڵی من زەویتان پتر خۆش بوێ؛ و من جارێکی دی بۆ سەر زەوی دەگەڕێمەوە، هەتا لەو دا کە منی زاند، بحەسێمەوە.

بە ڕاستی، زەردەشت ئامانجێکی هەبوو ئەو گۆی خۆی هاویشت: نووکە ئێوە هاوڕێیان، میراتبەرانی ئامانجی من بن؛ من گۆی زێڕین بۆ لای ئێوە دەهاوێژم.

پتر لە هەر شتێک پێمخۆشە کە ئێوە هاوڕێکانم لە حاڵی هاویشتنی گۆی زێڕین دا ببینم. کەوایە هەندێک پتر لە سەر زەوی دەمێنمەوە: بۆ ئەمە لە من ببوورن!

وەهای گوت زەردەشت.



## سەبارەت بە ئاکارباشی بەخشێنەر

### ١

چونکە زەردەشت شارێکی کە پێی دڵبەند بوو و ناوی «مانگای ڕەنگاوڕەنگ» بوو، بە جێی دەهێشت، کۆمەڵێک، کە خۆیان بە مریدی ئەو دادەنا، بۆ بەڕێ کردنی بە دوایەوە بوون. کە گەیشتە چوارڕێیانێک، زەردەشت بە ئەوانی گوت کە دەیەوێ لەوە بە دواوە بەتەنێ بڕوا، چونکە تەنیا ڕۆیشتنی پێخۆش بوو. بەڵام مریدەکانی بۆ ماڵاوایی وەکازێکیان پێشکەش کرد کە لە سەر مشتووی زێڕینی مارێک لە دەوری هەتاوێک پاپووکەی خواردبوو. زەردەشت لە وەکاز ڕازی بوو و پاڵی وێدا؛ ئەودەم وەهای بە مریدەکانی گوت:

پێمبڵێن، چلۆن زێڕ بەرزترین بایەخی دەست کەوت؟ لەبەر ئەوە کە درەنگ دەست دەکەوێ و بێکەلک و بەشۆقە و، ورشە و گرشەیەکی هەیە؛ ئەو هەمیشە دەبەخشێتەوە.

زێڕ بە وێنەی بەرزترین ئاکارباشی، بەرزترین بایەخی دەست کەوت. نیگای بەخشێنەر مینای زێڕ دەدرەوشێتەوە. ورشەی زێڕ، مانگ و هەتاو دەگەڵ یەک ئاشت دەکاتەوە.

بەرزترین ئاکارباشی درەنگ دەستکەوتوویە و بێکەلک؛ بەشۆقە و ورشە و گرشەیەکی هەیە؛ بەرزترین ئاکارباشی، ئاکارباشییەکی بەخشێنەرە.

بە ڕاستی، من ئێوەم چاک ناسیوە، مریدانی من؛ ئێوەش وەک من، ئاواتەخوازی ئاکارباشی بەخشێنەرن. ئێوە چ هاوبەشییەکتان دەگەڵ پشیلە و گورگەکان هەیە.

ئێوە تینووی بەخشینەوە و بەخەڵات دانی خۆتانن: لەبەر ئەوە تینووی کۆ کردنەوەی تەواوی سامانەکان لە ڕەوانی خۆتان دان.

ڕەوانتان تامەزرۆیانە بە شوێن گەنج و گەوهەرەوەیە، چونکە ویستی بەخشینەوەی ئاکارباشیتان تامەزرۆیە.

هەموو شتەکان ناچار دەکەن کە بۆ لای ئێوە بێن و ئاوێتەی ئێوە بن، هەتا جارێکی دی وەک دیارییەکانی ئەوینی ئێوە لە کانیاوی ئێوەوە هەڵقوڵێنەوە.

بە راستی وەها ئەوینێکی بەخشێنەر دەبێ رفێنەری هەموو بایەخەکان بێ؛ بەڵام من وەها خۆخوازییەک بە تەواو و پیرۆز دادەنێم.

خۆخوازییەکی دیکەش هەیە، لە رادەبەدەر هەژار و برسی، کە هەمیشە بە شوێن دزییەوە: خۆخوازی نەخۆشان، خۆخوازی نەخۆش.

ئەو بە چاوێکی دزانە سەیری هەر شتێکی درەوشاوە دەکا، و هەر کەسێک خۆراکی زۆر بێ، بە چاوچنۆکی برسییانەوە هەڵیدەسەنگێنێ و هەمیشە لە دەوری خوانی بەخشێنەران دەخولێتەوە.

ئەوەی لە زمان ئەم چاوچنۆکییەوە دەدوێ، نەخۆشی و دارِزانی شاراوەیە، چاوچنۆکی دزانەی ئەم خۆخوازییە لە لەشێکی نەخۆشەوە دەدوێ.

پێمبڵێن، برایان، خراپ و خراپترین شت لە روانگەی ئێمەوە چیە؟ مەگەر دارِزان نیە؟ و هەمیشە لە دارِزانەوە شک دەمانگرێ کە دەبێ لە کوێ رەوانی بەخشێنەر ون بووبێ.

رێگای ئێمە بەرەو بان دەروا، لە شێوەوە بەرەو بەرزترین شێوە. بەڵام لای ئێمە سامناکە مەبەستی دارِزاوێک کە دەڵێ: «هەموو شتێک بۆ من.»

مەبەستی ئێمە بۆ سەروو باڵ دەگرێ: و بەمجۆرە ئەوە شوبهاندنێکە لە لەشەکانی ئێمە ، شوبهاندنێک لە بەرزی. شوبهاندنی بەرزی ئاوا، ناون بۆ ئاکارباشی.

لەش وەها تەیار و خەباتکارانە، بە نێوان مێژوو دا تێدەپەڕێ. گیان چی؟ گیان لای ئەو چیە؟ گیان هاوار و هاوڕێ و زایەڵەی جەنگەکان و سەرکەوتنەکانی ئەوە.

ناوەکان بە چاک و خراپەوە بە گشتی شوبهاندنن: زمان ناکەنەوە، تەنیا ئاماژە دەکەن. نەزانە ئەوەی خوازیاری زانینی ئەوانە.

وریا بن، برایان، ئەو ساتانەی کە گیانتان دەیەوێ بە زمانی کینایە قسە بکا: سەرچاوەی ئاکارباشی ئێوە لەوێوەیە.

ئەودەم لەشتان راست و بەرز بۆتەوەو بە گیرۆدەیی گیان دەبزوێنێ هەتا ئەوە



کە گیان ببێتە ئافرێنەر و هەڵسەنگێنەر و ئەویندار و چاکەکار بە هەموو شتێک.

ئەودەم کە دڵتان، وەک رووبار هەراو و پڕاو دەبێ و بۆ بەستێن نشینان رەحمەت و مەترسییەک پێک دێنێ: سەرچاوەی ئاکارباشی ئێوە لەوێوەیە.

ئەودەم کە لە بەرزایی رێز و لۆمە جێتان گرت و خواستی ئێوە، وەک خواستی ئەویندارێک، ویستی کە دەستەڵاتی بە سەر هەموو شتێک دا هەبێ: سەرچاوەی ئاکارباشی ئێوە لەوێوەیە.

ئەودەم کە شتی خۆش و نوێنی نەرمتان پێ پەست بوو و نەتانتوانی هێندەش دوور لە نوێنی نەرم هەڵکەن: سەرچاوەی ئاکارباشی ئێوە لەوێوەیە.

ئەودەم کە ویستیاری یەک ویست بوون و گۆڕانی هەموو پێداویستیەکانتان بە یەک پێداویستی بە تەنیا پێویستی خۆتان زانی: سەرچاوەی ئاکارباشی ئێوە لەوێوەیە.

بە راستی، ئەمە چاکە و خراپەی نوێیە! بە راستی، هاوارێکی قووڵ و نوێ و هاژەی کانیاوێکی نوێیە!

ئەمە هێزە، ئەم ئاکارباشە نوێیە؛ بیرێکی دەستەڵاتدارە و بە دەوری دا رەوانێکی وریا: هەتاوی زێڕن و ماری زانست لە دەوری پاپووکەی خواردوە.

## ٢

لێرە دا زەردەشت ماوەیەک بێدەنگ بوو و بە خۆشەویستییەوە روانیە مریدەکانی. ئەودەم وەهای درێژە بە قسەکانی داوە ـ و دەنگی گۆڕابوو.

برایان، بە هێزی ئاکارباشییتان بە زەوی ئەمەگدار بمێننەوە: بڵا ئەوینی بەخشێنەر و زانایی ئێوە مانای زەوی بێ! ئاواتان داوا لێدەکەم و سوێندتان دەدەم.

مەهێڵن ئاکارباشییتان لەوەی کە زەوینییە بفڕێ و باڵ لە دیوارەکانی ئەبەدیەت بکوتێ. مخابن هەمیشە چ ئاکارگەلێکی باش فڕیون!

هەر وەک من ئاکارباشیی هەڵفڕیو بۆ سەر زەوی بگەڕێننەوە. ئادی،

بیگەڕێننەوە بۆ لەش و بۆ ژیان: هەتا مانای خۆی بدا بە زەوی ـ مانایەکی مرۆڤانە!

گیان وەک ئاکارباشی هەتاکوو ئێستا سەد کەڕەت فڕیوە و فریو دراوە. ئاخ هێشتاش هەمووی ئەم گومان و فریوانە لە لەشی ئێمە دا دەژین: و خۆیان لەوێ بوون بە لەش و بە ویست.

گیان وەک ئاکارباشی هەتاکوو ئێستا سەد کەڕەت هەوڵی داوە و هەڵەی کردوە. ئادی، مرۆڤ خۆی هەوڵێک بوە. ئاخ، کە چەندە نەزانی و هەڵە لە ئێمە دا بۆتە لەش.

نە تەنیا ئەقڵی هەزارەکان ـ بەڵکە شێتایەتیشیان لە دەروونی ئێمە دا پەت دەپسێنێ. میراتبەر بوون پڕ مەترسییە.

هێشتا هەنگاو بە هەنگاو دەگەڵ غوولی کارەسات بە شەڕ دێین و هەتا ئێستاکەش بە سەر تەواوی مرۆڤایەتی دا بێمانایی حاکم بوە.

برایان، بلا گیان و ئاکارباشیتان خزمەتکاری مانای زەوی بێ و هەموو شت لە سەرڕاوە بە دەستی ئێوەوە بنرخێ! لەبەر ئەوە پێویستە خەبات بکەن! لەبەر ئەوە دەبێ ئافرێنەر بن!

لەش بە زانست خۆی خاوێن دەکاتەوە؛ بە زانست، بە ئەزموونەوە خۆ هەڵدەکێشێ. لای زانا هەموو غەریزەکان بە پیرۆز دادەندرێن؛ رەوانی پیاوی هەڵکشاو شاد دەبێ.

ئەی بزیشک، یاریدەی خۆت بدە هەتا بتوانی یارمەتی نەخۆشەکەی خۆشت بدەی. باشترین یارمەتی بەو ئەوەیە کە بە چاوی خۆی کەسێک ببینێ کە خۆی دەرمان دەکا.

هەزار رێباز هەیە کە هێشتا هەنگاویان وێنەکەوتوە؛ هەزار چەشنە سلامەتی و دوورگە شاراوەکانی ژیان. مرۆڤ و زەوی مرۆڤ هێشتا نەبڕاوەتەوە و هەمووی بە تەواوی نەدۆزراوەتەوە.

راپەڕن و گوێ بدێرن؛ ئەی تەنیایان! لە نێو داهاتووە باگەلێک بە باڵ وەشاندنی نهێنیەوە دێن و مزگێنیان بۆ گوێگەلی هەستیار پێیە.

ئەی تەنیایانی ئەمڕۆ، ئێوە لادەران، خۆتان رۆژێک دەبنە گەلێک و لە نێوان



ئێوە، کە خۆتان هەڵبژاردوە، گەلێکی هەڵبژاردە رادەپەڕێ و: لە نێو ئەو دا ـ بەرزەمرۆڤ.

بە راستی، رۆژێک زەوی دەبێتە دەرمانخانەیەک! هەنووکە بۆن و بەرامەیەکی نوێ لە دەورەی بلاو بۆتەوە، بۆن و بەرامەیەکی چارەکەر ـ و هیوایەکی نوێ!

## ٣

کاتێک زەردەشت ئەم وتانەی گوت، وەک کەسێک کە هێشتا دوا قسەی دەرنەبڕیبێ، بێدەنگ بوو؛ و ماوەیەکی دوورودرێژ بە دوودڵییەوە وەکازەکەی لە دەست دا هەڵسەنگاند و لە ئاکام وەهای گوت ـ و دەنگی گۆڕابوو:

نووکە تەنیا دەڕۆم، مریدانی من! ئێوەش نووکە بڕۆن و تەنیا بڕۆن! من وەهام دەوێ.

بە راستی، پەندتان دەدەم کە خۆ لە من دوور خەنەوە و لە زەردەشت خۆ بپارێزن! و ئەوە باشترە هەتا لە بوونی شەرمەزار بن! بەشکەم ئێوەی هەڵفریواندبێ.

پیاوی زانا نە تەنیا دەبێ دوژمنی خۆی خۆش بوێ، بەڵکە دەبێ بتوانێ لە هاوڕێی خۆشی بێزار بێ.

ئەوەی کە هەمیشە شاگرد دەمێنێتەوە، پاداشتێکی شایەن نادا بە مامۆستاکەی. بۆچی تاجەگوڵەکانی بان سەرم فڕێ نادەن؟

رێزی من دەگرن، بەلام چ دەبێ ئەگەر رۆژێک [پەیکەرەی] ئەم رێزگرتنە داکەوێ؟ وریا بن، ئەم پەیکەرەیە پانتان نەکاتەوە!

دەڵێن ئیمانتان بە زەردەشت هەیە؟ بەلام زەردەشت کێیە! ئیماندارانی منن: بەلام ئیمانداران کێن!

ئێوە ئەودەم کە منتان دیتەوە هێشتا خۆتان نەدیتبۆوە. ئیمانداران هەموویان ئاوا دەکەن: لەبەر ئەوەیە ئیمان وەها کەم نرخە.

نووکە پێتان دەڵێم کە من بزر بکەن و خۆ بدۆزنەوە و؛ تەنیا ئەوسا کە

هەمووتان منتان رەد کردەوە، بۆ لای ئێوە دەگەڕێمەوە.

بە راستی، برایان، ئەودەم بە چاوێکی دیکەوە بۆ بزربوەکانم دەگەڕێم؛ ئەودەم بە ئەوینێکی دیکەوە ئەویندارى ئێوە دەبم.

جارێکی دی هاوڕێی من دەبن و رۆڵەکانی هیوایەک: ئەوسا سێهەم جار دێمەوە لاتان هەتا نیوەڕۆی مەزن دەگەڵ ئێوە جەژن بگرم.

نیوەڕۆی مەزن ئەودەم دەبێ کە مرۆڤ لە نێرینەی رێگای خۆی، لە نێوان حەیوان و بەرزەمرۆڤ دا، وەستابێ و، وەڕێکەوتنی خۆی بەرەو تاریکان وەک بەرزترین هیوای خۆی، جەژن دەگرێ: چونکە ئەمە رێگایەکە بەرەو بەیانییەکی نوێ.

ئەوەی کە ئاوا دەبێ، دوعا بۆ خۆی دەکا هەتا هەڵبێ! و هەتاوی زانیاری ئەو لەبەر ئەو لە نیوەڕۆ دا دەوەستێ.

**«خوداکان گشتیان مردوون: نووکە دەمانەوێ کە بەرزەمرۆڤ بژی!»** بلا ئەوە دوایین ویستی ئێمە بێ لە نیوەڕۆی مەزن دا.

وەهای گوت زەردەشت.

# وەهای گوت زەردەشت

## بەشی دووهەم

تەنیا ئەوسا کە هەمووتان منتان رەد کردەوە، بۆ لای ئێوە دەگەڕێمەوە. بە راستی، برایان، ئەودەم بە چاوێکی دیکەوە بۆ بزربۆوەکانم دەگەڕێم؛ ئەودەم بە ئەوینێکی دیکەوە ئەویندارى ئێوە دەبم.

**زەردەشت، بەشی یەکەم، ئاکارباشی بەخشێنەر**

## منداڵ بە ئاوێنەوە

پاشان زەردەشت دیسان بۆ کوێستان و تەنیایی ئەشکەوتەکەی خۆی گەڕاوە و خۆی لە مرۆڤ کێشاوە و وەک جووتێرێک کە تۆمی خۆی پرژاندبێ، چاوەڕوان دانیشت. بەڵام گیانی بۆ دیداری خۆشەویستەکانی بێئۆقرە و تاسەبار بوو، چونکە هێشتا گەلێک شتی پێبوو کە بیانداتێ. بە راستی، دژوارترین کار ئەوەیە کە مرۆڤ لە خۆشەویستییان دەستی ئاوەڵە بقووچێنێ و وەک بەخشێنەر شەرم راگرێ.

بەمجۆرە ساڵ و مانگێکی زۆر بە سەر ئەم تەنیایە دا تێپەڕی؛ بەڵام زانایی پتر بوو و پڕاییەکەی ئازاری دەدا.

بەڵام، بەیانییەک بەر لە کازیوە وەئاگا هات و، هەروا لە سەر نوێن، درێژماوەیەک دە بیرەوە چوو و لە ئاکام بە دڵی خۆی گوت:

لە خەونم دا لە چی سەرسام بووم کە وەها لە خەو راپەڕیم؟ ئایا منداڵێکی ئاوێنە بە دەست نەهاتبوو لام؟

منداڵ بە منی گوت: «زەردەشت، خۆت لە ئاوێنە دا چاو لێکە!»

بەڵام کە چاوم لە ئاوێنە کرد، هاوارێکم کرد و دڵم داخورپا؛ چونکە خۆم نا، بەڵکە بزەی تەوساوی و گەپچاڕی شەیتانێکم دیت.

بە راستی من چاک هەست بە نیشانە و پەیامەکانی خەون دەکەم: **ئامۆتەکانم** لە مەترسی دان؛ گیابژار وەک گەنم خۆ دەنوێنن.

دوژمنەکانم هێزیان گرتوە و ئامۆتەکانی منیان بە پێچەوانە نواندوە؛ هەتا ئەو رادەیە کە ئازیزترین کەسانیشم لەو دیارییانەی کە پێمداون، شەرمەزار بوون.

هاوڕێکانم بزر بوون و ئەو ساتە داهاتوە کە لە بزربوەکانم بگەڕێم!

بەم قسانە زەردەشت لە سەر جێی راپەڕی، بەڵام نەک وەک پشووسوارێک بە شوێن هەوا دا، بەڵکە وەک پێشگۆ و سترانبێژێک کە رووح ئەوی هەژاندبێ. هەڵۆ و مارەکەی حەیران چاویان لێکرد، چونکە بەختیاری ئەودەمە وەک شەبەقی بەرەبەیان، لە سەر روخساری خۆی نواند.



زەردەشت گوتی: «گیاندارەکانم، چم لێقەوماوە؟ نەگۆڕاوم؟ شادی وەک باهۆزێک تێی هەڵنەکردووم؟

بەختیاریم دیناسایە و دەیەوێ دیناسایانە قسە بکا: هێشتا زۆر گەنجە ـ دەگەڵی لەسەرەخۆ بن!

لە بەختیاری خۆم برینم وێکەوتوە: دەردەداران هەموویان دەبێ ببنە بژیشکی من!

جارێکی دی هەلم بۆ هەڵکەوتوە کە بچمەوە لای هاوڕێکانم و هەروەتر دوژمنەکانم! زەردەشت جارێکی دی هەلی بۆ رەخساوە کە بدوێ و ببەخشێتەوە و ئازیزەکانی خۆش بوێ.

ئەوینی بێقەراری من رووبار بەرەو خوار، بەرەو تاوئەنگوت و زەردەپەڕ، بەڕێوەیە. رەوانم لە تاو کوێستانی بێدەنگ و برووسکی ژان، شاڵاو بۆ دۆڵەکان دەبا.

درێژماوەیەکە تاسەبارم و چاوم لە دوورەدەستان بڕیوە، درێژماوەیەکە هی تەنیایی بووم: هەر بۆیە بێدەنگیم لە بیر چۆتەوە.

بە تەواوی بوومە زار و هاژەی جۆبارێک لە بان رەوەزە بەرزەکانەوە: دەمەوێ قسەم بۆ نێو دۆڵەکان هەڵڕێژم.

لەوانەیە رووباری ئەوینم پەنگاو بخواتەوە؛ بەڵام کام رووبار لە ئاکام رێی دە دەریا ناکەوێ؟

بێشک، لە من دا دەریاچەیەکە، گۆشەگر و سەربەخۆ؛ بەڵام رووباری ئەوینم ئەو دەگەڵ خۆ بەرەو خوار ـ بەرەو دەریا دەبا!

رێگا نوێیەکان دەبڕم؛ پەیڤێکی نوێ رووی تێکردووم؛ وەک هەموو ئافرێنەران لە زمانە کۆنەکان وەگیان هاتووم. گیانم ئیدی نایەوێ بە پێڵاوی کۆنەوە بگەڕێ.

پەیڤەکان هەموو هەنگاو شلن ـ بلا خێرا بێ، باز دەدەمە سەر فایتوونی تۆ و بە بەدخوازیی خۆم تۆش وەبەر قەمچی دەدەم!

وەک قیژە و هەرای خۆشیی دەمەوێ پانتایی دەریا هەراوەکان ببڕم هەتا دوڕگەکانی بەختەوەری بدۆزمەوە ـ هاوڕێکانی من لەوێ دامەزراون.

و له نێوان ئەوان دا دوژمنەکانم! نووکە چەندەم خۆش دەوێ ئەوەی کە هەر ئیزنی قسە کردنم پێدەدا! دوژمنەکانیشم هۆی خۆشحاڵی منن.

هەر کات کە دەمەوێ سواری تۆڕترین ئەسپی خۆم بم؛ نەیزەکەم پتر لە هەر شتێک یاریدەدەرمە: ئەو هەمیشە بەندەی خزمەتکاری پێیەکانمە.

هەر ئەو نەیزەیەی کە بۆ لای دوژمنەکانمی داوێژم! چەندە سپاسم بۆ دوژمنەکانم هەیە، لەبەر ئەوە کە دەتوانم نەیزەیان پێدادەم.

بارستی هەورەکەم گەلێک قورس بوە: لە نێوان قاقای برووسکە، گلێرەکان بۆ قووڵایی دادەبارێنم.

سینگم فەرتەنەیەکی سەختی لێدەبێتەوە و باهۆزێکی سەخت هەڵدەکاتە سەر چیاکان: پاشان سووک دەبێ.

بە راستی، بەختیاریی و ئازادییم وەک باهۆز دادێن! بەڵام دوژمنەکانم پێیان وادەبێ کە ئەم بەدخوازە بە سەریان دا دەگرمێنێ.

ئادی، ئێوە هاوڕێکانیشم لە زانایی تۆڕی من کاس و وڕ دەبن، و لەوانەیە ئێوەش وێڕای دوژمنەکانم دەست بە راکردن بکەن.

خۆزیا زانیبام ئێوە چلۆن بە سێحری شمشاڵی شوان بگەڕێنمەوە! خۆزیا دەڵەشێری زانایيم ئارام ـ نەڕاندنی دەزانی! تاکوو ئێستا گەلێک شت بە یەکەوە فێر بووین!

زانایی تۆڕی من لە کوێستانی چۆڵ ئاوس بوو و لە سەر گابەردەکان ساواترین ساوای زاند.

نووکە دیناسا بە نێو سارای رەقەن دا غار دەدا و لە مێرغوزاری زەنوێر دەگەڕێ و دەگەڕێ ـ زانایی پیری تۆڕی من.

هاوڕێیانی من، ئەو دەیەوێ لە مێرغوزاری زەنوێری دڵەکانی ئێوە، لە سەر ئەوینی ئێوە، ئازیزترین کەسی بخەوێنێ.

وەهای گوت زەردەشت.



## لە دوڕگەکانی بەختەوەری

هەنجیرەکان لە دار دەوەرێن، شیرین و بەتام؛ و هەروا کە دەوەرێن توێکڵی سووریان دەقەڵەشێ. زریانێکم من بۆ هەنجیرەگەیوەکان.

بەمجۆرە ئەم ئامۆژتانە وەک هەنجیر بۆ ئێوە دادەکەون. هاوڕێیان، شیرەکەیان بمژن و گۆشتە شیرنەکەیان بخۆن! هەموو لایەک پایزە و ئاسمان ساو و پاش نیوەڕۆیە.

سەیر کەن، ئاقارمان چ پڕە! چ خۆشە بە تەسەلی و دەوڵەمەندی لە دوورەدەریاکان روانین.

ڕۆژگارێک کە چاویان لە دوورەدەریاکان دەبڕی، دەیانگوت: خودا؛ بەڵام نووکە ئێوەم فێر کردوە کە بڵێن: بەرزەمرۆڤ.

خودا خەیاڵێکە؛ بەڵام نامەوێ خەیاڵتان لە ویستی ئافرێنەریی ئێوە دوورتر بڕوا.

دەتوانن خودایەک **بافرێنن**؟ کەوایە لەمەڕ هەموو خوداکان دا بێدەنگ بن! بەڵام باش دەتوانن بەرزەمرۆڤ بافرێنن.

برایان، لەوانەیە خۆتان نەتوانن؛ بەڵام دەتوانن خۆتان وەها سەر لە نوێ بافرێننەوە کە ببنە باب و باپیرانی بەرزەمرۆڤ: و ئەوە بێ بەرزترین ئافراندنی ئێوە!

خودا خەیاڵێکە: بەڵام دەمەوێ خەیاڵتان بەوەی کە شیاوی بیر کردنەوەیە ببەسترێتەوە.

دەتوانن **بیر** لە خودایەک بکەنەوە؟ کە وایە مانای ویستی راستەقینە بۆ ئێوە ئەمە بێ کە هەموو شت وەهای لێبێ کە بۆ مرۆڤ شیاوی بیر کردنەوە بێ، بۆ مرۆڤ شیاوی بینین، بۆ مرۆڤ شیاوی هەست پێکردن بێ! دەبێ هەتا دوایین مەرزی هەستی خۆتان بیر بکەنەوە!

ئەوەی کە ناوتان ناوە دونیا، دەبێ لە پێشدا بە دەستی ئێوە بافرێندرێ: ئەو خۆی دەبێ ببێتە ئەقڵی ئێوە، خەیاڵی ئێوە، ویستی ئێوە، ئەوینی ئێوە، و بە راستی هۆی شادی ئێوە، ئێوە هەڵسەنگێنەران!

ئێوە هەڵسەنگێنەران، بێ ئەم هیوایە چلۆن دەخوازن بەرگەی ژیان بگرن؟ نە ئەوەی کە لە خەیاڵ بەدەرە، دەوێرێ پەناگاتان بێ و نە ئەوەی کە لە جەغزی ئەقڵ بە دەرە.

بەڵام دەمەوێ پرێسکەی دڵم بە تەواوەتی بۆ ئێوە هاوڕێیان بکەمەوە: ئەگەر خوداکان هەبان، چلۆن دەمتوانی تاقەتم هێنابا کە خودا نەبام؟ کەوایە خوداکان نین!

وا ئەم ئاکامە من گرتوومە؛ بەڵام نووکە ئەو منی گرتوە.

خودا خەیاڵێکە: بەڵام کێ دەتوانێ تەواوی عەزابی ئەم خەیاڵە بنۆشی و نەمرێ! ئایا دەکرێ ئافرێنەر لە ئیمان و هەڵۆ لە بەرزەفڕی بۆ بەرزاییەکانی هەڵۆیی، بێبەش بکەن؟

خودا بڕوایەکە کە هەر راستێک خوار و هەر وەستاوێک تووشی سووڕان دەکا. چلۆن؟ زەمان تێپەڕە و ئەوەی کە تێدەپەڕێ جگە لە درۆ نیە؟

وەها بڕوایەک هۆی سەرەگێژە و سوڕی ئەندامەکانی لەش و دڵ بوورانەوەیە: بە راستی، من وەها خەیاڵێک بە نەخۆشی سەرەگێژە ناو دەبەم.

من ئەو بە خراپە و بە دژی مرۆڤ دادەنێم: تەواوی ئەو ئامۆتانەی کە لەمەڕ تاکانە و کامل و بێبزووت و بێنیاز و هەرمان دان!

ئەوەی کە هەرمانە ـ جگە لە مەجازێک نیە! و شاعیرەکان زۆر درۆیان دەکەن.

بەڵام، باشترین مەجازەکان دەبێ لە زەمان و لە هەبوون بدوێن: دەبێ پەسن و پاکانەیەک بن بۆ تەواوی تێپەڕبوەکان.

ئافراندن: ئەوەیە رزگاری گەورە لە رەنج و هۆی حەسانەوەی ژیان. بەڵام رەنج و گەلێک گۆڕانی گەرەکە هەتا ئافرێنەرێک سەر هەڵبدا.

ئادی، ئێوە لە ژیان دا گەلێک فریوی دڵتەزێنتان گەرەکە، ئێوە ئافرێنەران، هەتا لاگر و پاکانەکەرانی هەموو تێپەڕبوەکان بن.

ئافرێنەر بۆ ئەوەی کە خۆی ببێتە منداڵێکی تازەزاو، دەبێ داخوازی زەیستان بوون و ژانی زان بێ.

بە راستی، من بە نێوان سەد رەوان و سەد لانک و سەد ژانی زان دا رێی



خۆم بڕیوە. گەلێک جار ماڵاواییم کردوە؛ ساتە دڵشکێنەکانی دوایین دەم دەناسم.

بەڵام وەهای دەوێ ویستی ئافرێنەریی من، چارەنووسی من. یا دروستتر بڵێم: ویستی من دروست وەها چارەنووسێکی دەوێ.

هەستەکان، هەموو لە من دا لە رەنج و لە بەند دان؛ بەڵام ویستی من هەمیشە وەک رزگاریدەر و شادیدەر بۆ لام دێ.

ویستن، رزگاریدەرە: ئەوەیە ئامۆتەی دروست لەمەڕ ویست و ئازادی ـ زەردەشت ئێوە وەها فێر دەکا.

ئیدی ـ نەویستن، ئیدی ـ بایەخ ـ دانەنان، ئیدی ـ نافراندن: ئاخ، بلا ئەم ماندوویەتیە گەورەیە هەمیشە لێم دوور بێ!

لە کاری زانست دا تەنیا تاسەی ویستم بۆ بەرهەم هێنان و «مەیلی بوون» هەست پێدەکەم؛ و ئەگەر لە زانستم دا بێگوناهییەک هەیە، لەبەر ئەوەیە کە ویستی بەرهەم هێنانی تێدایە.

ئەم ویستە من بۆ دوور بوونەوە لە خودا و خوداکان رادەکێشێ؛ چ پێویستییەک بە ئافراندن هەبوو ئەگەر خوداکان ـ هەبان!

بەڵام ویستی تامەزرۆی ئافرێنەرییم، هەردەم من بۆ لای مرۆڤ رادەکێشێ؛ چەکوچ وەها بۆ لای بەرد رادەکێشرێ.

ئاخ، ئەی مرۆڤینە، لە بەرد دا پەیکەرەیەک خەوتوە، پەیکەرەی خەیاڵەکانم! ئاخ، بۆچی دەبێ ئەو لە سەختترین و دزێوترین بەرد دا خەوتبێ؟

نووکە چەکوچەکەم بێوچان هەڵدەکوتێتە سەر زیندانی ئەو، لە بەرد کوت دەپەڕێنێ: ئەوە بە من چی؟

دەمەوێ پەیکەرەکە تەواو بکەم: چونکە سێبەرێک بۆ لای من هاتوە ـ ئەو بێدەنگتر و سووکتر لە گشت شتێک، جارێک بۆ لای من هاتوە!

جوانەتی بەرزەمرۆڤ مینا سێبەرێک بۆ لای من هاتوە. ئاخ، برایان، نووکە ئیدی چ کارم بە خوداکان داوە؟

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە بەزەییدارەکان

هاوڕێیانی من، تیر و تانەیەکیان لە هاوڕێی ئێوە داوە: «بڕواننە زەردەشت! ئایا لە نێو ئێمەش دا وەها ناخولێتەوە، هەروەک لە نێو گیانداران دا؟»

بەڵام باشتر بوو کە گوتبایان: «هەڵسەنگێنەر لە نێو مرۆڤ دا وەها دەخولێتەوە کە لە نێو گیانداران دا.

هەڵسەنگێنەر مرۆڤ وەها ناو دەبا: گیاندارێک کە کوڵمی سووری هەیە.

ئەو چلۆن وای لێهات؟ ئایا لەبەر ئەوە نەبوە کە زۆرجار شەرمەزاریی دیوە؟

هاوڕێکانم! هەڵسەنگێنەر وەها دەڵێ: شەرم، شەرم، شەرم ـ ئەوەیە مێژووی مرۆڤ!

لەبەر ئەوە پیاوی نەجیب لە سووک کردن خۆ دەپارێزێ و خۆی لە ئاست دەردەداران شەرمەزار دەبێتەوە.

بە راستی، ئەوانەم خۆش ناوێن، ئەم لێبوورانە، کە لە بەزەیی خۆیان شادن: لەوانە دا شەرم زۆر کەمە.

ئەگەر پێویستە کە بە بەزە بم، نامەوێ کە بە سەر زارم دا بێ؛ ئەگەر پیویستە کە بەزەییم هەبێ، وا باشترە کە لە دوورەوە بێ.

وا باشترە بەر لەوەی کە بمناسن، روو بشارمەوە و راکەم: هاوڕێکانم، بە ئێوەش دەڵێم کە وا بکەن.

بڵا کە چارەنووسم هەمیشە لە دەرد رزگار بوانێکی وەک ئێوەم تووش بکا تاکوو بتوانم دەگەڵیان هاوهیوا و هاوخۆراک و هاوهەنگوین بم!

بە راستی کە بۆ دەردەداران چهام نەکردوە؛ بەڵام لەم کاتەوە کە فێر بووم خۆم شادتر بکەم ئەم کارەم هەمیشە بە کارێکی باشتر هاتۆتە بەر چاو.

مرۆڤ لە سەرەتای هەبوونییەوە، خۆی گەلێک کەم شاد کردوە برایان، تەنیا ئەمە «گوناهی بەمیراتبراوی» ئێمەیە!

کاتێک فێر بین کە خۆمان باشتر شاد بکەین؟ ئازار دانی خەڵکی دی و بیری ئازار پێگەیاندن باشتر لە یاد دەکەین.



لەبەر ئەوە، کاتێک دەستم یاریدەی دەردەدارێک بدا، دەیشۆمەوە و بەم کارە رەوانیشم دەشۆمەوە.

کاتێک دەردەدارێکم لە کاتی دەرد کێشان دا دیت، لە شەرمی ئەو شەرمەزار بووم؛ و کاتێک بە هانایەوە چووم زۆر توند غرووریم پێشێل کرد.

منەتباری ئەرکە گەورەکان بوون، رق ئەستووری پێکدێنێ نەک سپاس: و کاتێک چاکەیەکی چووکە لە بیر نەچێتەوە کرمێکی جاوێنەری لێ ساز دەبێ.

«لە وەرگرتن دا سارد و بێهەست بن! بە وەرگرتنتان منەتی لە سەر دابنێن!» ـ وەها پەند دەدەم ئەوانەی کە شتێکیان بۆ بەخشین نیە.

بەڵام من کە بەخشێنەرم، بە دڵەوە دەبەخشمەوە، وەک دۆستایەتی بە دۆستان. بەڵام، غەریبە و دەستکورتەکان وا باشترە کە خۆیان بەر لە دارەبەری من بکەنەوە: ئاوا کەمتر شەرمەزار دەبنەوە.

بەڵام گەداکان دەبێ بە تەواوی بنەبڕ بکردرێن! بە راستی مرۆڤ لە پێ بەخشینیان توورە دەبێ و لە پێ نەبەخشینیشیان توورە.

هەروەتر تاونباران و ویژدانە نەحەساوەکان! بڕوام پێبکەن، هاوڕێیان! چزووی ویژدان، پێوەدان فێر دەکا.

بەڵام، خراپترین شت بڕوا بچووکەکانن. بە راستی، بەدفەڕی لە چووک بڕوایی باشترە!

بێشک دەڵێن: «رازی بوونێک کە لە بەدخوازیی چووک پێکدێ ئێمە لە گەلێک کردەوەی خراپی گەورە دەپارێزێ.» بەڵام لێرە پیاو نابێ هەوڵی پاشەکەوت بدا.

کردەوەی خراپ هەروەک کوانە: دەخورێ و دەکزێتەوە و سەر دەکاتەوە ـ ئەو راست قسە دەکا.

«بڕوانە! من نەخۆشییم» ـ کردەوەی خراپ وەها دەڵێ؛ و ئەمە راستوێژیی ئەوە.

بەڵام چووک بڕوایی وەک قارچک وایە: دەخزێ و شاراوە دەمێنێتەوە و لە هیچ کوێ خۆی نیشان نادا ـ هەتا ئەوە کە تەواوی لەش بە قارچکە چووکەکان ویشک هەڵێ و بڕزێ.

بەڵام ئەو قسەیە بە گوێی ئەو کەسە دەڵێم کە گیرۆدەی شەیتانە: «وا باشترە کە شەیتانەکەت گەورە کەی! لەم کارە دا بۆ تۆش ڕێگایەک بەرەو مەزنایەتی هەیە!»

ئاخ برایان! خەڵک هەندێک پتر لەوە کە پێویستە سەبارەت بە یەکدی دەزانن! و لەوانەیە گەلێک کەس هەبن کە دەروونیان بۆ ئێمە ئاشکرا بێ و سەرەڕای ئەمە هەتا درێژماوەیەک نەتوانین پەی بە نێو دەروونیان بەرین.

ژیان دەگەڵ مرۆڤ دژوارە، چونکە بێدەنگ بوون گەلێک دژوارە.

گەورەترین زوڵمی ئێمە لە کەسێک کە لێی بێزارین نیە، بەڵکە لە کەسێکە کە هیچ پەیوەندییەکمان دەگەڵی نیە.

ئەگەر تۆ هاوڕێیەکی دەردەدارت هەیە، بۆ دەردەکەی حەساوگەیەک بە، بەڵام حەساوگەیەک وەک تەختێکی قایم، تەختێکی پان و بەرین: بەمجۆرە تۆ پتر لە هەموان بە کەلکی ئەو دێی.

کاتێک هاوڕێیەک دەگەڵ تۆ خراپەی کرد، وەها بێژە: «ئەوەی کە دەگەڵ منت کردوە لێتدەبوورم، بەڵام تۆ ئەمەت دەگەڵ **خۆت** کرد ـ لەمە چلۆن دەتوانم ببوورم؟»

ئەوینی مەزن وەها دەدوێ: ئەو بە سەر لێبوردن و بەزەییش دا زاڵ دەبێ.

دەبێ دڵی خۆ راگری: دڵ کە بڕوا دەستبەجێ سەریش بە دوای دا دەڕوا!

ئاخ لە دونیا دا کەی گەوجایەتییەکی پتر لە گەوجایەتی بەزەییداران هەبوە؟ و چ شتێک لە دونیا دا پتر لە گەوجایەتی بەزەییداران رەنجی پێک هێناوە؟

هاوار لەو ئەویندارانەی کە سەرتر لە بەزەییان، پێگەیەکیان نیە!

شەیتان جارێک وەهای پێگوتم: «خوداش دۆزەخی خۆی هەیە: دۆزەخی ئەو ئەوین بە مرۆڤە.»

بەم زوانە بیستم کە گوتی: «خودا مردوە! بەزەیی خودا بە مرۆڤ ئەوی کوشت.»

کەوایە، لە بەزەیی خۆ بپارێزە: لەو لاوە هێشتا هەورێکی قورس بەرەو لای مرۆڤ دێ! بە راستی، من نیشانەکانی شێوانی هەوا دەناسم!



بەڵام لەم قسەیەش رامێنن: هەر ئەوینێکی گەورە لە سەرووی تەواوەتی بەزەیی خۆی دا وەستاوە، چونکە دەیەوێ خۆشەویستی خۆی بافرێنێ!

«من خۆم بۆ ئەوینی خۆم بەخت دەکەم و **هاوساکەشم هەر وەک خۆم لێدەکەم**.» ـ ئەوەیە قسەی گشت ئافرێنەران.

بەڵام ئافرێنەران گشتیان سەخت و پتەون.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە قەشەکان

جارێک زەردەشت ئاماژەیەکی دا مریدەکانی و ئەم قسانەی پێگوتن:

لێرەن قەشەکان؛ هەرچەند ئەوان دوژمنی منن، بە پەنایان دا ئارام تێپەڕن و شیر لە کالان هەڵمەکێشن!

لە نێو ئەوانەش دا پاڵەوانانێک هەن؛ گەلێک لەوان رەنجێکی زۆریان کێشاوە: لەبەر ئەمەیە کە دەیانەوێ ئەوانی دیش تووشی رەنج بکەن.

ئەمانە دوژمنانێکی خراپن. هیچ شتێک بەڕقتر لە خۆ بە چووک دانانی ئەوان نیە و هەر کەس کە دەستڕێژیان بەرێتە سەر، بە سانایی خۆی بێحورمەت دەکا.

بەڵام خوێنی من دەگەڵ خوێنی ئەوان خزمایەتی هەیە و پێمخۆشە بزانم کە خوێنی من تەنانەت لە نێو ئەوانیش دا ڕێزی هەیە.

کاتێک ئەوان تێپەڕین، زەردەشت ژان و برکێکی پێدا هات. بەڵام ئەم ژانە زۆری نەخایاند و جارێکی دی وەهای دەست بە قسە کردەوە:

دڵم بەم قەشانە دەسووتێ. ئەوانەم وەبەر دڵ ناکەون، بەڵام لەو ساتەوە کە لە نێو مرۆڤ دا دەژیم، ئەوە کەمترین نابەدڵی منە.

بەڵام من دەگەڵ ئەوان رەنجم کێشاوە و رەنج دەکێشم: ئەوانە بەندیی و داغ کراوەکانن. ئەو کەسەی کە ئەوان رزگایدەری پێدەڵێن ئەوانەی لە بەند خستوە:

لە بەندی بایەخە درۆیینەکان و پەیڤە نائاشکراکان! ئاخ، بریا کەسێک ئەوانەی لە دەست رزگاریدەرەکەیان رزگار دەکرد!

کاتێک دەریا ئەوانی بۆ لایەک فڕێ دا، وایانزانی پێیان لە دوڕگەیەک ناوە:

بەڵام بڕوانە، ئەو دێوەزمەیەکی خەوتوو بوو!

بۆ مرۆڤی فانی، بایەخە درۆیینەکان و پەیڤە نائاشکراکان خراپترین دێوەزمەن ـ چارەنووسی شووم تا درەنگانێک تێیان دا دەخەفێ و چاوەڕێیان دەمێنێتەوە.

بەڵام لە ئاکام دەگاتێ و ئەوانەی کە کۆختەیان لە سەر پشتی ساز کردوە، لە خەو رادەچڵەکێنێ و دەیانخوا و قووتیان دەدا.

مخابن، بڕواننە ئەو کۆختانەی کە ئەم قەشانە بۆ خۆیان ساز کردوە: ئەشکەوتە بۆنخۆشەکانیان کە کلیسای پێدەڵێن.

مخابن، لەم شۆقە درۆیە، لەم هەوا خەفەیە! ئێرە شوێنێکە کە ڕەوان هەلی هەڵفڕینی بۆ بەرزایی خۆی نیە.

بەڵکە ئێمانیان وەها فەرمان دەدا: «لە سەر چۆکان لە پلیکانەکان بچنە سەر، ئەی تاوانباران!»

بە راستی، دیتنی بێشەرمێک بۆ من خۆشترە لە دیتنی لار و لۆچی چاوە بەشەرم و عیبادەتەکانی ئەوانە!

چ کەسانێک ئەم ئەشکەوت و پلیکانەکانی تۆبەیان بۆ خۆیان ئافراند؟ ئایا هەر ئەوانە نەبوون کە دەیانەویست خۆ بشارنەوە و لە ئاسمانی پاک شەرمەزار بوون.

تەنیا ئەودەم جارێکی دی گیرۆدەی ئەم ماڵانەی خودا دەبم کە ئاسمانی ساو جارێکی دی لە سەربانە تێکڕماوەکانەوە بڕوانێتە شیناوەرد و گوڵە خاشخاشکی رواوی سەر دیوارە رماوەکان.

ئەوان ناویان نا «خودا» ئەوەی کە دژایەتی دەکردن و ئازاری دەدان: و بە راستی عیبادەتی ئەوان چەندە پاڵەوانانە بوو.

و بۆ خۆش ویستنی خوداکەی خۆیان جگە لە، لە خاچ دانی مرۆڤ ڕێگایەکی دیکەیان نەدەزانی.

تەمایان گرت کە وەک جەندەک بژین و جەندەکی خۆیان بە ڕەش داپۆشاند: تەنانەت لە قسەکانیشیان دا هێشتا هەست بە بۆگنخی ناخۆشی دەخمەکانیان دەکەم.



هەر کەسێک کە لە نزیک ئەوانە دەژی، لە نزیک زەلکاوە ڕەشەکان دەژی کە بۆق تێیدا سترانی خۆی بە بیرێکی قووڵی خۆشەوە دەڵێ.

بۆ من دەبێ سترانێکی باشتر بڵێن هەتاکوو بڕوا بە رزگاریدەرەکەیان بێنم: مریدەکانی دەبێ رزگاریدەرتر بێنە بەر چاوم.

پێمخۆشە ئەوان بە رووتی ببینم: چونکە تەنیا جوانییە کە دەبێ موعیزەی تۆبە بکا. بەڵام ئەم دەردە دەمامکپۆشە دەتوانێ کێ رازی بکا؟

بە راستی، رزگاریدەرەکانی ئەوان خۆیان لە دەروونی ئازادی و لە حەوتەمین ئاسمانی ئازادی نەهاتوونە خوارەوە! بە راستی، ئەوان هیچکات پێیان لە سەر رایەخی زانست دانەنا!

گیانی ئەم رزگاریدەرانە بریتی بوو لە کۆمەڵێک درز و قەڵش؛ بەڵام لە هەر قەڵشێک دا **گومانی** خۆیان تێ ئاخنی، قەڵشگری خۆیان کە بە «خودا» ناوی دەبەن.

گیانیان لە بەزەیی دا نوقم بوو و هەر کات لە بەزەیی دا هەڵدەمسان و هەڵدەمسان، هەمیشە گەوجایەتییەکی گەورە وەسەر دەکەوت!

بە هات و هەراوە مێگەلی خۆیان بەرەو کوێرەڕێی خۆیان لێدەخوری؛ دەتگوت تەنیا کوێرەڕێیەک بەرەو داهاتوو لە ئارا دایە! بە راستی، ئەم شوانانە خۆیان هێشتا لە ریزی مەڕەکان دابوون!

ئەم شوانانە بیرێکی چووک و ڕەوانێکی هەراویان هەبوو: بەڵام برایان، هەراوترین ڕەوانەکانیش تاکوو ئێستا چ وڵاتانێکی تەنگ بوون!

بە سەر ئەو ڕێگایەی کە تێدەپەڕین نیشانە خوێناویەکانیان دادەنا و گەوجایەتیەکەیان وای فێر کردبوون کە راستەقینە بە خوێن دەسەلمێنن.

بەڵام خوێن خراپترین بەڵگەی راستەقینەیە؛ خوێن بە ژاراوی کردنی ئامۆتە هەرە پاکەکان ئەوان تووشی خەیاڵی خاو و دڵ بێزاری دەکا.

دامنا کەسێک لەبەر ئامۆتەکانی بە نێو ئاگر دا تێپەڕێ ـ ئەوە چ شتێک دەسەلمێنێ؟ بە راستی، وا باشترە کە ئامۆتەکانی خۆیان لە نێوان ئاگری خۆیانەوە سەر هەڵبدەن.

دڵی خەفە و سەری سارد: لەو شوێنەی کە ئەم دوانە وێک کەون، گێژەڵووکەی

«رزگاریدەر» پێکدێ.

به راستی، هەبوون کەسانێکی گەورەتر و مەزنتر لەوانەی کە خەڵک بە رزگاریدەریان ناو دەبەن، لەم گێژەڵووکە راکێشەرانە!

ئێوە برایان، ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ ڕێگای ئازادی بدۆزنەوە، هێشتاش دەبێ بە دەست کەسانێکی گەورەتر لە هەموو رزگاریدەرانێک کە هەبوون، رزگار بن!

تاکوو ئێستا بەرزەمرۆڤێک لە ئارا دانەبوە. هەر دووکیانم بە رووتی دیون؛ مەزنترین و چووکترین مرۆڤ ـ

ئەوان هێشتا گەلێک وەک یەک دەچن. بە راستی، هەرە مەزنەکەشیانم زۆر مرۆڤاسا دیوە!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە ئاکارباشەکان

به هەستێکی سست و خەوتوو دەبێ دەگەڵ برووسک و گرگرانی ئاسمانی بدوێی.

بەڵام دەنگی جوانیی، ئارام قسە دەکا: ئەو هەر بە ئەسپایی خۆ دەگەیەنێتە نێو وەئاگاهاتووترین رەوانەکانەوە.

ئەمرۆ سپەرەکەم ئارام لەرزاوە و پێکەنی؛ ئەمە پێکەنینی پیرۆز و لەرزەی جوانییە.

ئەمرۆ جوانییم بە ئێوە پێکەنی، بە ئێوە ئاکارباشان و دەنگی ئاوا بە گوێم گەیشت: «ئەوان دەسمزیشیان دەوێ!»

ئێوە دەسمزیشتان دەوێ، ئێوە ئاکارباشان؟ ئێوە دەتانەوێ پاداشێک لە بەرابەر ئاکارباشی، ئاسمان لە بەرابەر زەوی و هەرمانیتان لە بەرابەر ئەمرۆتان دا، هەبێ؟

نووکە لە من توورەن کە فێرتان دەکەم پاداش و دەسمزدەرێک لە ئارا دا نیە؟ بە راستی، تەنانەت ئەوەشتان فێر ناکەم کە ئاکارباشی خۆی پاداشی خۆیەتی.

ئاخ، داخم ئەوەیە کە سزا و پاداشیان بە درۆ لە ناخی شتەکانەوە ناوە و ـ



نووکە لە ناخی رەوانەکانی ئێوە، ئێوە ئاکارباشان!

بەڵام وتەکانم، وەک شفرەی بەراز، ناخی رەوانەکانی ئێوە دەکێڵێ، دەمەوێ بە گاسنی ئێوە بناسرێم.

گشت رازی ناختان دەبێ ئاشکرا بێ و کاتێک شێو و وەردکراو و شکاو لەبەر هەتاو کەوتن، درۆکەتان لە راستیەکەتان جوێ دەبێتەوە.

چونکە ئەمە راستییەکەی ئێوەیە: ئێوە **پاکتر** لەوەن کە بە چەپەڵایەتی وشەگەلی تۆڵە، سزا، پاداش گڵاو بن.

وەها ئەویینداری ئاکارباشی خۆتانن هەروەک ئەویینی دایک بە منداڵ؛ بەڵام کێ بیستوویەتی کە دایکێک لەبەر ئەویینی خۆی داوای دەسمز بکا؟

ئاکارباشی ئازیزترین شتی ئێوەیە. تینوایەتی ئاڵقە لە ئێوە دایە: هەر ئاڵقەیەک لەبەر ئەوە دەخولێتەوە و هەوڵ دەدا کە بگاتەوە سەر خۆی.

هەر کارێکی ئاکارباشیتان چەشنی هەسێرەیەکی کووژاوەیە کە شۆقی هەروا بێوچان لە سەیر و گەشت و گەڕان دایە ـ و کەی لە گەڕان دەوەستێ؟

وەها شۆقی ئاکارباشی ئێوەش تەنانەت دوای تەواو کردنی کارەکەی هێشتا لە گەڕ دایە و ئەگەرچی خۆی مردبێ و لە بیر چووبێتەوە، تیشک و شۆقی هەروا دەژی و لە گەشت و گەڕان دایە.

ئاکارباشی ئێوە خودی ئێوەن، نە شتێکی بێگانە، نە پێستێک، نە پۆششێک: ئەوەیە راستەقینەیەک کە لە ناخی رەوانی ئێوە، ئێوە ئاکارباشان، هەڵدەقوڵێ.

سەرەڕای ئەوە، کەسانی وا هەن کە ئاکارباشی بۆیان رەنج و ئەشکەنجەی قەمچییە: و ئێوە قیژەی ئەوانتان زۆر بیستوە!

کەسانی دیکەی وا هەن کە تەنبەڵ بوونی خوو خراپەکانیان بە ئاکارباشی ناو دەبەن؛ و کاتێک بێزاری و دڵ پیسییان خۆی لێک بکێشێتەوە، «دادخوازی»یان گیان دەگرێ و چاوی خەواڵووی هەڵدەگلۆفێ.

کەسانی وا هەن کە دادەکێشرێن: شەیتانەکانیان ئەوان دادەکێشن: بەڵام هەرچی نوقمتر دەبن زیتەی چاوەکانیان و مەیل بە خوداکەیان پڕ شۆقتر دەبێ.

ئاخ، قیژەی ئەوانیش بە گوێی ئێوە گەیشتوە، ئێوە ئاکارباشان: «ئەوەی

من نیم، ئەو بۆ من ئاکارباشی و خودایە!»

هی واش هەن کە داتەپیون و بە گێرەگێر دێنە سەر، هەروەک عەرابەیەک بە باری بەردەوە لە سەربەرەولێژ: ئەوان سەبارەت بە بایەخ و ئاکارباشی زۆر دەدوێن ـ ئەوان بەرهەڵستیان بە ئاکارباشی ناودەبەن!

کەسانی دی هەن وەک سەعاتە قورمیشییەکان کە دەبێ قورمیشیان بکەی: ئەودەم چرکەچرکیان دێ و دەیانەوێ کە خەڵک چرکەچرکیان بە ئاکارباشی دابنێن.

بە راستی، ئەوانە هۆی دڵخۆشی منن: لە هەر کوێیەک سەعاتی وا بدۆزمەوە بۆ پێرابواردن قورمیشی دەکەم؛ و ئەوان وڕەوڕم بۆ دەکەن.

کەسانی دی بە کەمووچکەیەک دادخوازی خۆیانەوە وەها بایین کە لەبەر ئەوە دەستدرێژی بۆ هەموو شتێک دەکەن؛ وەها کە دونیا لە بێدادیان دا نوقم بوە.

ئاخ کە وشەی «ئاکارباشی» چەندە ناخۆش لە زاریان دێتە دەر! کاتێک کە دەڵێن: «من دادخوازم»، هەمیشە وا دەنوێنێ کە دەڵێن: «تۆڵە خۆشە!»

ئەوان دەیانەوێ بە ئاکارباشیان چاوی دوژمنەکانیان هەڵکۆڵن و خۆیان تەنیا لەبەر ئەوە هەڵدەکێشن کە خەڵکی دی داکێشن.

دیسان کەسانێک هەن کە لە زۆنکاوەکەیان دا هەڵدەتڕووشکێن و لە نێوان قامیشەڵانەوە دەڵێن «ئاکارباشی ـ بێدەنگ لە نێو زۆنکاو هەڵتڕووشکانە.

ئێمە بە کەسەوە نادەین و لە کەسانێک کە بیانەوێ پێمانەوە بدەن خۆ دەپارێزین: و لە هەر مەسەلەیەک دا رای ئێمە هەر ئەوەیە کە فێریان کردووین.»

دیسان کەسانێک هەن کە ئۆین و ئەدا دەرهێنانیان پێخۆشە و پێیانوایە کە ئاکارباشی چەشنێک ئۆین و ئەدا دەرهێنانە.

ئەژنۆکانی ئەوانە هەمیشە نوشتاوی عیبادەت و دەستەکانیان دوعابێژی ئاکارباشییە بەڵام دڵیان لەوە بێخەبەرە.

دیسان کەسانێک هەن کە ئەوە بە ئاکارباشی دادەنێن کە بڵێن «ئاکارباشی پێویستە» بەڵام لە نێو دڵیان دا تەنیا لەم بڕوایە دان کە پۆلیس پێویستە.



گەلێک کەس چاوی دیتنی بەرزایی مرۆڤیان نیە و ئەوەی کە نزمیی ئەو پتر لە رادە نزیک دەبینێ، بە ئاکارباشی دادەنێ: وەها چاوپیسی خۆی بە ئاکارباشی ناو دەبا.

هەندێک دەیانەوێ وەستاو و سازکراو بن و ئەوە بە ئاکارباشی دادەنێن، هەندێکی دیکە دەیانەوێ تێکدراو بن و ـ ئەمەش بە ئاکارباشی ناو دەبەن.

بەمجۆرە، کەمتاکورتێک هەموو لە سەر ئەم باوەڕەن کە ئاکارباشییەکیان تێدا هەیە: و لانی کەم دەیەوێ کارناسێکی «چاکە» و «خراپە» بێ.

بەڵام زەردەشت نەهاتوە هەتا بە هەموو ئەم درۆزن و گەوجانە بڵێ: «**ئێوە** لە ئاکارباشی چ دەزانن؟ ئێوە لە ئاکارباشی چ **دەتوانن** بزانن؟»

بەڵکە، لەبەر ئەوە هاتوە تاکوو ئێوە، هاوڕێیانی من، لە وتە کۆنەکان کە لە درۆزنەکان و گەوجەکان فێر بوون، بێزار بن.»

هەتا بێزار بن لە وشەگەلی «پاداش»، «کین»، «سزا»، «تۆڵەی عادلانە».

هەتا بێزار بن لەوە کە دەڵێ: «کردەوەی چاک ئەوەیە کە بێبەری لە خۆخوازی بی.»

ئاخ، هاوڕێکانم! ئێوە «خۆتان» لە کردەوەتان دا وەها بن کە دایک لە منداڵی خۆی دایە: ئەوە بێ وتەتان سەبارەت بە ئاکارباشی.

بە راستی، من لە ئێوە سەد وتە و ئازیزترین لەیستۆکەکانی ئاکارباشیتانم ستاندوە و نووکە ئێوە لە من تووڕەن هەروەک تووڕەیی منداڵ.

ئەوان لە بەستێنی دەریا یارییان دەکرد کە شەپۆل هات و لەیستۆکەکانی وە بن دان: نووکە دەگرین.

بەڵام هەر ئەو شەپۆلە لەیستۆکێکی نوێیان بۆ دێنێ و گوێماسی رەنگاوڕەنگی نوێیان لەبەر هەڵدەڕێژێ!

بەمجۆرە ژیر دەبنەوە؛ و ئێوە، هاوڕێکانی منیش وەک ئەوان، هێمنایەتی خۆتان دەست دەکەوێتەوە ـ و گوێماسیە رەنگاوڕەنگە نوێیەکانیش.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە بوودەڵەکان

ژیان کانی لەزەتە؛ بەڵام لەو شوێنە کە بوودەڵەش ئاو دەخواتەوە، چاڵاوەکان گشتیان ژاراوین.

من لاگری پاکییەکانم؛ بەڵام پێمخۆش نیە لمبۆزی داپچڕاو بە بزەی تەوساوی و تینوایەتی ناپاکان ببینم.

ئەوان لە چاڵاویان روانیوە: نووکە بزەی بە بێزیان لە چاڵاوەوە بەرەو لای من دەگەڕێتەوە!

ئاوی پیرۆزیان بە تەماحی خۆیان ژاراوی کردوە؛ و چونکە خەونە چەپەڵەکانی خۆیان بە «لەزەت» دانا؛ وشەکانیشیان ژاراوی کرد.

کاتێک دڵە شێدارەکانیان لەبەر ئاگر راگرن، گڕ دادەمرکێ. کاتێک بوودەڵە لە ئاگر نزیک بێتەوە، گیانیش وە پرتەپرت دەکەوێ و دووکەڵی لێهەڵدەستێ.

مـیـوە لە دەسـتـەکـانیـان دا بڵ دەبێ و دەگنخێ: نیگایان وەک با دارەبەر دەشکێنێ و سەرلقەکانی ویشک دەکا.

روو وەرگێڕانی گەلێک کەس لە ژیان تەنیا روو وەرگێڕان لە بوودەڵەکان بوو؛ ئەو نەیدەویست چاڵاو و گڕ و بەر، دەگەڵ بوودەڵەکان بەش بکا.

گەلێک کەس روویان لە بیاوان کرد و دەگەڵ گیاندارە کێوییەکان تینوایەتیان چێژت؛ چونکە نەیاندەخواست دەگەڵ وشترەوانە دژوێنەکان لە دەوری ئەستێرێک دانیشن.

گەلێک کەس وەک وێرانکەرێک هاتن و وەک گلێرە بە سەر هەموو بێستانێک دا دابارین تەنیا لەبەر ئەوە کە پێ لە سەر شێویلکەکانی بوودەڵە دانێن و ئەوکی ببەستن.

پاروویەک کـە بۆم لە هەمـوان چەورتر بوو زانینی ئەوە نەبوو کـە ژیان خـۆی پێویستی بە دوژمنایەتی و مەرگ و خاچەکانی ئەشکەنجە هەیە:

بەڵام جـارێک پرسـیـارێکم کرد و وەخـتـابوو لەم پرسـە هەناسـەبڕ بم: چلۆن؟ ئاخۆ بوودەڵەکانیش بۆ ژیان پێویستن؟



ئایا چاڵاوە ژاراوییەکان و ئاگرە بۆگەنەکان و خەونە چەپەڵەکان و کرمەکانی نێو نانی ژیان پێویستن؟

ئەوە بێزارییم نیە بەڵکە بێزمە کە وەک برسیان ژیان قـووت دەدا! ئاخ، چەندە لە گیانیش بێزار بووم چونکە بوودەڵەکانیشم خاوەن گیان دەدیت!

پشـتم لە فـەرمـاندەرەکان کرد چونکە دیتم کە ئەوەی کە نووکە فـەرمـاندەریی پێدەڵێن: چەنەلێدان و سەودا لە سەر دەستەڵات ـ دەگەڵ بوودەڵەکانە!

لە نێوان گەلەکان دا بە زمانێکی نامۆ و بە گوێچکەیەکی ئاخنراو ژیام، هەتا زمانی سەودا و چەنە لێدانیان لە سەر دەستەڵات دەگەڵ من نامۆ بمێنێتەوە.

لووتم گرت و بە دڵێشـاوی بە نێوان سەراسەری دوێنێ و ئیمڕۆ دا تێپەڕیم: بە راستی، سەراسەری دوێنێ و ئیمڕۆ پڕ لە بۆگەنیوی نووسەرە بوودەڵەکانە.

درێژمـــاوەیەک وەک گــردەنشــینێکی کــەڕ و کــوێر و لاڵ ژیـام هەتا دەگــەڵ بوودەڵەی خاوەن دەستەڵات، خاوەن قەڵەم و خاوەن لەزەت نەژیم.

گیانم بە سەختی و بە پەنامەکی لە پلیکانەوە سەر کەوت. سەدەقەکانی لەزەت دەیبووژاندەوە؛ ژیانی ئەم کوێرە بە داردەستەوە بەرەو پێش دەخزا.

چم لێـقـەوما؟ چۆن خـۆم لە بێز رزگـار کـرد؟ کێ لاوەتی داوە بە چاوەکـانم؟ چلۆن هـەتا بـەرزاییـــەک فــڕیم کـــە هـیچ بوودەڵەیەک لە پەنا کـــانیـــاوەکـــەی دانەنیشتبوو؟

ئایا بێـزم بوو کـە بـاڵی بۆ ئافـراندم و توانایی خـۆ بە ئاو دادانی پێـدام؟ بە راستی بۆ دیتنەوەی کانیاوی لەزەت دەبێ هەتا بەرزترین بەرازیی بفڕم.

ئەهـای، من ئەوم دۆزیوەتەوە، برایان! لێـــرە لە بەرزتـرین بەرزایـی کـــانیـــاوی لەزەت بـۆ من هــەڵدەقــوڵێ! و لێـــرە ژیانێکە کـــە هـیچ بـوودەڵـەیـەک دەگـــەڵ من لێیناخواتەوە.

تۆ ئەی کـانیـاوی لەزەت! هەندێک خـێـراتر لەوەی کـە پێویسـتـە، بۆم دەرژێی! زۆرجار هەر ئەودەم کە دەتەوێ جامەکەم پڕ کەی دیسان بەتاڵی دەکەیەوە.

هێشتـا دەبێ فێـر بم کە بە شـەرم و حـەیایەکی پترەوە لە تۆ نزیک بمەوە؛ دڵم هێشتا توندتر لەوەی کە پێویستە بۆ لای تۆ بەرێوەیە.

دڵی من ئەوەی کە هاوینی منی تێدا دایسێ؛ هاوینێکی کورت، گەرم، ڕاڕایی و گەلێک شادم: دڵی هاوینیم چ تاسەیەکی بۆ فێنکایی تۆ هەیە!

خەفەتی بەهاری دواکەوتووم، تێپەڕیوە. بەدفەڕی کلۆبەفرەکانی ئاخری بەهارم، تێپەڕیوە! بە تەواوەتی بوومە هاوین و نیوەڕۆیەکی هاوینی!

هاوینێک لە بەرزترین بەرزی، بە کانیاوە ساردەکان و بێدەنگی شادخوازانەوە: ئەهای وەرن، هاوڕێیان، هەتاکوو بێدەنگی شادخوازانەتر بێ!

چونکە ئەوەیە بەرزی ئێمە و ماڵی ئێمە: ئێمە لێرە بەرزتر و هەورازتر لەوەی دەژین کە ناپاکەکان و تینوایەتی ئەوان ڕێی تێکەوێ.

هاوڕێیان! بە چاوە پاکەکانتان بڕواننە چاڵاوی لەزەتم! کەی لە نیگای ئێوە لێڵی تێدەکەوێ! بەڵکە بە پاکی خۆی بەرەو رووتان پێدەکەنێ.

لە سەر داری داهاتوو هێلانەی خۆمان چێ دەکەین؛ هەڵۆکان بە دندووکی خۆیان خۆراک بۆ ئێمە تەنیایان دێنن!

بە ڕاستی، نە ئەو خۆراکەی کە ناپاکەکان بتوانن لێیبخۆن! ئەوان وادەزانن ئاگر دەخۆن و زاریان دەسووتێ!

بە ڕاستی، لێرە بۆ ناپاکەکان ماڵێک ساز ناکەم! لەش و گیانیان بەختیاری ئێمە وەک مغارەی سەهۆڵ هەست پێدەکەن.

وەک گژەبا لە بان سەریان دەژین؛ نزیک بە هەڵۆکان، لە نزیک بەفر، لە نزیک هەتاو: گژەبایەکان وەها دەژین.

ڕۆژێک دەمەوێ وەک گژەبا هەڵکەمە سەریان و بە گیانم پشوو لە گیانەکانیان وەرگرم: داهاتووم وەهای دەوێ.

بە ڕاستی، زەردەشت بۆ هەموو نزمایییەک گژەبایەکە؛ و دوژمنەکان و هەموو ئەوانەی کخ و تف دەکەن وەها پەند دەدا: لە ئاست با لە تف کردن خۆ بپارێزن!»

وەهای گوت زەردەشت.



## سەبارەت بە هەڵەپەزەکان

بڕوانە، ئەمەیە کونی هەڵەپەزە! دەتەوێ بۆ خۆشی ببینی؟ لێرە تەونۆکەی خۆی دەتەنێ؛ دەستی لێدە هەتا بلەرێتەوە.

ئەوەتا بۆ خۆی دێ؛ بە خێر بێی هەڵەپەزە! سێ سووچێک کە لە سەر پشتت نەخشێنراوە، ڕەشە و نیشانەی تۆیە ـ و هەروەتر دەزانم کە چ لە ڕەوانت دا نیشتەجێیە.

لە ڕەوانت دا تۆڵە نیشتەجێیە. بە هەر کوێوە بدەی برینێکی ڕەشی لێ سەر هەڵدەدا؛ ژارت دەگەڵ تۆڵەکەی، ڕەوان تووشی گێژی دەکا!

وەها بە کینایە دەگەڵ ئێوە دەدوێم، ئێوەیەک کە ڕەوانەکان تووشی گێژی دەکەن، ئێوە موعیزەکەرانی **بەرابەری**! بۆ من ئێوە هەڵەپەزەن و تۆڵەی نهێنی.

بەڵام لە سەر ئەوەم کە نهێنی ئێوە ئاشکرا بکەم: هەر بۆیە بە رووتان پێدەکەنم، پێکەنینی بەرزایی خۆم!

لەبەر ئەوە تەونۆکەکەتان دەپسێنم هەتا رقتان ئێوە لە کونی درۆتان دەرکێشێ، هەتا تۆڵەکەتان لە پشتی وشەی «عەداڵەت»ەوە دەرپەڕێتە دەرەوە.

چونکە، **رسکانی مرۆڤ لە تۆڵە**، پردێکە بۆ بەرزترین هیواکانی من و پەلکەزێڕینەیەکە لە پاش تۆفانە درێژخایەنەکان.

بەڵام، بێشک، هەڵەپەزەکان جگە لەوە دەخوازن و دەگەڵ یەک وەها دەدوێن «عەداڵەت لای ئێمە هەر ئەوەیە کە تۆفانی تۆڵەمان دونیا دابگرێ.»

هەڵەپەزەدڵان لای خۆیان وەها سوێند دەخۆن: «تۆڵە لە هەموو ئەوانە دەکەینەوە کە دەگەڵ ئێمە بەرابەر نین و جوێنیان پێدەدەین ـ

ناوی ئاکارباشی لەوە بەدوا ویستی بەرابەری دەبێ و ئێمە بە دژایەتی هەر شتێکی دەستەڵاتدار هاوارمان بەرز دەکەینەوە!»

ئەی موعیزەکەرانی بەرابەری، شێتایەتی زۆردارانەی بێدەستەڵاتی، ئاوا لە دەروونی ئێوەوە بۆ «بەرابەری» هاوار بەرز دەکاتەوە. شاراوەترین هەوەسی زۆرداریی ئێوە ئاوا خۆی لە وشەگەلی ئاکارباشی دا دەپێچێتەوە.

خۆخوازیی بریندار کراو، ئێرەیی سەرکوتکراو، لەوانەیە خۆخوازی و ئێرەیی باوکەکانتان بێ کە لە دەروونی ئێوە دا وەک گڕ و شێتایەتی تۆڵە بلێسەی دێ.

ئەوەی کە باوک بێدەنگی لێکرد، لە کوڕ دا دێتە سەر زمان و زۆرجار کوڕم بە درکێنەری رازی باوک بینیوە.

مینای ئیلهام پێدەرەکانن: بەڵام دڵ نیە کە ئیلهامیان دەداتێ ـ تۆڵەیە. و کاتێک وردبین و سارد دەبنەوە، ئێرەییە کە وردبین و ساردیان دەکاتەوە، نە ئەقڵ.

ئێرەییان ئەوان بەرەو ڕێبازی بیرکەرەوەکانیش دەبا؛ نیشانەی ئێرەییان ئەوەیە کە هەمیشە گەلێک دوور دەڕۆن: هەتا ئەو جێیە کە لە ئاکام ماندوویەتییان بۆ خۆی دەبێ لە سەر بەفر بخەوێ.

لە هەر گازندەیەکیان زایەڵەی تۆڵە هەڵدەستێ و لە هەر پەسنێکیان دا ئازارێک هەیە. قازی بوون بۆ ئەوان هۆی رزگارییە.

بەڵام، هاوڕێیانی من، ئێوە ئاوا پەند دەدەم: بڕوا مەکەن بە وانەی کە هانەی سزا دانەوەیان تێدا بەهێزە!

ئەوانە خەڵکێکی بەد رەگەز و بەد بنەچەکەن؛ و لە سیمایان دا جەللاد و سەگی شوێن هەڵگر خۆ دەنوێنێ.

بڕوا مەکەن بەوانەی کە زۆر باسی دادخوازی خۆیان دەکەن! بە راستی، رەوانی ئەوان تەنیا هەر لە هەنگوین بەتاڵ نیە!

کاتێک خۆیان بە «پیاوچاکان و دادخوازان» دابنێن، لە بیرتان بێ کە ئەوانە بۆ فەریسی بوون شتێکیان کەم نیە، جگە ـ دەستەڵات!

هاوڕێیان نامەوێ تێکەڵاوی خەڵکی دیکە بم یا ئەوە کە من لە جیات یەکی دیکە دابنێن.

هی وا هەن کە ئامۆتەکانی من لەمەڕ ژیان موعیزە دەکەن کەچی هەر ئەودەم موعیزەکەرانی بەرابەرین و هەڵەپەزەن.

ئەگەر ئەم جاڵجاڵۆکە ژاردارانە ئەودەم کە لە کونەکانیان دا دانیشتوون و پشتیان لە ژیان کردوە، بە قازانجی ژیان قسە دەکەن، بۆ ئەوەیە کە دەیانەوێ لەم ڕێگایەوە زەرەر بگەیەنن.



دەیانەوێ لەم ڕێگایەوە زەرەر لەوانە بدەن کە نووکە دەستەڵاتیان بە دەستەوەیە: چونکە ئەوان بۆ موعیزەی مەرگ لە هەموو کەس ئامادەترن.

ئەگەر جگە لەمە بوایە، هەڵەپەزەکان شتێکی دیکەیان فێر دەکرد: و ئەمانە هەر ئەوانەن کە رۆژگارێک باشترین خراپوێژان و باشترین کافرسووتێنەرانی دونیا بوون.

نامەوێ من دەگەڵ ئەم موعیزەکەرانەی بەرابەری تێکەڵاو بکەن یان لە جیات ئەوانم دابنێن، چونکە عەداڵەت وەها بە من دەڵێ: مرۆڤەکان بەرابەر نین.

و بەرابەریش نابن! ئەگەر جگە لەمەم گوتبا ئەوینم بە بەرزەمرۆڤ چی لێدەهات؟

ئەوینی گەورەی من، من وەها وەقسە دێنێ: لە هەزار پرد و کوێرەڕێ دەبێ بەرەو داهاتوو هێرش بێنن و لە نێوانیان دا شەڕ و نابەرابەری پەرەگرتووتر بێ.

بە دوژمنایەتیەکانیان دەبێ خەیاڵ و تاپۆکان ساز بکەن و هاوڕێی خەیاڵەکان و تاپۆکانیان دەگەڵ یەک گەورەترین شەڕیان هەڵایسێنن!

چاک و خراپ، دەوڵەمەند و هەژار، ژێردەست و باڵادەست، و ناوەکانی دیکەی بایەخەکان: هەموویان دەبێ چەک و نیشانەکانی تەقەتەق بن، هەتا ژیان لە هەر کاتێک دا بە سەر خۆی دا زاڵ بێ.

ژیان دەیەوێ بە ئەستوون و پەیژەکانەوە خۆی بەرەو بەرزایی هەڵکێشێ! ئەو دەیەوێ لە شوێنە دوورەدەستەکان و ئەوپەڕترەوە بڕوانێ، بۆ لای جوانیە هەست بزوێنەکان ـ **لەبەر ئەوە** پێویستی بە بەرزاییەکان هەیە!

لەبەر ئەوە کە پێویستی بە بەرزایی هەیە، پێویستی بە پلیکان و بە دژایەتی پلیکان و وەسەرکەوتوان هەیە! ژیان دەیەوێ وەسەرکەوێ و لە کاتی وەسەرکەوتن دا بە سەر خۆی دا زاڵ بێ.

بڕوانن، هاوڕێیانی من! ئێرە کونی هەڵەپەزەیە، وێرانەکانی پەرستگایەکی کۆن سەری هەڵداوەتەوە ـ نووکە لەو چاوە گەشانە بڕوانن.

ئەوەی کە رۆژگارێک لێرە بیر و باوەڕی خۆی بە بەرد لە سەر یەک هەڵچنی، هەر وەک زاناترین خەڵک رازی ژیانی دەزانی.

ئەو لێرە دا بە ساناترین کینایە فێرمان دەکا کە لە جوانیش دا جەنگ و

نابەرابەری و شەڕ لە سەر دەستەڵات و مەزن دەستەڵاتی هەیە.

گومبەز و تاق لەم زۆرەوانیە دا چ خودایانە تێک دەشکێن: چلۆن بە سێبەر و رووناکی دەگەڵ یەک تێدەکۆشن، ئەم تێکۆشەرە خوداشێوانە.

هاوڕێیانی من، وەرن ئێمەش، وەها جوان و دڵنیا، دوژمن بین! وەرن وەک خودا **دژی** یەک تێبکۆشین!

هاوار! هەڵەپەزە، دوژمنی کۆنم، بە منیەوە دا! خوداشێوە و جوان و دڵنیا بە ئەنگوستمیەوە دا!

ئەو بیر دەکاتەوە: «سزا و عەداڵەتێک دەبێ لە ئارا دا بێ! ئەو نابێ لێرە بە خۆڕایی گۆرانی بە دوژمنێک هەڵبڵێ!»

ئادی، ئەو تۆڵەی ستاندەوە! هاوار کە نووکە ئەو رەوانیشم بە تۆڵەکەیەوە تووشی سەرەگێژە دەکا!

بەڵام، هاوڕێیان، بۆ ئەوەی تووشی سەرگێژە **نەبم**، بە توندی من لەم ئەستوونە ببەستنەوە: پێم خۆشترە کە «پیرۆزی ئەستوون نشین» بم هەتا گێژەڵووکەیەکی تۆڵە.

بە راستی، زەردەشت نە گردەلوولە و نە گێژەڵووکە و: ئەگەر سەماکەرە، قەت هەڵەپەزەی سەماکەر نیە!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە فرەزانە ناودارەکان

ئێوە فرەزانە ناودارەکان هەموو خزمەتکاری خەڵک و خورافەکانی خەڵک بوون ـ نە خزمەتکاری راستەقینە! دروست لە بەر ئەوەیە کە رێزتان لێدەگرن.

هەر لەبەر ئەوە بەرگەی بێئیمانی ئێوە دەگرن، چونکە ئەمە لای خەڵک گاڵتە و جەفەنگێکە. خواجە بەری غولامەکانی خۆی ئاوا بەردەدا و تەنانەت بە زماندرێژیشیان خۆی دەخافڵێنێ.

بەڵام ئەوەی کە خەڵک لێی بێزارن، هەر وەک سەگ لە گورگ، ئازادە گیانێکە دوژمنی بەند و پەتەکان، نە عیبادەتکەرێکی لێڕەوارنشین.



خەڵک هەمیشە دەرپەڕاندنی ئەو لە لانەکەی بە «هەستی راستی و دروستی» ناو دەبەن؛ و هێشتاش سەگە هەرە تیژکەڵپەکانیانی تێبەردەدەن.

چونکە «راستەقینە لەو شوێنەیە کە خەڵکی لێیە! هاوار، هاوار، لەو کەسەی کە بە دوای دا وێڵە» لە کۆنەوە وەهایان لە جاڕ داوە.

ئێوە ویستووتانە کە خەڵکی خۆتان لەبەر رێزێک کە دایدەنێن، بە بەر هەقیان دابنێن، و ئەمەتان بە «ویستی راستەقینە» ی خۆتان داناوە، ئێوە فرەزانە ناودارەکان!

دڵتان هەمیشە بە خۆی گوتوە: «من لە نێو خەڵک راپەڕیوم: دەنگی خوداش لەوێوە بە من گەیشتوە.»

ئێوە وەکیلەکانی خەڵک، هەمیشە وەک کەر، کەللەڕەق و فێڵەزان بوون.

گەلێک دەستەڵاتدار بۆ چاکتر لێخورینی خەڵک جاشەکەرێک ـ فرەزانێکی ناودار ـ ی وەپێش ئەسپەکەی خۆی داوە.

نووکە دەمەوێ کە ئێوە فرەزانە ناودارەکان لە کۆتایی دا کەوڵی شێر بە یەکجاری لە خۆتان فڕێ دەن!

کەوڵی نێچیرێکی کێوی، ئەو کەوڵە بە نەقش و نیگارە، و یاڵی لێکۆڵەران، پشکێنەران، سەرکەوتوان!

ئاخ، من ئەوکەسە بە «شارەزای راستەقینە» دادەنێم کە بەرەو سارای بێخودا دەچێ و دڵی رێزدانەری خۆی دەشکێنێ.

ئەو لە نێوان رەڵمە زەردە هەڵقرچاوەکانی بەر هەتاو، رەنگە بە زمانی تینوو نیگایەک لە دوڕگە پڕ کانیاوەکان بکا، لەوێ کە زیندوەکان لە ژێر دارە رەنگ تارەکان دەحەسێنەوە.

بەڵام تینوایەتی وای لێناکا کە بچێتە ریزی ئەم حەساوانەوە، چونکە لەو شوێنەی سارا کە ئاوەدانی هەیە، بوتەکانیش هەن.

ویستی شێرانەی خۆی بەمجۆرە دەوێ: برسی، دڕ، تەنیا، بێخودا.

ئازاد لە بەختیاری بەندەکان، رزگار لە خودا و پەرستنەکان، بێترس و ترسناک، مەزن و تەنیا: بەمجۆرەیە ویستی شارەزایانی راستەقینە.

شارەزایانی راستەقینە، ئازادە گیانەکان، هەمیشە لە بیاوان ژیاون و سەرۆکی بیاوان بوون؛ بەڵام فرەزانە ناوادارەکانی خۆش لەوەڕ، ئەم گیانلەبەرە بارەبەرانە، لە شارەکان دەژین.

چونکە هەمیشە وەک کەر داشقەی **خەڵک** رادەکێشن.

وا نیە کە لەم کارەیان تووڕە بم: بەڵام ئەوانە هەمیشە لەبەر چاوم خزمەتکار و لغاو کراون، هەر چەند کە بە لغاوی زێڕنەوە بترووسکێنەوە.

گەلێک جاران خزمەتکارانێکی باش و بە نرخ بوون. چونکە ئاکارباشی وەها دەڵێ: ئەگەر پێویستە کە خزمەتکار بی، کەسێک بدۆزەوە کە پتر لە هەموو کەس پێویستی بە خزمەتی تۆ هەبێ!

«بە خزمەتکارێکی وەک تۆ، گیان و ئاکارباشی خاوەنەکەت هەڵدەدا و تۆ خۆشت دەگەڵ گیان و ئاکارباشی ئەو هەڵدەدەی!»

بە راستی، ئێوە فرەزانە ناوادارەکان، ئێوە خزمەتکارانی خەڵک، خۆشتان دەگەڵ ئاکارباشی خەڵک هەڵتان داوە ـ و هەروەتر خەڵکیش بە بۆنەی ئێوەوە! ئەوەی بۆ سەربڵندی ئێوە دەڵێم!

بەڵام، لە روانگەی منەوە، ئێوە تەنانەت بە ئاکارباشییەکانتانیشەوە هەر وەک خەڵکن: خەڵک، بە چاوی کەم سۆمایانەوە؛ خەڵک، کە نازانن **گیان** چیە!

گیان هەر ئەو ژیانەیە کە خۆی رێ دەباتە نێو ژیانەوە! بە رەنجی خۆی زانایی خۆی پتر دەکا ـ پێشتر ئەوەتان دەزانی؟

بەختیاری گیان ئەوەیە: وەک گیانداری قوربانی چەورکراو و لە فرمێسکی خۆ دا پیرۆز بوون ـ پێشتر ئەوەتان دەزانی؟

کوێرایی کوێر و دەست کوتانی ئەو لە کاتی رۆیشتن دا دەبێ نیشاندەری هێزی هەتاوێک بێ کە ئەو تێی روانیوە ـ پێشتر ئەوەتان دەزانی؟

هەڵسەنگێنەر دەگەڵ کێو، فێری ساز کردن دەبێ! راگوێزتنی کێوەکان بۆ گیان کارێکی وەها دژوار نیە ـ پێشتر ئەوەتان دەزانی؟

ئێوە تەنیا ئاورینگەکانی گیان دەناسن، بەڵام ئێوە نە ئەو سندانەی کە خۆیەتی، و نە بێڕەحمی کوتکەکەی، نابینن!



بە راستی، غرووری گیان ناناسن. بەڵام بەرگەی خۆ بە کەم دانانی گیان تەنانەت کەمتر [لە غرووركەشی] دەگرن، ئەگەر جارێک بیەوێ وە زمان بێ.

ئێوە قەت شایانی ئەوە نەبوون کە گیانی خۆتان لە چاڵەبەفرێک باوێن: چونکە بۆ ئەم کارە ئەوەند کە پێویستە داغ نین! لەبەر ئەوە لە چێژی ساردی ئەویش بێئاگان.

بەڵام کردارتان لە هەموو کارەکان دا وەهایە کە دەڵێی دەگەڵ گیان گەلێک ئاشنان؛ و گەلێک جار فرەزانیتان کردۆتە هەژارخانە و نەخۆشخانەیەک بۆ شاعیرە خراپەکان.

هەڵۆ نین: بۆیە بەختیاری بە سامی گیانتان بەتاقی نەکردۆتەوە. ئەوەی کە باڵندە نیە وا باشترە کە لە بەرزایی هەڵدێرەکان هێلانەی چێ نەکا.

ئێوە شیلەوتین: بەڵام هەر زانستێکی قووڵ، ساردـاوی پێ دا دەڕوا: ژوورووترین کانیاوەکانی گیان ساردن و فێنک کەرەوەی دەستە گەرمەکان و دەستی مرۆڤە کارەکەرەکانە.

ئێوە فرەزانە ناوادارەکان، بە رێز و بە پشتێکی قیتەوە دەوەستن! هیچ بایەک و ویستێکی بە هێز ئێوە لە جێ هەڵناکەنێ.

ئایا باسپێرێکی خڕ و هەڵمساو و بە کوتەکوتتان لەبەر تەوژمی با دیوە کە بە سەر دەریا دا دەڕوا؟

فرەزانیم وەک باسپێرێک بە کوتەکوت لەبەر تەوژمی گیان، بە سەر دەریا دا دەڕوا ـ فرەزانیی تۆڕی من!

بەڵام ئێوە خزمەتکارانی خەڵک، ئێوە فرەزانە ناوادارەکان، چلۆن دەتوانن دەگەڵ من دەرچن؟

وەهای گوت زەردەشت.

## ستراني شەو

شەوە: نووکە کانیاوە هەڵقوڵاوەکان هەموویان دەنگ بەرزتر قسە دەکەن. ڕەوانی منیش وەک کانیاوێکی هەڵقوڵاو وایە.

شەوە: نووکەیە کە سترانی ئەویندارەکان تێگڕا لە خەو رادەپەڕن. ڕەوانی منیش سترانی ئەویندارێکە.

شتێکی بێقەرار و نائارام لە من دایە کە دەیەوێ وە دەنگ بێ. تاسەی ئەوینێک لە من دایە کە بە زمانی ئەوین دەدوێ.

من نوورم، ئاخ، بریا شەو بام! بەڵام ئەمە تەنیایی منە کە منی لە نوور دا نوقم کردوە.

ئاخ، بریا تار و شەوڕەنگ بام! ئەودەم دەمزانی کە چلۆن مەمکی نوور بمژم!

ئافەرین بە ئێوەش دەڵێم، ئێوە هەسێرە چووکە بە جریوەجریوەکان و گوڵ هەسێرەکانی سەرەوە! لە دیاری نوورتان دەبا شاد بووبام.

بەڵام من لە نووری خۆم دا دەژیم، من ئەو پڕشنگانە دەنۆشمەوە کە لە من دەبنەوە.

دەگەڵ بەختیاری ستێنەران بێگانەم و گەلێک جار بە خەیاڵم داهاتوە کە دەبێ دزین لە ستاندن پیرۆزتر بێ.

دەستبەتاڵیم لەوەیە کە دەستەکانم قەت لە بەخشینەوە ناوەستن، ئێرەییم لەوەیە کە چاوە چاوەڕوانەکانی ئەو دەبینم و شەوە ڕووناکەکانی تکای.

هاوار لە چارەڕەشی بەخشێنەران! هاوار لە گیرانی هەتاوەکەم! هاوار لە تاسەی دوای تاسەباری! هاوار لە برسیایەتی دوای تێری!

ئەوان لە من دەستێنن: بەڵام ئایا دەستم بە ڕەوانەکانیان ڕادەگا؟ لە نێوان دان و ستان دا هەڵدێرێکە؛ و لە ئاکام لە سەر چووکترین هەڵدێریش دەبێ پردێک لێدرێ.

لە جوانییم برسیایەتییەک سەر هەڵدەدا: پێمخۆشە ئەوانەی کە نووریان بە سەر دا دەپرژێنم ئازاریان بدەم؛ پێمخۆشە لەوانەی کە دیاریم پێداون بدزم ـ



وەها برسی بەدخوازییم.

کاتێک دەستێک بۆ لام درێژ دەکرێ، دەستم دەکێشمەوە و دەوەستم؛ وەک ئاوەهەڵدێرێک کە تاوێک لە هەڵدێرانی دەوەستێ ـ وەها برسی بەدخوازییم.

پڕاییم لە بیری وەها تۆڵەیەک دایە: وەها بەدفەڕییەک لە تەنیاییم بۆ دەرەوە هەڵدەقوڵێ.

بەختیارییم لە بەخشینەوەی بەخشینەوە دا مرد؛ ئاکارباشیم لە پڕایی خۆی وە گیان هاتوە!

ئەوەی کە هەمیشە دەبەخشێتەوە لە مەترسی ئەوە دایە کە شەرمی لە کیس بدا. ئەوەی کە هەمیشە دەبەشێتەوە، دڵ و دەستی لە بەشینەوەی هەمیشەیی، پینەی دەبەستێ.

چاوەکانم ئیدی لە ئاست شەرمی گەداکان فرمێسک هەڵناوەرێنن؛ دەستم لەوە زوورتری لێهاتوە کە هەست بە لەرزینی دەستە پڕ کراوەکان بکا.

فرمێسکی چاوەکان و بەزەی دڵم چوونە کوێ؟ ئەی تەنیایی گشت بەخشێنەران! ئەی بێدەنگی گشت درەوەشێنەران!

گەلێک هەتاو لە فەزای بۆش دا لە خول دان: بە نووری خۆیان دەگەڵ تاریکی دەدوێن ـ دەگەڵ من بێدەنگن.

ئاخ، ئەوەیە دوژمنایەتی نوور دەگەڵ نوورانی: ئەو بێبەزەیانە لە سەر جەغزی خۆی دەگەڕێ.

دەگەڵ ئەوەی کە نوورانییە لە قووڵایی دڵیەوە بێدادگەرە، ساردە لە ئاست هەتاوەکان دا: هەر هەتاوێک وەها دەگەڕێ.

هەتاوەکان مینای تۆفان لە سەر جەغزی خۆیان دەفڕن: ئەوەیە گەڕیان، درێژە بە ویستی بێوچانی خۆیان دەدەن: ئەوەیە ساردییان.

ئاخ، ئەمە ئێوەن، ئێوە تارەکان، ئێوە شەوڕەنگەکان، کە گەرما لە نوورانییەکان وەردەگرن! ئاخ، ئەمە ئێوەن کە لە گوانی نوور شیر و هەوێنی گیان دەخۆنەوە!

ئاخ، دەوروبەرم سەهۆڵە و سەهۆڵبەندان دەستم دەسووتێنێ! ئاخ، لە من دا

تینوایەتییەکە تینووی تینوایەتی ئێوە!

شەوە: مخابن کە دەبێ نوور بم! و تینووی شتە شەوڕەنگەکان! و تەنیایی!

شەوە: نووکە تاسەم وەک کانیاوێک لە منەوە دەدەڵێ. تینووی قسە کردنم.

شەوە: نووکە کانیاوە هەڵقوڵاوەکان هەموویان دەنگ بەرزتر قسە دەکەن. ڕەوانی منیش وەک کانیاوێکی هەڵقوڵاو وایە.

شەوە: نووکەیە کە سترانی ئەویندارەکان تێگڕا لە خەو ڕادەپەڕن. ڕەوانی منیش سترانی ئەویندارێکە.

وەهای گوت زەردەشت.

## سترانی سەما

ئێوارەیەک زەردەشت دەگەڵ مریدەکانی بە نێو لێرەوار دا تێدەپەڕی و هەروا کە لە کانیاوێک دەگەڕا، بڕوانە، ڕێی دە مێرغوزارێکی بژوێن کەوت کە دار و دەوەن پەرژینیان لە دەوری دابوو: کیژگەل لە سەر مێرگ پێکەوە هەڵدەپەڕین. دەستبەجێ کیژگەل کە زەردەشتیان ناسیەوە، دەستیان لە هەڵپەڕین هەڵگرت. بەڵام زەردەشت بە ڕوویەکی دۆستانەوە بۆ لایان چوو و ئەم قسانەی گوت:

«لە هەڵپەڕین مەوەستن، کیژە نازەنینەکان! نە کایە تێکدەرێکی چاوپیس بۆ لاتان هاتوە و نە دوژمنێکی کیژگەل.

من لە بەرابەر شەیتان دا، لاگری خودام، چونکە شەیتان «گیانقورسی» یە. کەوایە، ئەی سووک پێیان، من چلۆن دەتوانم دوژمنی سەمای خودایانەی ئێوە بم؟ یا دوژمنی پێی کیژگەلان بە گوێزینگە جوانەکانیانەوە؟

ڕاستە کە من لێرەوارێکم و شەوێک لە دارە تارەکان. بەڵام ئەوەی لە تارییم نەترسێ، لە ژێر سەروەکانم جارە گوڵی سووریش دەبینێتەوە.

هەروەتر ئەو خودا بچووکەش کە کیژگەل لە هەموو کەس پتریان خۆش دەوێ. ئەو لە پەنا کانی بە چاوە لێک نراوەکانی، ئارام خەوتوە.

بە ڕاستی، ئەم تەوەزەلە، بە ڕۆژی ڕووناک لێی خەوتوە! لەوانەیە زۆر وە دوای پەپوولەکان کەوتبێ!



سەماکەرە جوانەکان! لە من تووڕە مەبن ئەگەر خودا بچووکەکە هەندێک تەمێ بکەم! ڕەنگە هاوار بکا و بگری ـ بەڵام گریانەکەشی پێکەنینییە!

ئەو بە چاوی بە فرمێسکەوە بۆ سەمایەک بانگتان دەکا: و من خۆم بۆ سەماکە سترانێک دەڵێم:

سترانێک بۆ سەما و فڕێک بۆ «گیانقورسی»، سەرترین و تواناترین شەیتانم، کە دەڵێن «سەرۆکی دونیا» یە.

ئەوەیە ئەو سترانەی کە زەردەشت کوتی، ئەودەم کوپیدۆ و کیژگەل پێکەوە هەڵدەپەڕین:

ئەی ژیان! بەم زوانە ڕوانیمە چاوت و دەتگوت لە قووڵایی بێپەی دا نوقم بووم.

بەڵام تۆ بە قولاپی زێڕن منت هەڵکێشاوە و کاتێک تۆم بە بێپەی دانا، گاڵتەجاڕانە بە من پێکەنی.

گوتت کە «قسەی گشت ماسیەکان هەر ئەوەیە؛ ئەوەی کە خۆیان نەیپێون ناپێورێ.

بەڵام من تەنیا خۆ دەگۆڕم و درم و بە گشتی ژنێکم و بێ هیچ ئاکارباشییەک:

ئەگەرچی ئێوە پیاوگەل من بە «قووڵ» یا «وەفادار» یا «هەرمان» یا «بەپێچ وپەنا» ناو دەبەن.

بەڵام ئێوە پیاوگەل هەمیشە ئاکارباشی خۆتان بە من دەبەخشن ـ ئاخ، ئێوە ئاکارباشان!»

وەها پێکەنی ئەم ژنە سەیر وسەمەرە؛ بەڵام من هیچکات باوەڕم بە ئەو و پێکەنینەکەی نیە، هەر کات کە بە خراپە لە خۆی دەدوێ.

کاتێک بە سەرسوڕماوی دەگەڵ فرەزانیی تۆڕم دەدوام، دەرهەڵبوو و گوتی: «تۆ دەخوازی، تۆ تاسەباری، تۆ ئەویندارى ـ تەنیا لەبەر ئەوەیە کە بە ژیان هەڵدەڵێی.»

بە تووڕەییەوە وڵامم داوە و ڕاستیم دەگەڵ فرەزانیی دەرهەڵبووم باس کرد؛ و مرۆڤ ئەودەم تووڕەتر وڵامەکەی دەداتەوە کە دەگەڵ فرەزانیی خۆی «ڕاستی»

دەگێڕێتەوە.

بە هەر حاڵ، ڕووداوی ئێمە سێ کەس وەهایە: بە گیان و دڵەوە تەنیا ژیانم خۆش دەوێ ـ و بە ڕاستی، ئەودەم کە لێی بێزارم، لە هەموو کاتێک پترم خۆش دەوێ!

بەڵام ئەوە کە فرەزانییم خۆش دەوێ، و بگرە گەلێ جار زۆرم خۆش دەوێ، لەبەر ئەوەیە کە من زۆر وەبیر ژیان دەخاتەوە!

ئەو چاوەکانی ژیان و پێکەنینەکەی و تەنانەت قولاپی زێڕنی ماسی گرتنیشی هەیە: من چم لە دەست دێ کاتێک ئەو دوانە وەها وەک یەک دەچن؟

کاتێک ژیان ڕۆژێک لە منی پرسی: «ئەم فرەزانییە ئیدی کێیە؟» بە تاسەبارییەوە پێم گوت: «ئاخ، ئادی! فرەزانی!

بەڵام مرۆڤ تینووی ئەوە و تینوایەتی ناشکێ. لە پشت پەچەکانەوە سەیری دەکا، بە تۆڕ ڕاوی دەکا و دەیگرێ.

ئایا ئەو جوانە؟ چووزانم! بەڵام پیرترین کەپوورەکانیش لە داوی دەکەون.

خۆگۆڕ و لاسارە: گەلێکم دیوە لێوی بگەزێ و بە پێچەوانەی ڕەوتی موویەکانی شانە بە قژی دابێنێ.

لە وانەیە بەدزات و درۆیین بێ و بە هەر حاڵ ژنە؛ بەڵام کاتێک بە خراپە باسی خۆی دەکا لە هەمیشە دڵڕفێنتر دەبێ.

کاتێک ئەم قسەیەم بە ژیان گوت، کەنینێکی گاڵتەجاڕانەی کرد و چاوەکانی قووچاند و گوتی: «باسی کێ دەکەی؟ بێشک من؟

بەڵام ئەگەر ڕاستیش بکەی، ئایا ڕەوایە کە بەرەو ڕووم ئاوا بڵێی؟ کە وایە، لە فرەزانیشت شتێک بێژە!»

ئاخ، ئەی ژیانی ئازیز، ئەودەم جارێکی دی چاوەکانت هەڵێناوە و گۆیا جارێکی دی لە قووڵایی بێپەی دا نوقم بوومەوە.

وەها سترانی بێژت زەردەشت. بەڵام کاتێک هەڵپەڕین تەواو بوو و کیژگەل ڕۆیشتن، غەم دایگرت.

لە ئاکام گوتی: ماوەیەکە هەتاو ئاوا بوە، مێرگ شێدارە و لە لای لێڕەوارەوە



شنەیەکی نەرم هەڵیکردۆتێ.

شتێکی نەناسیاو لە دەوروبەری منە و تێمڕاماوە. چی؟ هێشتا هەر زیندووی، زەردەشت؟

بۆ؟ بۆچی؟ لە کام ڕێ؟ بۆ کوێ؟ کوێ؟ چلۆن؟ دیسان زیندوو مانەوە گەوجایەتی نیە؟

ئاخ، هاوڕێیان، تاریکانە کە وەها لە دەروونم دەپرسێ. لە پەشێوییم ببوورن!

تاریکان داهاتوە: بۆ داهاتنی تاریکان لێم ببوورن!

وەهای گوت زەردەشت.

## سترانی ناشتن

لەوێیە دوورگەی گۆڕستان، دوورگەی خامۆش؛ لەوێیە، گۆڕەکانی لاوەتیم! دەمەوێ بۆ وێندەرێ تاجە گوڵێکی هەمیشە سەوزی ژیان ببەم.

بە وەها تەمایەک لە دڵ دا، دەریام بڕیوە.

ئەی خەیاڵ و ئیلهامەکانی لاوەتیم! ئێوە ئەی گشت نیگاکانی ئەوین، ئەی ساتەکانی لاوەتی! چ زوو لێم تێپەڕین! ئیمڕۆ ئێوە وەک مردووکانم وەبیر دێنمەوە.

لە لایەن ئێوە ئازیزترین مردووکانم عەترێکی خۆش بەرەو من دێ، عەترێکی دڵکەرەوە و فرمێسکێنەر. بە ڕاستی کە دڵی دەریاوانی تەنیا دەهەژێنێ و دەیکاتەوە.

هێشتا هەر منم خەنیترین و ئێرەیی پێکێنەرترین کەس ـ من، ئەو تەنیاترین کەسە! چونکە من ڕۆژگارێک ئێوەم **هەبوو** و ئێوەش هێشتا منتان هەیە: پێم بڵێن، بۆ کێ وەک من وەها سێوگەڵێکی سوور لە دار وەریون؟

من هێشتاش میراتبەر و خاکی ئەوینی ئێوەم و بە یادی ئێوە بە ئاکارباشیە ڕەنگاوڕەنگە خۆڕسکەکانم چرۆی دەردەکەم، ئەی ئازیزترین کەسانم!

ئاخ، ئێمە بۆ ئەوە ئافرابووین کە لە لای یەک باین، ئەی ئەمەگدار، موعجیزەی غەریب؛ ئێوە نە وەک باڵندە تاراوەکان بۆ لای من و تکام هاتن، نا، ئێوە هەروەک

بڕواپێکراوەکان بۆ لای ئەم بڕواپێکراوە هاتن.

ئادی، ئێوە کە وەک من بۆ ئەمەگداریی و هەرمانەتیە ناسکەکان ئافرابوون، ئایا نووکە لەبەر بێئەمەگیتان بەبێ ئەمەگتان ناو بەرم، ئێوە دەمەکان و ساتەکانی خودایی؟ هێشتا ناوێکی دیکە بۆ ئێوە ناناسم.

بە راستی، چ زوو مردن، ئێوە کۆچکردوەکان. بەڵام نە ئێوە لە من راتان کرد و نە من لە ئێوە: ئێمە گوناهێکمان نیە ئەگەر دەگەڵ یەک بێئەمەگیمان کردوە.

بۆ ئەوەی کە **من** بکووژن، ئێوەیان خنکاند، ئێوە مەلە خۆشخوانەکانی هیواکانم! ئادی، بەدخوازیی هەمیشە بۆ لای ئێوە، ئێوە ئازیزترین کەسانم، تیر داوێژێ ـ هەتا دڵی من بپێکێ!

و پێکای! ئێوە هەمیشە دڵبەندترین کەسانم بوون و ماڵ و دەسکەوت و سامانی من: **لەبەر ئەوە** دەبا جوانەمەرگ بووبان و ئەویش زۆر زوو!

ئەو تیری بۆ لای ناسکترین شتێک کە شکم دەبرد هاویشت، بەرەو ئێوە کە پێستتان بە نەرمی پەڕ بوو، یان باشتر بڵێم، وەک بزەیەک کە بە نیگایەک بمرێ!

بەڵام، دەمەوێ ئەو قسەیە بە دوژمنەکانم بڵێم: تەواوی جەنایەتەکانی مرۆڤ لە بەرابەر ئەوەی  کە ئێوە دەگەڵ منتان کرد هیچ نین؟

کارێکتان دەگەڵ من کرد خراپتر لە هەر جەنایەتێک، ئێوە ئەو دەست نەکەوتوویەتان لە من وەرگرت ـ بە ئێوە وەها دەڵێم، بە ئێوە دوژمنەکانم!

ئێوە ئاواتەکانی لاوەتی و ئازیزترین موعجیزەکانی منتان کوشت! ئێوە ئاواڵەکانی یاریم، ئەو گیانە شادانەتان لە من وەرگرت! بە یادیان ئەم تاجەگوڵە دادەنێم و ئەم تووک ونفرینە!

تووکتان لێبێ، دوژمنەکانم! ئێوە هەرمانەتی منتان کورت کردەوە، وەک دەنگێک کە لە شەوی سارد دا بشکێ! ئەو وەک زیتەی نیگایەک لە چاوەکانی خوداییەوە، تەنیا بۆ لای من هاتبوو.

جارێک پاکییم لە دەمێکی پیرۆز دا وەهای بە من گوت: «بوونەوەران دەبێ گشتیان بۆ من خودایانە بن.»

ئەودەم ئێوە بە تاپۆ چەپەڵەکانتان هێرشتان بۆ سەر من هێنا، ئاخ، ئەو دەمە پیرۆزە نووکە بۆ کوێ رای کردوە؟



«گشت رۆژەکان دەبێ بۆ من پیرۆز بن» ـ فرەزانیی لاوەتیم رۆژێک وەهای گوت: بە راستی، ئەمە قسەیەک بوو لە لایەن فرەزانییەکی شادخوازەوە!

بەڵام ئێوە دوژمنەکانم شەوەکانتان دزیم و بە عەزابی شەونخوونیتان فرۆشت: ئاخ، ئەو فرەزانیە شادخوازە بۆ کوێ رایکردوە؟

سەردەمایەک، مەیلی فاڵ گرتنەوەی بەختم بە مەلان هەبوو؛ بەڵام ئێوە کوندە غوولێکتان لە سەر رێ دانام، نیشانەیەکی شووم. ئاخ، ئەو تکا شەرمنەم بۆ کوێ رای کردوە؟

رۆژگارێک سوێندم خوارد کە چاوپۆشی لە هەموو بێزێک بکەم. ئەودەم ئێوە خزم و کەس و هاوساکانی منتان کردە سوورەکوانێکی بە کێم. ئاخ، ئەو سوێندە هەرە نەجیبەم بۆ کوێ رای کردوە؟

سەردەمایەک هەروەک کوێران بە رێگا پیرۆزەکان دا دەڕۆیشتم؛ ئەودەم ئێوە زیانی خرۆتان هاویشتە سەر رێی پیاوی کوێر: و نووکە ئەو رێبازە کۆنە بێزی هەڵدەستێنێ.

کاتێک دژوارترین کارم تەواو کرد و جەژنی سەرکەوتنی زاڵ بوونەکانی خۆم گرتبوو، ئەوانەی کە منیان خۆش دەویست ناچارتان کردن هەتا هاوار بکەن کە من پتر لە هەر کەسێکی دی ئازارم پێگەیاندوون.

بە راستی، کارتان هەر ئەوە بوە: ئێوە باشترین هەنگوین و دەسکەوتی باشترین هەنگەکانی منتان تاڵ کردوە.

هەمیشە بێچاو و رووترین گەداکانتان بۆ لای دەست ئاوەڵەییم ناردوە. هەمیشە بێشەرمە چارەسەر نەکراوەکانتان لە دەوری بەزەیی من کۆ کردۆتەوە. ئاوا ئیمانی ئاکارباشیتان بریندار کردم.

کاتێک پیرۆزترین شتم بۆ قوربانی دانا، «دینداریی» ئێوە دەستبەجێ چەورترین دیارییەکانی لە پەنا دانا: وەها کە پیرۆزترین شتم لە دووکەڵی چەورایی ئێوە دا خنکا.

رۆژێک کە ویستم وەها سەما بکەم کە قەت نەمکردبوو: سەمایەکی بەرزتر لە هەموو ئاسمانەکان؛ ئێوە خۆشەویسترین سترانبێژی منتان فریو دا.

ئەودەم ئەو هەوایەکی غەمین و بەسۆزی دەست پێکرد: ئاخ، ئەو وەک

شەپپوورێکی دەنگ ناخۆش گوێی ئازار دام!

ئەی سترانبێژی جەنایەتکار، ئەی ئامرازی بەدخوازی، ئەی بێگوناهترین! من ئامادەی باشترین سەمای خۆم بووم کە تۆ بە دەنگەکانت دڵخوازت کوشتم!

تەنیا لە سەما دایە کە من دەزانم چلۆن بە ئیشارە لە بەرزترین شتەکانم بدوێم ـ و نووکە بەرزترین ئیشارەم لە دەست و پێیەکانم دا نەوتراو ماونەتەوە!

بەرزترین هیوام نەوتراو و بەرنەدراو ماوەتەوە! و خەیاڵ و ئاواتەکانی لاوەتیم هەموو مردوون.

چلۆن توانیومە بەرگەی ئەوە بگرم؟ چلۆن لەم برینانە تێپەڕیم و بە سەریان دا زاڵ بووم؟ چلۆن رەوانم جارێکی دی لەم گۆڕانە هەستاوە؟

ئادی، شتێکی برین هەڵنەگر و دە گۆڕنەچوو لە من دایە، شتێکی رەوەزشکێن، کە پێیدەڵێن **ویستی من**. ئەو بێدەنگ و بێئاڵوگۆڕ بە نێوان ساڵەکان دا تێدەپەڕێ.

ئەو، ئەو ویستە تەمەندارەم، بە پێیەکانی من رێی خۆی دەبڕێ؛ ئەندەروونی دڵ پتەو و نەمرە.

تەنیا پاژنەم برین هەڵنەگرە. هێشتا هەر زیندووی و هەر ئەوەی کە هەبووی، ئەی سێبوورترین! هێشتاش هەموو گۆڕەکان دەدەیەوە و وەدەر دەکەوی!

پاشماوەی لاوەتیم هێشتا لە تۆ دا زیندوویە و تۆ پڕ لە هیوا، وەک ژیان و لاوەتی، لە سەر وێرانە زەردەکانی گۆڕەکان دانیشتووی.

ئادی، تۆ هێشتاش بۆ من وێرانکەری گشت گۆڕەکانی: هەر بژی ویستی من! و تەنیا لەو شوێنەی کە گۆڕەکان هەڵکەوتوون، هەستانەوەیەک هەیە.

وەهای ستران بێژت زەردەشت.

## سەبارەت بە زاڵ بوون بە سەر خۆ دا

ئایا ئێوە فرەزانترین خەڵک، ئەوەی کە ئێوە هان دەدا و دەتانهاروژێنێ بە «ویستی راستی» دادەنێن؟

من ویستی ئێوە ئاوا ناو دەنێم: ویستی بیر کردنەوە لەوەی کە هەیە!



ئێوە لە پێش دا دەتانەوێ ئەوەی کە هەیە، **بیکەنە** شیاوی بیر لێکردنەوە: چونکە بە بەدگومانی بەجێ، هەر لە پێشدا شکتان هەیە کە شیاوی بیر لێکردنەوە بێ.

بەڵام ئەو دەبێ لە بەرابەر ئێوە دا تەسلیم بێ و سەر دانوێنێ! ویستی ئێوە ئەوەی دەوێ. دەبێ دەستەمۆ و فەرمانبەری گیان بێ، هەر وەک ئاوێنە و وێنە گەڕاوەکەی ئەو.

ئەمەیە تەواوەتی ویستی ئێوە، ئێوە فرەزانترین خەڵک، کە ویستێکی دەستەڵاتە، و هەروەها ئەودەم کە لە چاکە و خراپە دەدوێن و لە بایەخ دانانەکان.

دەتانەوێ وەها دونیایەک بافرێنن کە لە بەرابەری دا بتوانن بە چۆک دابێن: ئەمەیە دوایین هیوا و سەرخۆشی ئێوە.

بەڵام خەڵک ، ئەو نەزانانە ـ هەروەک رووبارێکن کە گەمێیەکی لە سەرە: و لەو گەمێیە دا بایەخ دانەرییەکان سەنگین و روو داپۆشراو دانیشتوون.

ئێوە ویست و بایەخەکانی خۆتان لە سەر رووباری «بوون» داناوە؛ و ئەوەی خەڵک بە ناوی چاکە و خراپە بڕوایان پێیەتی، ویستی دەستەڵاتێکی کۆنم بۆ ئاشکرا دەکا.

ئەمە ئێوە بوون، ئێوە فرەزانترین خەڵک، کە وەها میوانانێکتان لەم گەمێیە نا و ناوی رازاوە و فیزتان پێدان، ئێوە و ویستی فەرماندەری ئێوە!

نووکە رووبار گەمێی ئێوە هەڵدەگرێ: ئەو دەبێ هەڵیبگرێ. چ قەیدی کە شەپۆلی دڕ هەڵدەستێ و بە تووڕەیی خۆی لە سینگی ئەو دەکوتێ!

ئەوەی بۆ ئێوە، ئێوە فرەزانترین خەڵک مەترسی و ئاکامی چاکە و خراپەی هەیە، رووبار نیە، بەڵکە هەمان ویستە، ویستی دەستەڵات، ویستی بەرهەمهێنەر و کۆڵنەدەری ژیان.

بەڵام بۆ ئەوەی کە بڕوای من سەبارەت بە چاکە و خراپە بزانن، دەمەوێ بڕوای خۆم لە سەر ژیان و رەگەزی زیندوان بە ئێوە راگەیەنم.

من وە دوای بوونەوەری زیندوو کەوتووم، من گەورەترین و چووکترین رێگاکانم پێواوە، هەتا پەی بە رەگەزی ئەو بەرم.

ئەودەم کە زاری بەسترابوو، بە ئاوێنەیەکی سەد سووچ نیگای ئەوم گرتەوە:

هەتا چاوەکانی دەگەڵ من بدوێن. و چاوەکانی دەگەڵ من دوان.

بەڵام، لە هەر کوێ کە زیندوویەکم چاو پێکەوت، باسی فەرمانبەریش لە ئارا دابوو. زیندووکان هەموویان فەرمانبەرن.

دووهەم ئەوەکە: هەر کەس نەتوانێ بە فەرمانی خۆی بکا، فەرمانی لە سەر دەدەن. وەهایە ڕەگەزی زیندوان.

بەڵام ئەمەیە سێهەم شتێک کە بیستم: فەرماندەری دژوارترە لە فەرمانبەری؛ نەک لەبەر ئەوە کە فەرماندە باری گشت فەرمانبەرەکانی بە کۆڵ دەبا، و ئەم بارە دەتوانێ بە سانایی تێکی بچەمێنێ:

لە هەر فەرمان دانێک دا، ئەزموونێک و مەترسی پێکردنێکم دیت: بوونەوەری زیندوو هەر جارەی کە فەرمان دەدا، هەمیشە بەم کارەی خۆ لە مەترسی داوێ.

ئادی، تەنانەت ئەودەم کە فەرمان بە خۆی دەدا: ئەودەمیش دەبێ سزای فەرماندەری خۆی بداتەوە. ئەو دەبێ قازی، بەڕێوەبەر و قوربانی قانوونی خۆی بێ.

لە خۆم پرسی: ئەمە چلۆن دەقەومێ؟ ئەوە چییە کە بوونەوەری زیندوو وا لێدەکا هەتا فەرمان بەرێ و فەرمان بدا و لە کاتی فەرماندەری دا فەرمانبەری بکا؟

ئەی فرەزانترین خەڵک! نووکە گوێ لە قسەم بگرن و بە ڕاستی بە تاقی کەنەوە کە داخۆ من پەیم بە دڵی ژیان هەتا ڕەگ و ریشەی دڵی بردوە یا نا:

لە هەر کوێ کە زیندووم دیوە، ویستی دەسەڵاتم دیوە؛ تەنانەت لە ویستی بەندەش دا ویستی سەرۆکایەتییم دیوە.

ئەمە کە بێهێزتر خزمەتی هێزدارتر دەکا، لەبەر ئەوەیە کە ویستەکەی ئەو بۆ ئەم کارە ناچار دەکا، ویستێک کە دەیەوێ سەرۆکایەتی بە سەر بێهێزتر دا بکا: ئەمە لەزەتێکە کە نایەوێ دەستی لێهەڵگرێ.

هەر ئەو جۆرەی کە چووکتر خۆ لە ژێر دەستی گەورەتر دەنێ هەتا لەزەت لە دەسەڵات بە سەر چووکترین دا بچێژێ، هەر ئەو جۆرەش گەورە خۆ دەسپێرێ و لە سەر دەسەڵات ژیانی دەخاتە مەترسییەوە.

خۆسپێری گەورەش هەمان لێقەومان و لە مەترسی کەوتن و تاس هەڵخستنی



ئەو لە سەر مەرگە.

لەو شوێنەی کە فیداکاری و خزمەت و نیگاکانی ئەویندارانە هەیە ویستی سەرۆکایەتیش هەیە. بێهێزتر، بە ڕێگا نهێنییەکانی نێو قەڵا دا هەتا ئەندروونی دڵی دەسەڵاتدار دەخزێ و ـ دەسەڵات دەڕفێنێ.

ژیان خۆی ئەم ڕازەی بە من گوت: ئەو گوتی:، «بڕوانە! من ئەوەم **کە دەبێ هەردەم بە سەر خۆی دا زاڵ بێ**.

بێشک، تۆ ئەمە بە ویستی زاوزێ دادەنێی یان هانەیەک بەرەو ئامانجێک، بۆ سەرووتر، دوورتر، جۆراوجۆرتر: بەڵام ئەوانە گشتی هەر یەک و یەک ڕازن.

فەوتان بۆ من باشترە لەوەی کە چاوپۆشی لەم یەکانە بکەم؛ بە ڕاستی، لەو شوێنەی کە فەوتان و خەزەڵوەران هەیە، بڕوانە، لەوێ ژیان بۆ خاتری دەسەڵات خۆی بەخت دەکا!

من دەبێ خەبات و بوون و ئامانج و دژایەتی ئامانجەکان بم. ئاخ، ئەوەی کە پەی بە ویستم بەرێ، زۆرباش دەزانێ کە ئەو دەبێ چ ڕێگاگەلێکی پێچاوپێچ ببڕێ.

هەر شتێک کە بافرێنم و هەر چەند خۆشم بوێ ـ زۆر زوو دەبێ ببمە دوژمنی ئەو و خۆشەویستی خۆم: ویستم وەهای دەوێ.

تۆش، ئەی پیاوی هەڵسەنگێنەر، تەنیا ڕێبازێکی بۆ ویستی من و شوێن پێیەکی ئەو: بە ڕاستی، ویستی دەسەڵاتی من بە پێیەکانی ویستی ڕاستەقینەی تۆ هەنگاو هەڵدێنێتەوە.

ئەوەی پەیڤی «ویستی بوون»ی هاویشت نیشانەی ڕاستەقینەی نەنگاوت: وەها ویستێک ـ هەر نیە.

چونکە ئەوەی کە هەیە، ویست نایەوێ: بەڵام ئەوەی کە بوون هەیەتی، چلۆن دیسان بوون دەیەوێ هەیبێ؟

تەنیا لەو شوێنەی کە ژیان هەیە ویستیش هەیە: بەڵام نە ویستی ژیان بەڵکە ویستی دەسەڵات ـ من تۆ ئاوا فێر دەکەم!

لای زیندوو گەلێک شت لە خودی ژیان بە بایەخترە؛ بەڵام لە ئەندەروونی بایەخدانەرییەوە، ویستی دەسەڵاتە کە قسە دەکا!

ژیان رۆژێکی وەهای فێر کردم: و من بەو، پەردەکی دڵەکانی ئێوە، ئێوە فرەزانترین خەڵک، دەکەمەوە.

بە راستی، بە ئێوە دەڵێم: چاکە و خراپەی هەمیشەیی لە ئارا دا نیە! ئەوان لە دەروونی خۆیان دا دەبێ هەردەم بە سەر خۆیان دا زاڵ بن.

ئێوە بە بایەخەکان و پەیڤەکانتانەوە لەمەڕ چاکە و خراپە، دەستەڵاتتان بە تاقی دەکەنەوە، ئێوە بایەخدانەران؛ ئەمەیە ئەوینی شاراوەی ئێوە و درەوشانەوە و لەرانەوە و پڕایی رەوانەکانی ئێوە.

بەڵام لە ناخی بایەخەکانی ئێوە دەستەڵاتێکی بەهێزتر و زاڵ بوونێکی نوێ سەر هەڵدەدا و هێلکە و توێکڵی هێلکە دەشکێنێ.

ئەوەی کە دەبێ ئافرێنەری چاکە و خراپە بێ: بە راستی، لە پێشدا دەبێ فەوتێنەر و شکێنەری بایەخەکان بێ.

سەرووترین خراپە وەها بە سەرووترین چاکە بەستراوەتەوە: بەڵام، ئافرێنەریی، خۆی هەر ئەمەیە.

ئەی فرەزانترین خەڵک، بێڵن لەم بارەوە **بدوێین**، هەر چەند کە خراپیش بێ، بێدەنگی خرابترە؛ ئەو راستەقینانەی کە دەرنەبڕدرێن، ژاردار دەبن.

بلا بشکێ تەواوی ئەو شتانەی کە لە ئاست راستەقینەکانی ئێمە دا شیاوی شکانە! هێشتا گەلێک خانوو هەن کە دەبێ ساز بکرێن!

وەها گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە پایەبەرزان

بنی دەریاکەم ئارامە؛ کێ دەتوانێ بە بیری دابێ کە درنجگەلێکی جەفەنگبازی لە خۆ دا شاردۆتەوە!

قووڵاییم مەندە: بەڵام لەبەر پەردەکە مەلەوەرەکان و پێکەنینەکان دەدرەوشێتەوە.

ئەمرۆ پیاوێکی پایەبەرزم دیت، پیاوێکی بە شکۆ، پیاوێک بە گیانێکی تۆبەکارەوە. ئای کە رەوانم چەندە بە درێوی ئەو پێکەنی!



پیاوی پایەبەرز، بە سینگێکی هەڵمساو، وەک کەسێک کە پشووی لە سینگی دا راگرتبێ، بێدەنگ لەوێ وەستا:

خەمڵاو بە راستەقینە درێوەکان، نێچیرەکەی، و پۆشتە بە جل و بەرگی شڕ، و هەروەتر کۆگایەک دڕکی پێهەڵواسراوە ـ بەڵام چ گوڵێکم پێوە نەدیت.

ئەو هێشتا پێکەنین و جوانی فێر نەبوە. ئەم راوکەرە لە لێڕەواری زانست، دڵ تاریک گەڕاوەتەوە:

ئەو لە شەڕی گیاندارە دڕندەکان بۆ ماڵ گەڕاوەتەوە: بەڵام هێشتا لە دەروونی شکۆی ئەو دا گیاندارێکی دڕ دەڕوانێتە دەرەوە ـ گیاندارێکی بە سەر دا زاڵ نەبوو!

ئەو هێشتا هەر وەک پڵنگێک کە تەمای خۆ پێدادانی هەبێ، لەوێ رادەوەستێ؛ بەڵام من ئەم رەوانە خۆ لەبەریەک کێشراوانەم خۆش ناوێن؛ ئەم خۆ پێدادەرانە دەگەڵ زەوقی من یەک ناگرنەوە.

هاوڕێیان، بە من دەڵێن کە لە سەر زەوق و پەسند ناکرێ کێشەی بکەی؟ بەڵام ژیان سەراسەر کێشەیەکە لە سەر زەوق و پەسند!

زەوق: هەم کێش و هەم قاپی تەرازوو و هەمیش تەرازوویە؛ ئامان لە گشت زیندەوەران کە دەیانەوێ بێ کێشە، بەبێ کێش و قاپی تەرازوو و تەرازوو بژین!

ئەگەر ئەم پیاوە پایەبەرزە لە پایەبەرزی خۆی وە زاڵە بێ، ئەودەم جوانییەکەی وەدیار دەکەوێ ـ و ئەودەم دەمەوێ بیچێژم و پێم بە تام بێ.

ئەو هەر کاتێک روو لە خۆی وەرگێڕێ، بە سەر سێبەری خۆی دا باز دەدا ـ و بە راستی، بۆ نێو هەتاوەکەی خۆی.

ئەو درێژماوەیەکە لە ژێر سێبەر دانیشتوە و رەنگ لە کوڵمەکانی ئەم گیانە تۆبەکارە، پەڕیوە و لە چاوەڕوانیەکانی گەلێک برسی بوە.

لە چاوەکانی دا هێشتا بە سووک دانان هەیە؛ و لە زاری دا بێزێک شاراوەیە. ئەو نووکە بە دڵنیایی دەحەسێتەوە، بەڵام حەسانەوەکەی هێشتا لەبەر هەتاو درێژ نەبوە.

کرداری ئەو دەبێ وەک گا بێ؛ و بەختیاری دەبێ بۆنی زەوی بدا، نە بۆنی بە سووک دانانی زەوی.

پێمخۆشە ئەو وەک گایەکی سپی ببینم کە بە بۆڕەبۆڕ لە پێشەوەی نیروئاموور دەڕوا: و بۆڕەکەی دەبێ هەرچییەک کە زەوینی بێ، ڕێزی لێبنێ!

سیمای هێشتا تارە و سێبەری دەستەکانی لە سەر دەجووڵێتەوە. لە سەر هەستی بینینیشی هێشتا سێبەرێک هەیە.

کردەوەی هێشتا سێبەرێکە لە سەر ئەو. دەستی سێبەر دەخاتە سەر ئاکاری. ئەو هێشتا بە سەر کردەوەی خۆی دا زاڵ نەبوە.

هەر چەند کە من لەو دا ئەستۆی گام خۆش دەوێ: بەڵام نووکە دەمەوێ کە چاوەکانی فریشتەش لەو دا ببینم.

ئەو دەبێ ورەی قارەمانانەی خۆشی لەبیر بەرێتەوە: ئەو دەبێ نەک هەر پیاوێکی پایەبەرز بەڵکە دەبێ بووبێتە پیاوێکی بەرز، فەزا دەبێ ئەو بەرز کاتەوە، ئەم بێورەیە!

ئەو دێوەکانی لە بەند کردوە و گرێی پەردەکەکانی رەها کردوە: بەڵام هێشتا پێویستە بەند لە دێو و پەردەکەکانی خۆی بکاتەوە و ئەوان وەک منداڵە ئاسمانیەکان لێبکا.

زانستی ئەو هێشتا فێرە بزە و بێئێرەیی بوون نەبوە؛ تاسەی بە کوڵی هێشتا لە جوانی دا ئۆقرەی نەگرتوە.

بە راستی، تامەزرۆیی نابێ لە تێری دا، بەڵکە دەبێ لە جوانی دا بکووژێتەوە و دامرکێ! شایەن بوون لە خوو و خدەکانی مەزنایەتی مەزن بڕوایانە.

قارەمان لە کاتی حەسانەوە دا دەبێ دەست لە بان سەری دابنێ و بەمجۆرە دەبێ بە سەر حەسانەوەی خۆی دا زاڵ بێ.

بەڵام دروست بۆ قارەمانە کە دەست ڕاگەیشتن بە جوانی، دژوارترین کارە. «جوان» بۆ ورە پتەوەکان وەچنگ نەکەوتوویە.

هەندێک زۆر، هەندێک کەم: دروست ئالێرەیە کە کەم زۆرە، ئالێرەیە کە کەم پترینە.

وەستان بە ماسوولکەی شل و ورەی بێلغاو، بۆ گشت ئێوە دژوارترین کارە، بۆ ئێوە پایەبەرزان!



کاتێک دەستەڵات دڵاوا بێ و لە سەر هەرچییەک کە ئاشکرایە، دابەزێ: من وەها دابەزینێک بە جوانی دادەنێم.

لە هیچکەس وەها جوانییەک داوا ناکەم لە تۆ نەبێ، ئەی دەستەڵاتدار: بڵا جوامێریت دوایین سەرکەوتنی تۆ بە سەر خۆت دابێ:

باوەڕ دەکەم کە بۆ گشت خراپەیەک توانای: هەر لەبەر ئەوەشە کە داوای چاکە لە تۆ دەکەم.

بە راستی، گەلێک بەو بێهێزانەی کە خۆیان بە باش دەزانن پێکەنیوم، چونکە چنگەکانیان کولە!

دەبێ داخوازی ئاکارباشی ئەستوون بی کە هەر چی پتر دەچێتە سەر، جوانتر و ڕێکتر دەبێ، بەڵام لە دەروون دا سەختتر و پتەوتر.

ئادی، ئەی پیاوی پایەبەرز، تۆش دەبێ ڕۆژێک جوان بی و لە بەرابەر جوانیت دا ئاوێنەیەک دابنێی.

ئەوەدەم ڕەوانت لە داواکانی خوداییی وەلەرزە دەکەوێ؛ ئەودەم تەنانەت لەخۆباییی بوونیشت بۆ خۆی دەبێتە عیبادەتێک.

چونکە ئەوەیە رازی ڕەوان: ئەودەم کە قارەمان جێ دەهێڵێ؛ بەرزەقارەمان لە خەونی دا لێی نزیک دەبێتەوە.

وەها گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە وڵاتی فەرهەنگ

گەلێک دوور بۆ نێو داهاتوو هەڵفڕیم؛ لەرزێک منی داگرت و کاتێک ڕوانیمە دەوروبەرم، تەنیا کات هاوکاتم بوو.

ئەوسا بۆ دواوە، بەرەو ماڵ ڕامکردەوە ـ بە پەلەیەکی هەردەم زێتر: لە دوایی بۆ لای ئێوە هاتم، ئێوە خەڵکێکی ئێستایی و بۆ وڵاتی فەرهەنگ.

بۆ یەکەم جار بۆ دیتنی ئێوە دەگەڵ خۆم چاوێک و داوایەکی باشم هێنا؛ بە راستی، بە دڵێکی پڕ لە تاسەوە هاتم.

بەڵام چیم بە سەرهات؟ من سەرەڕای پەشێوییم ـ دەبا پێکەنیبام: چاوم قەت

شتێکی وەها ڕەنگاوڕەنگی نەدیبوو!

هەر لەو کاتە دا کە پێ و دڵم دەلەرزین، پێکەنیم و پێکەنیم: گوتم «ئائێرەیە خمخانەی گشت ڕەنگەکان!»

ئێوە، بە پەنجا پەڵە ڕەنگەوە، کە لە ڕوخسار و دەست و پەلتان هەڵسووبوو، لەوێ دانیشتبوون و منتان حەیران کردبوو، ئێوە خەڵکی ئێستایی!

و پەنجا ئاوێنەی دەوروبەرتان، ڕەنگدەرەوە و پەسنکەری یاری ـ ڕەنگی ئێوە!

بە ڕاستی، ئێوە لە ڕوخساری خۆتان باشتر کوا دەتانتوانی دەمامکێک لە سیماتان بدەن، ئێوە خەڵکی ئێستایی! کێ دەیتوانی ئێوە بناسێتەوە!

سەرتاپێتان نووسراو بە نیشانەکانی ڕابوردوو و لە سەر ئەو نیشانانە، نیشانەگەلێکی تازە نەخش کرابوون: ئێوە بەمجۆرە خۆتان لە نیشانەناسان شاردۆتەوە!

ئەگەر کەسێک تاقیکەرەوەی گورچووش بێ، کەی باوەڕ دەکا کە ئێوە گورچیلەیەکتان هەیە! دەڵێی ئێوەیان لە ڕەنگ و کوتەکاغەزان ساز کردوە!

گشت سەردەم و گەلەکان لە دەروونی پەچەکانی ئێوەوە بە ڕەنگە جۆراوجۆرەکانەوە دەڕواننە دەرەوە؛ تەواوی خوو و خدە و ئیمانەکان بە ڕەنگە جۆراوجۆرەکانەوە لە دەروونی ئاماژەکانی ئێوەوە وە قسە دێن.

هەر کەس کە پەچە و رووپۆش و ڕەنگ و ئاماژەکانتان لێداکەنێ، شتێک دێڵێتەوە بۆ تاراندنی باڵندەکان.

بە ڕاستی، من ئەو مەلە تاراوەم کە جارێک ئێوەم بە رووتی و بە بێ ڕەنگ دیوە و کاتێک ئیسکلێت خۆشەویستی خۆی پێڕاگەیاندم، فڕیم.

پێم خۆشترە مووچەخۆرێکی دونیای ڕووحەکان و سێبەرە تێپەڕبووەکان بم! ـ تەنانەت دانیشتوانی دونیای ڕووحەکان لە ئێوە قەڵەوتر و بەخۆوەترن!

داخی گرانم لەوەیە، ئادی، لەوەیە کە نە بە ڕووتی دەگەڵ ئێوە هەڵدەکەم نە بە داپۆشراوی، ئێوە خەڵکی ئێستایی!

تەواوی سامی داهاتوو و گشت ئەو شتانەی کە مەلە تاراوەکان وەلەرزە دەخا، بە ڕاستی، لە «ڕاستی» ئێوە نزیکتر و دۆستانەترە.



چونکە ئێوە ئاوا دەڵێن: «ئێمە بە تەواوەتی لاگری ڕاستین، بێئیمان و بێبڕوا»: ئاوا سینگتان دەکەنەوە ـ ئاخ، تەنانەت بێ ئەوەی کە ئێوە سینگتان هەبێ!

ئادی، ئێوە چلۆن دەتوانن ئیمانتان هەبێ، ئێوە خەڵکی ڕەنگاوڕەنگ! ئێوە کە خۆتان نەخشگەلێک بوون لەوەی کە تاکوو ئێستا ئیمانتان پێیەبوە!

ئێوە خۆتان وێنەی زەق و زیندووی ڕەدی ئیمان و دەست و پێ شکاویی هەر بڕوایەکن: ئیمان نەهێنراو: من ئێوە ئاوا ناو دەبەم، ئێوە خەڵکی لاگری ڕاستی!

تەواوی سەردەمەکان لە گیانی ئێوە دا بە دژی یەکدی دەمەقاڵەی دەکەن و خەون و خەیاڵ و دەمەقاڵەکانی هەموو سەردەمەکان لە بە ئاگایی ئێوە ڕاستەقینەتر بوە!

ئێوە ئەستێورن: هەر لەبەر ئەوەشە کە بێئیمانن. بەڵام ئەوەی کە دەبێ بافرێنێ، هەمیشە خەونە ڕاستوێژەکانی خۆی ونیشانەی هەسێرەکانی خۆی هەبوە ـ و ئیمانی بە ئیمان هەبوە.

ئێوە دەروازەیەکی نیوە کراوەن کە لەبەر ئاستانەکەی گۆڕهەڵکەنەکان چاوەڕوانن. و ئەمەیە ڕاستەقینەی **ئێوە**: «هەموو شت شیاوەی ئەوەیە کە بفەوتێندرێ.»

ئاخ، چلۆن لە ئاستم وەستاون، چەندە پەراسوو ـ لاواز، ئێوە ئەستێورەکان! و هەڵبەت هەندێک لە ئێوە شاهیدی ئەمە بوون.

ئەو گوتی: «لەوانەیە ئەودەم کە خەوتبووم، خودایەک بە نهێنی شتێکی لێ ڕفاندووم؟ بە ڕاستی، شتێکی شیاو بۆ ئەوە کە خۆی ژنێکی لێ ساز بکا!

«هەژاریی پەراسووکانم جێی سەرسوڕمانە!» گەلێک لە خەڵکی ئێستایی وەهایان گوتوە.

ئادی، ئێوە لای من جێی پێکەنینن، ئێوە خەڵکی ئێستایی! بە تایبەت ئەودەم کە خۆتان پێ سەیرە!

هاوار بە من ئەگەر نەمتوانیبا بە سەرسوڕماویتان پێکەنیبام، و دەبا ئەوەی کە ناخۆشە لە جامەکانتانم خواردبا!

بەڵام من کاری ئێوە سووکتر دەکەم، لەبەر ئەوە کە شتێکی قورسم بۆ بردن پێیە. چ قەیدی گەر قالۆچە و کرمی باڵداریش لە سەر کۆڵەبارم بنیشن.

بە راستی، بارەکەم قورستر نابێ! و زۆر ماندوو بوونی من لەبەر ئێوە نابێ، ئێوە خەڵکی ئێستایی!

ئاخ، بە تاسەی خۆمەوە نووکە دەبێ بەرەو کوێ بېمەوە؟ لە بەرزایی گشت کێوەکانەوە بە شوێن وڵاتی دایکی و باوکیم دا دەروانم.

بەڵام لە هیچ کوێ نیشتمانێکم نەدیتۆتەوە. لە هەموو شارەکان لانەوازم و بە هەموو دەروازەیەک دا تێپەڕ.

خەڵکی ئێستایی، کە هەتا ماوەیەک لەمەوبەر دڵم منی بۆ لای ئەوان رادەکێشا، دەگەڵ من بێگانەن و لای من پێکەنینی؛ و من لە وڵاتەکانی باوکی و دایکیم دەرکراوم.

لەبەر ئەوە، نووکە تەنیا **نیشتمانی منداڵەکانم** خۆش دەوێ، ئەو وڵاتە کە نادۆزرێتەوە و لە دوورترین دەریاکان هەڵکەوتوە: بە باسپێرەکانم دەڵێم کە لێیبگەرێن و لێیبگەڕێن.

لە منداڵەکانم دا دەمەوێ قەرەبووی ئەوە بکەمەوە کە منداڵی باوکەکانم بووم: و لە تەواوی داهاتوو دا قەرەبووی ـ ئەم ئێستایە!

وەهای گوت زەردەشت.

### سەبارەت بە زانستی بێخەوش

دوێنی کە مانگ هەڵات، پێموابوو کە هەتاوێک دەزێنێ: ئەو وەها پان و ئاوس لە ئاسۆ دا هەڵکەوتبوو.

بەڵام ئەو بە ئاوسییەکەی درۆی دەگەڵ من دەکرد و من پیاو بوونی پتر باوەڕ دەکەم هەتا ژن بوونی.

بێشک، ئەم شەرمنە شەونخوونە ئەوەندەش پیاو نیە. بە راستی، ئەو لە سەر بانەکان بە ویژدانێکی نائاسوودەوە دەگەڕێ.

چونکە راهبی مانگ بە تەماح و دڵپیسە. تەماحی لە زەوی و لە گشت شادی ئەویندارەکانە!

نا ئەوم خۆش ناوێ، ئەم گورپەیەی سەربانەکان! لەوانەی کە بە ماتەمات بە



پەنا پەنجەرە نیوەداخراوەکان دا تێدەپەڕن، بێزارم!

ئەو زاهیدانە و بێدەنگ بە سەر رایەخی هەسێرەکان دا هەنگاو هەڵدێنێتەوە ـ بەڵام من ترپەی نەرمی هەنگاوەکانی پیاوێکم خۆش ناوێ کە زرینگەی مامزەی لێ بەرز نەبێتەوە.

هەنگاوە راستکارەکان، قسە دەکەن؛ بەڵام گورپە بە دزەدزە بە سەر زەوی دا دەڕوا. بڕوانە، مانگ گورپەئاسا و ناڕاستکارانە هەڵدێ. ـ

ئەم کینایە بۆ ئێوە دەهێنمەوە، ئێوە ریاکارە هەستیارەکان، ئێوە «خاوەن زانستە پاکەکان»! من ئێوە بە **تەماحکار** ناو دەبەم!

ئێوەش زەوی و ئەوەی کە زەوینییە خۆشتان دەوێ: من ئێوەم باش ناسیوە! ـ بەڵام لە ئەوینتان دا شەرم و نەحەساوەیی ویژدان هەیە. ئێوە مینای مانگن.

گیانی ئێوەیان رازی کردوە کە ئەوەی کە زەوینییە بە سووکی دابنێن، بەڵام هەناوی خۆتان نا: ئادی، هەناوی ئێوە بەهێزترین بەشی ئێوەیە!

نووکە گیانتان شەرمەزارە لەوەی کە دەبێ مل بۆ ویستی هەناو کەچ بکا و بۆ راکردن لە شەرمی خۆ بە رێگا دزانە و شاراوەکان دا دەڕوا.

گیانی درۆزنی ئێوە وەها بە خۆی دەڵێ: «بەرزترین شت لای من ئەوەیە کە ژیان بەبێ هەوەس ببینم، نەک وەک سەگێکی زمان دەرکێشراو.

لە روانین بەختەوەر بم، بە ویستێکی فەوتاو، بێ گێر و کێشە و تەماحی خۆخوازی، بە لەشێکی ساردی وەک خۆڵەمێش، بەڵام بە چاوە مەستەکانی مانگ!

خۆشەویستترین شت لای من خۆش ویستنی زەوییە، هەر ئەو جۆرەی کە مانگ خۆشی دەوێ و، لەمس کردنی جوانی ئەو تەنیا بە هۆی چاو.» ـ فریودراو وەها خۆی فریو دەدا.

زانستی بێخەوشی هەموو شتێک لای من ئەوەیە کە لە شتەکان هیچم نەوێ، جگە لەوە کە بێڵن وەک ئاوێنەیەکی سەد چاو لە بەرابەریان راگیرێم.»

ئاخ، ئەی ریاکارە هەستیارەکان، ئەی تەماحکارەکان! ئێوە بێتاوانی تاسەتان کەمە: لەبەر ئەوە نووکە لە تاسەدار بوون بە خراپە دەدوێن!

بە راستی، ئێوە زەویتان وەک ئافرێنەران، زاوزێکەران و شادخوازان و

ئەوانەی کە حەز لە بوون دەکەن، خۆش ناوێ!

بێتاوانی لە کوێیە؟ لەوجێیە کە ویستی زاوزێ کردن هەیە. لای من پاکترین ویست هی ئەو کەسەیە کە دەیەوێ بەرزتر و سەرتر لە خۆی بافرێنێ.

جوانی لە کوێیە؟ لەوێ کە دەبێ بە تەواوەتی ویستم بمەوێ؛ لەوێ کە ئەویندار بوون و فەنام بوێ، هەتا ئەوەی کە لە سەرم دایە تەنیا لە سەر دا نەمێنێتەوە.

ئەوین و فەنا: ئەم دوانە لە ئەزەلەوە هاوشان بوون. ویستی ئەوین یانی ویستی مەرگ ـ بە ئێوە ترسەنۆکەکان وەها دەڵێم!

بەڵام نووکە چاوی خێلی یەختەکراوی ئێوە دەیەوێ بە «تێرامان» ناوی ببردرێ و ئەوەی کە بە چاوە ترسەنۆکەکان ئیزنی لەمس کردنی خۆ بدا، بە ناوی «جوانی» ناودێر دەکرێ! ئاخ، ئەی چەپەڵکەرانی ناوە نەجیبەکان!

بەڵام ئەم تووکەم رووی لە ئێوەیە، ئێوە بێخەوشەکان، ئێوە خاوەن زانستە پاکەکان: ئێوە هەرچەند پان و ئاوس لە ئاسۆ دا خۆ بنوێنن، هیچ لە ئێوە نازێ!

بە راستی، زار لە وشەگەلی نەجیب پڕ دەکەن: و ئێمە دەبێ باوەڕ بێنین کە دڵەکانی ئێوە، ئێوە درۆزنەکان لێورێژە؟

بەڵام وشەکانی **من** ورد و سووک و خواروخێچن: خۆشحاڵم کە ورکەخۆری خوانی ئێوەم.

بەڵام سەرەڕای ئەوانە دەتوانم راستیش بە ریاکاران بڵێم! ئادی، دڕووی ماسیەکان، گوێماسیەکان، و دڕک و داڵەکانم لووتی ریاکاران وەخوروو دەخەن!

هەوای دەوروبەری ئێوە و خوانەکانتان هەمیشە بۆگەنە: بیرە هەوەسپەرستەکان، درۆکان و رازەکانی ئێوە لە هەوا دا بڵاوە!

بوێرن و ئیمانتان بە خۆتان هەبێ ـ بە خۆتان و هەناوی خۆتان! ئەوەی کە ئیمانی بە خۆ نیە هەمیشە درۆ دەکا.

ئێوە «پاکان» دەمامکی خوداییتان لە روخسار داوە: کرمی دڵ دەخێڵەوە چوونتان خزاوەتە نێو دەمامکی خوداییەوە.

بە راستی، ئێوە فریودەرن، ئێوە «لاگری تێرامان»! زەردەشتیش رۆژگارێک شێتی رواڵەتی خودایانەی ئێوە بوو و پێیوانەبوو کە پاپووکەی مارێک ئەوی



ئاخنیوە.

رۆژگارێک پێمواببوو کە لە کایەی ئێوە دا، ئێوە خاوەن زانستە پاکەکان، رەوانی خودایی بە دەورگێڕ دەبینم! رۆژگارێک پێمواببوو هونەرێک لە هونەرەکانی ئێوە سەرتر نیە!

دوور بوون، چەپەڵی مار و بۆگەنیوی لە من دەشاردەوە، هەروەتر مەکری مارمێلکەیەک کە بە تەماحەوە لە دەوروبەرم دەخولاوە.

بەڵام لێتان **نزیک** بوومەوە: ئەودەم رۆژم بە سەر داهات ـ و نووکە بە سەر ئێوە دادێ: ژوانی مانگ تەواو بوە!

ئەها، بڕوانن! لەوێ وەستاوە، رەنگ بزڕکاو و حەپەساو لە ئاست کازیوە!

چونکە هەر ئێستا ئەو پڕشۆقە دێتە دەر ـ ئەوینی بە زەوی دادێ! ئەوینی هەتاو تەواوەتی بێتاوانی و تاسەی ئافرێنەرییە!

ئەها، بڕوانن، چ نائارام بە سەر دەریا دا دێ! تینوایەتی و هەناسەی داغی ئەوینی هەست پێناکەن؟

دەیەوێ دەریا هەڵمژێ و قووڵایی ئەو هەڵکێشێ و لە بەرزایی بیخواتەوە: تاسەی دەریا بە هەزاران مەمکەوە خۆ هەڵدەکێشێ.

ئەو دەیەوێ تینوایەتی هەتاو، رایمووسێ و هەڵیمژێ؛ ئەو دەیەوێ ببێتە هەوا و بەرزی و رێبازی نوور و خودی نوور!

بە راستی، من چەشنی هەتاو ئەویینداری ژیان و گشت دەریا قووڵەکانم.

**زانست لای من** ئەوەیە: ئەوەی کە قووڵە دەبێ ـ هەتا بەرزایی من سەرکەوێ.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە زانایان

هەروا کە خەوتبووم، مەڕێک تاجەگوڵەکەی سەری خواردم ـ خواردی و گوتی: «زەردەشت ئیدی زانا نیە.»

ئەوەی گوت و بە فیزەوە سەری بەرز کردەوە و دوور بۆوە. منداڵێک ئەوەی بۆ گێڕامەوە.

پێم خۆشە لێرە کە منداڵەکان یاری دەکەن بخەوم، لە بن دیواری رماو، لە نێوان دڕک و داڵ و خاشخاشکەسوورەکان.

منداڵەکان هێشتاش من بە زانا دادەنێن: دڕک و داڵ و خاشخاشکە سوورەکانیش. ئەوان بێگوناهن ـ تەنانەت ئەودەم کە بەدفەڕن.

بەڵام بۆ مەڕەکان ئیدی من زانا نیم: چارەنووسم وەهای دەوێ ـ ئافەرین بۆ چارەنووسم!

چونکە راستییەکەی ئەوەیە کە من لە ماڵی زاناکان هاتوومە دەر و لە پشت سەریشم دەرگام توند پێک داداوە.

رەوانم درێژماوەیەک برسی لە سەر خوانی ئەوان دانیشت. من، بە پێچەوانەی ئەوان، فێر نەبووم کە زانیاری کارێکە هەر وەک فندق شکاندن.

من ئەویندارى ئازادی و هەوای سەر خاکی تازەم؛ خەوتن لە سەر کەوڵی گام پێخۆشترە هەتا خەوتن لە سەر پلە و پایەی ئەوان.

من بە بیر و باوەڕی خۆم وەها داغ بووم و سووتاوم کە گەلێک جار پشووم بە دژواری دێتە دەر. لەم کاتە دا دەبێ پەنا بۆ هەوای ئازاد بەرم، بە دوور لە هەموو وەتاغە تۆزاوییەکن.

بەڵام ئەوان بە ساردی لە بەر سێبەرە ساردەکان دادەنیشن؛ لە گشت کارەکان دا دەیانەوێ کە تەنیا تەماشاچی بن و لە دانیشتن لە سەر ئەو پلیکانانەی کە هەتاوی بە تین لێیداون، خۆ دەپارێزن.

ئەوان، وەک ئەو کەسانەی کە لە شەقام دەوەستن و واق وڕماو چاو لە رێبواران دەبڕن، چاوەڕێن و واق وڕماو چاویان لەوەی بڕیوە کە ئیدیکە بیریان لێکردۆتەوە.

ئەگەر دەستیان لێدەی، هەر وەک تەلیسە ئاردەکان، بێ ئەوەی کە خۆیان بیانەوێ، تۆز دەپژێننە دەوروبەری خۆیان؛ بەڵام کێ پێیوادەبێ کە تۆزکەیان لە خرمانی گەنم و شادی زێڕنی مەزراکانی هاوین هەستاوە!

ئەودەم کە خۆ بە فرەزان نیشان دەدەن، وتەکان و راستەقینە بچووکەکانیشیان بێزم هەڵدەستێنن: فرەزانییان وەها بۆگەنە کە دەڵێی لە گەنداو هاتۆتە دەر. و بە راستی قیڕەی بۆقیشم لەم گەنداوانە بە گوێ گەیشتوە!



کارامەن و ئەنگوستی لێڕاهاتوویان هەیە: ساویلکەیی من لە کوێ، پێچ و پەنای ئەوان لە کوێ! ئەنگوستەکانیان رستن و گرێ لێدان و چنین باش دەزانن: بەمجۆرە گۆرواکانی گیان دەچنن!

سەعاتگەلێکی باشن: تەنیا دەبێ دروست قورمیشیان بکەی! ئەودەم سەعات بە دروستی نیشان دەدەن و کەمووچکە دەنگێکیشیان هەیە.

وەک دینگ و بەرداش ئیش دەکەن. تەنیا گەنمەکەت دەوان کە! ـ ئەوان دەزانن کە چلۆن گەنم بهاڕن و تۆزێکی سپی لێ ساز کەن.

زۆر باش ئاگایان لە یەکدییە و بڕوایەکی ئەوتۆیان بە یەکدی نییە. بە لێهاتووییەک کە لە وردە زیرەکی دا هەیانە، چاوەڕوانی کەسانێک دەکەن کە پێی زانستیان شەلە: وەک جاڵجاڵۆکە چاوەڕێن.

هەمیشە دیومە کە بە پارێزەوە ژار ساز دەکەن: و هەمیشە بۆ ئەم کارە دەستەوانەی شووشەیی دە دەست دەکەن.

یاری کردن بە تاسی قەڵبیش دەزانن و ئەوانەم گەلێک جار شەلاڵی ئارەق خەریکی یاری دیون.

ئێمە دەگەڵ یەک بێگانەین و ئاکارباشیەکانی ئەوان تەنانەت لە فێڵ و تەڵەکە و تاسە قەڵبەکانیشیان دا دەگەڵ چێژی زاری من یەک ناگرنەوە.

ئەودەم کە دەگەڵیان دەژیام، لە سەرووی ئەوان دەژیام. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە دەگەڵ من بوونە دوژمن.

ئەوان نایانەوێ شتێک لەم بارەوە ببیسن کە کەسێک لە بان سەریان هەنگاو هەڵدێنێتەوە و هەر بۆیەش لە نێوان من و سەری خۆیان دارەڕا و گڵ و پووش و پەلاشیان داناوە.

ئاوا ترپەی هەنگاوەکانیان خنکاندم: و هەتا ئێستا کەسانی هەرە زانایان لە هەموان کەمتر گوێی داوەتە من.

هەموو تاوان و بێهێزییەکانی مرۆڤیان لە نێوان خۆیان و من داناوە ـ ئەمە بە «کاریتەی» ماڵەکانی خۆیان ناو دەبەن.

بەڵام سەرەڕای ئەوانە، من بە بڕواکانم لە بان سەریان هەنگاو هەڵدێنمەوە، و تەنانەت ئەگەر ویستبام لە سەر هەڵەکانی خۆشم هەنگاو هەڵێنمەوە، دیسان لە

سەرووی ئەوان و سەرەکانیان دەبووم.

چونکە مرۆڤەکان بەرابەر **نین**: عەداڵەت وەها دەڵێ. و **ئەوان** هەقیان نیە هەر ئەوەیان بوێ کە من دەمەوێ!

وەهای گوت زەردەشت .

## سەبارەت بە شاعیرەکان

زەردەشت بە یەکێک لە مریدەکانی گوت: «لەو دەمەوە کە لەشم باشتر ناسیوە، لە روانگەی منەوە گیان تەنیا تا رادەیەک گیان بوە؛ و هەر چییەک «نەمر» یشە جگە لە مەجاز نەبوە.»

مرید وڵامی داوە: «ئەوەم پێشتریش لێبیستووی و ئەودەم لێت زیاد کرد کە: بەڵام شاعیرەکان گەلێک درۆ دەکەن. بۆچی گوتت کە شاعیرەکان گەلێک درۆ دەکەن؟»

زەردەشت گوتی: بۆچی؟ دەپرسی بۆچی؟ من لەوانە نیم کە لە سەر «بۆچی» ئەوان دەمەقاڵەی بکەم.

مەگەر ئەزموونی من لە دوێنێوە دەستی پێکردوە؟ درێژماوەیەکە کە من ئەزموونی هۆیەکانی بیر و رایەکانی خۆم کردوە.

ئەگەر بەڵێن با کە هۆیەکانی خۆم پێبا، ئایا نووکە نەدەبوو کە من هەنبانەیەک لە بیرەوەرییەکانم بام.

نووکە راگرتنی بیر و باوەڕەکانیشم لا دژوارە: و گەلێک مەلم لێهەڵفڕیون.

هەندێک جار لە کۆترخانەی خۆم گیاندارێکی سەرلێشێواو دەبینم کە دەگەڵ من بێگانەیە و کاتێک دەستی لێبدەم وەلەرزە دەکەوێ.

بە گشتی، زەردەشت رۆژێک چی پێگوتی؟ گوتی کە شاعیرەکان گەلێک درۆ دەکەن؟ ـ بەڵام زەردەشتیش شاعیرە.

نووکە ئیمانت هەیە کە ئەو راستی بە تۆ گوتبێ؟ بۆچی ئیمانت بەمەیە؟

مرید وڵامی داوە: «من ئیمانم بە زەردەشتە» بەڵام زەردەشت سەرێکی راوەشاند و بزەیەکی هاتێ و گوتی:



ئیمان من رازی ناکا، پتر لە هەموان، ئیمان بە من.

بەڵام ئەگەر کەسێک بە راشکاوییەکی تەواوەوە گوتبێی کە شاعیرەکان گەلێک درۆ دەکەن، راست دەکا: ئێمە گەلێک درۆ دەکەین.

هەروەتر، ئێمە زۆر کەم دەزانین و مامۆستایەکی خراپین: کەوایە ناچار دەبێ درۆ بکەین.

کام یەک لە ئێمە شاعیرەکان لە شەرابی خۆی دا فێڵی نەکردوە؟ چ ئاوێتەیەکی ژاردارمان لە ژێرخانەکانمان دا ساز کردوە و چ کارگەلێک کە جێی باس نیە لەوێ دا کردوومانە!

لەبەر ئەوە کە زۆر کەم دەزانین «رووح هەژاران»مان لە قووڵایی دڵەوە خۆش دەوێن، بە تایبەت ئەگەر ژنی جحێڵ بن.

تەنانەت بە داو و دڵەوە بە شوێن ئەو شتانەوەین کە پیرێژنەکان شەوانە بۆ یەکدی دەگێڕنەوە. ئەمە هەر ئەم شتەیە کە لە نێو خۆ دا بە ناوی «ژنایەتی ئەزەلی» خۆمانی دەناسین.

لەبەر ئەوە کە گۆیا زانایی دەرگایەکی نهێنی و تایبەتی هەیە کە لە سەر ئەوانەی کە شتێک فێر دەبن **داخراوە**: ئیمانمان بە خەڵک و «زانیارییان» هەیە.

بەڵام، شاعیرەکان هەموو لە سەر ئەم باوەڕەن کە هەر کات کەسێک لە سەر مێرگ یان بنارێکی چۆل درێژ بێ و گوێ هەڵخا لەو شتانەی کە لە نێوان زەوی و ئاسمان دایە شتێکی بۆ دەردەکەوێ.

ئەودەم کە هەستێکی ناسک بۆ لایان دێ، شاعیرەکان هەمیشە پێیان وایە کە سروشت خۆی گیرۆدەی ئەوان بوە ـ

و سروشت دەخزێتە پەنایان هەتا راز و نیازی ئەویندارانەیان دە گوێ دا بچرپێنێ ؛ لەبەر ئەوە لە ئاست هەموو خەڵک دا سینگ وە پێش دەدەن و خۆ هەڵدەکێشن.

ئاخ، گەلێک شت لە نێوان زەوی و ئاسمان دایە کە شاعیرەکان تەنیا کەمێکیان لە خەونیان دا بینیوە!

لە هەموان سەرتر، لە **بەرزایی** ئاسمانەکان: چونکە خوداکان گشتیان

مەجازەکانی شاعیرانە و فریوەکانی شاعیرانەن!

بە راستی، ئەم [مەجازانە] هەمیشە ئێمە بەرەو خۆی دەکێشێ ـ هەتا نزیک هەرێمی هەورەکان: و ئێمە داوەڵە ئاڵ و والاکانی خۆمان لە سەر هەورەکان دادەنێین و ناوی خودا و بەرزەمرۆڤیان پێدەدەین:

ئەوان بۆ دانیشتن لە سەر ئەم کورسیانە ئەوەند کە پێویستە، سووکن! ئەم خودایانە و هەموو ئەم بەرزەمرۆڤانە!

ئاخ، چ وەڕەزم لە هەموو ئەم ناتەواوانەی کە دەبێ بەبێ یەک و دوو، بوونیان بە کارەساتێکی گەورە دابندرێ! ئاخ، چ وەڕەزم لە شاعیران!

کاتێک زەردەشت وەهای گوت، مرید لێی تووڕە بوو، بەڵام دەنگی نەکرد. و زەردەشتیش بێدەنگ بوو و چاوەکانی، وەها کە گۆیا دەڕوانێتە دوورەدەستان، لە دەروونی ئەو بڕی. لە ئاکام ئاخێک و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

ئەودەم گوتی: من هی ئەمڕۆ و هی لەمەوبەرم. بەڵام شتێک لە من دایە کە هی سبەی و هی دووسبەی و هی لەمەوبەدوایە.

لە شاعیرەکان وەڕەزم، چ کۆن و چ نوێ؛ ئەوانە لە روانگەی منەوە تەسک و دەریاگەلێکی تەنکن.

بۆچوونەکانیان ئەوەند کە پێویستە لە قووڵایی رانەچوە: لەبەر ئەوە هەستەکانیان هەتا بنج و بناوانەکان نوقم نەبوە.

هەندێک هەوەس و هەندێک غەم: باشترین بیرەکانیان لەمە پتر نەبوە.

زرینگە زرینگی چەنگەکەیان لە گوێم دا لە قاوەقاوی تاپۆکان دەچن؛ ئەوانە لە سۆزی مۆسیقا چ دەزانن؟

ئەوان لای من هێندە پاکیش نین: هەموو ئاوەکانیان لێڵ دەکەن هەتا قووڵ بنوێنن.

پێیان خۆشە خۆیان بە ئاشتی کەرەوە نیشان بدەن؛ بەڵام لای من ئەوان دەلاڵ و تێکدەر و ناتەواو و ناپاکن!

ئاخ، تۆڕی خۆم لە دەریاکەیان هاویشت هەتا ماسی باش بگرم؛ بەڵام هەمیشە سەری خودایەکی کۆنەم دەرکێشاوە.



وەها، دەریا بەردێکی بە برسی بەخشی، لەوانەیە ئەوانیش خۆیان لە دەریا هاتبنە دەرەوە.

بەبێ شک، لە نێوانیان دا مرواریش هەڵدەکەوێ: لەبەر ئەوە ئەوان خۆیان پتر لە هەموو شتێک وە سەدەفی رەق دەچن و گەلێک جار لە جیات رەوان، لیچقاوێکی سوێرم تێدا دیتوون.

خۆخوازیش لە دەریا فێر بوون: مەگەر دەریا تاوسی تاوسەکان نیە؟

ئەو تەنانەت لە بەرابەر دزێوترین کەڵەکێویش دا چەتر دەنگاوێ و هیچکات لە باوەشێنی رازاوەی زێوین و هەوریشمی خۆی ماندوو نابێ.

کەڵەکێوی نیگایەکی بێتینی لێدەکا، بەڵام لە رەوانی دا لە زیخ نزیکە، لە مێشە نزیکتر، لە زەلکاو نزیکترین.

ئەو چ ئیشی بە جوانی و دەریا و ورشە و گرشەی تاوس داوە؟ ئەمە بۆ وێنە بە شاعیرەکان دەڵێم.

بە راستی، گیانی ئەوان خۆی تاوسی تاوسەکانە و دەریایەک لە خۆخوازی!

گیانی شاعیر تەماشاچی دەوێ: هەرچەند کەڵەکێویش بێ!

بەڵام من لەو گیانە وەڕەز بووم: و رۆژێکیش دەبینم کە ئەو خۆشی لە خۆ وەڕەز بووبێ.

تاکوو ئێستا شاعیرانێکم دیون کە گۆڕاون و نیگای خۆیان بەرەو خۆ وەرگێڕاوەتەوە.

داهاتنی گیانگەلێکی تۆبەکارم دیوە کە لە نێو شاعیرەکان دا راپەڕیوە.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە ڕووداوە گەورەکان

دوورگەیەک لە دەریا دایە ـ نە هێندە دوور لە دوورگەکانی بەختەوەری زەردەشت ـ لە سەر ئەو کێوە گڕکانێک هەمیشە دووکەڵی لێهەڵدەستێ. خەڵک و بە تایبەت پیرێژنەکانی نێو خەڵک، دەڵێن کە دوورگەکە وەک تەختەبەردێک بە بەر دەروازەی دونیای رووحەکانەوە نراوە: بەڵام بە نێوان کێوەگڕکانەکەوە تووڵەرێیەک بەرەو خوار کشاوە کە دەگاتە بەر دەروازەی ئەم دونیای رووحانەوە.

هەر ئەو دەمەی کە زەردەشت لە دوورگەکانی بەختەوەری دا دەژیا، وا هەڵکەوت کە کەشتییەک لە بەستێنی دوورگەیەک کە کێوی سەر بە دووکەڵی لێبوو، لەنگەری خست و سەرنشینەکانی بۆ راوەکەرویشک دابەزین. بەڵام نزیک دانی نێوەڕۆ کە کەشتیەوان و پیاوەکانی لێک کۆ بوونەوە، لەپڕ پیاوێکیان دیت کە لە ئاسمانەوە بۆ لای ئەوان دێ و دەنگێک بە ئاشکرا دەڵێ: «کاتە! کات!» بەڵام کاتێک ئەم سیمایە لێیان نزیکی نزیک بۆوە ـ هەروەک سێبەرێک، بە هەشتاو لێیان دوور کەوتەوە و بۆ لای گڕکان فڕی و ئەوان بە سەرسوڕماوییەکی زۆرەوە زەردەشتیان ناسیەوە، چونکە هەموویان جگە لە کەشتیەوان بەر لەمە ئەویان دیبوو و ئەویان خۆش دەویست، هەر ئەو جۆرەی کە خەڵک خۆشیان دەویست: یانی، بە خۆشەویستییەکی هەتا رادەیەک تێکەڵاو بە ترس و ڕێزەوە.

سوکانداری کەشتی گوتی: «بڕوانن! زەردەشتە کە دەچێتە دۆزەخ!»

هەر ئەو دەمەی کە دەریاوانەکان پێیان دە دوورگەی گڕکان نابوو، دەنگۆ درابوو کە زەردەشت ون بوە و کاتێک لە هاوڕێکانی پرسیاریان کردبوو، ئەوان گوتبوویان کە ئەو بە شەو سواری کەشتی بوە، بێ ئەوەی کە باس بکا بۆ کوێ دەیەوێ سەفەر بکا.

بەمجۆرە هەڵڵایەک ساز بوو، بەڵام دوای سێ رۆژان داستانی دەریاوانیش لەم هەڵڵایە زیاد کرا ـ ئەودەم خەڵک تێکڕا گوتیان کە شەیتان زەردەشتی بردوە. هەڵبەت، مریدەکانی بەم قسەیە پێکەنین و تەنانەت یەک لەوان گوتی: «پتر باوەڕ دەکەم کە زەردەشت شەیتانی بردبێ. بەڵام لە ناخی دڵیان دا هەموو لێوڕێژ لە نیگەرانی و تاسە بوون؛ هەر بۆیە، کاتێک زەردەشت لە پێنجەمین رۆژ لە نێویان



دا دیاری دا، خۆشییەکی مەزن تێیان دا سەری هەڵدا.

وە ئەوەیە چیرۆکی وتوێژی زەردەشت دەگەڵ سەگاور:

ئەو گوتی: زەوی پێستێکی هەیە و ئەم پێستە هەندێک نەخۆشی: بۆ وێنە، یەکێک لەم نەخۆشیانە ناوی «مرۆڤ» ە.

ناوی یەکی دیکە لەم نەخۆشیانە «سەگاور» ە؛ کە مرۆڤ لە بارەی دا گەلێک خەیاڵیان بیستوە و هەڵبەستوە.

بۆ پەی بردن بە بنج و بناوانی ئەم رازە، بە سەر دەریا دا تێپەڕیم و راستەقینەم بە رووتی دیت، بە راستی، سەرتاپا رووت.

نووکە ئەوەی کە دەبێ سەبارەت بە سەگاور بیزانم، دەیزانم؛ هەروەتر لەمەڕ ئەو شەیتانە سەرنخوونکەر و فریودەرانەی کە هەر تەنیا پیرێژنەکان زراویان لێی نەچوە.

هاوارم کرد: وەرە سەر، سەگاور، لە قووڵاییت وەرە سەر! و بێژە کە ئەم قووڵاییە چەندە قووڵە! ئەوەی کە لە دەرەوە دەگوڕێنی لە کوێوە دێ؟

تۆ گەلێک لە دەریا دەخۆیەوە: زماندرێژیی تاڵت نیشاندەری ئەوەیە! بە راستی، سەگی قووڵاییەکی وەک تۆ پتر لە رادە لە سەرایی دەخوا!

من، بە لانی زۆرەوە تۆ بە «زگ وێژی» زەوی دادەنێم ـ و هەر کات کە قسەی شەیتانە سەرنخونکەر و فریودەرکانم بیست، ئەوانم وەک تۆ بینی: تاڵ، درۆزن، سەرسەری.

ئێوە گوڕاندن و رەش و تار هەڵگەڕاندن بە خۆڵەمێش دەزانن! ئێوە باشترین خۆ هەڵکێشن و هونەری ساز کردنی خاک و گڵی پێژراو باش دەزانن.

ئێوە لە هەر کوێیەک کە بن، دەبێ لەوێ هەمیشە گڵ و خاک و گەلێک شتی نێوبۆش، پووک و رێک کوشراوەی لێبێ، کە ئازادییان دەوێ.

ئێوە هەمووتان گوڕاندن بۆ «ئازادی»تان لە هەموو شتێک پێخۆشترە: بەلام من بەو «رووداوە گەورانەی» کە لە دەوروبەریان گوڕە و چڕەدووکەڵ بێ، بێئیمان بووم.

باوەڕکە، هاوڕێی دۆزەخی هات و هەرا! رووداوە گەورەکان، پڕ دەنگترین نا،

بەڵکە بێدەنگترین ساتەکانی ئێمەن.

دونیا، بە دەوری دامەزرێنەرانی گوڕە نوێیەکان دا نا، بەڵکە بە دەوری دامەزرێنەرانی بایەخە نوێیەکان دا دەگەڕێ: بە گەڕێکی بێدەنگ.

ئەوە بدرکێنە کە کاتێک گوڕە و دووکەڵت دادەمرکێ، هەمیشە [روون دەبێتەوە کە] شتێکی وەها رووی نەداوە. چ قەیدی هەیە گەر شارێک موومیایی بێ و پەیکەرەیەک وە بن خاک کەوێ!

ئەم قسەیە بەو کەسانە دەڵێم کە پەیکەرەکان بەر دەدەنەوە: خوێ دە دەریا کردن و پەیکەرە وەبن خاک دان، بێشک گەورەترین گەوجایەتییە.

پەیکەرە وە بن خاکی بە سووک زانینی ئێوە دەکەوێ: بەڵام قانوون هەر ئەوەیە کە ژیان و جوانیی زیندووی ئەو جارێکی دی لە دەروونی بە سووک دانانەوە سەر هەڵدەداتەوە.

ئەو جارێکی دی بە سیمایەکی خودایانەتر و لەبەر رەنج کێشان گەشتر، هەڵدەستێتەوە؛ بە راستی، لەوە کە بەرتان داوەتەوە سپاستان لێدەکا، لە ئێوە سەرنخوونکەران!

بەڵام ئەمەیە پەندی من بە ئەمیرەکان و کلیساکان و هەر چییەک کە لە باری ساغی و ئاکارباشییەوە تووشی کزی هاتوە: لێگەڕێ با داکەوێ هەتا جارێکی دی بۆ سەر ژیان بگەڕێتەوە ـ و ئاکارباشیت بۆ لات بێتەوە!

وەهام لە بەرابەر سەگاور دا قسە کرد کە بە نێوچاوانی تاڵیەوە قسەی بڕیم و پرسی: «کلیسا؟ ئەمە ئیدی چیە؟»

وڵامم داوە: کلیسا جۆرێک دەوڵەتە و لە راستی دا، درۆزنترینی ئەوانە. بەڵام بێدەنگ بە ئەی سەگی گزیکار! بێشک تۆ هاوڕەگەزی خۆت باشتر دەناسی!

دەوڵەتیش وەک تۆ، سەگێکی گزیکارە؛ ئەویش وەک تۆ، پێیخۆشە کە بە دووکەڵ و بە گورەگوڕ قسە بکا ـ هەتا ئەوەکە، وەک تۆ، بە خەڵک بسەلمێنێ کە دەنگی ئەو لە ناخی بوونەوە دێتە دەر.

چونکە ئەو دەیەوێ بەبێ کەم وکووڕی گرینگترین گیانلەبەری سەر زەوی، یانی دەوڵەت بێ؛ و خەڵکیش باوەڕیان کردوە!

کە ئەوەم گوت، سەگاور وەها جوولاوە کە دەتگوت لە داخان شێت بوە.



هاواری کرد: «چت گوت؟ گرینگترین گیانلەبەری سەر زەوی؟ و خەڵکیش باوەڕیان کردوە؟» و وەها چڕەدووکەڵ و دەنگێکی بە گوڕی لە گەروو هەڵبڕی کە وەمزانی لە تووڕەیی و ئێرەییان دەخنکێ.

لە ئاکام ئارامتر بوو و هەناسەبڕکەی کەمتر بۆوە. هەر کە دامرکا، بە پێکەنینەوە پێم گوت:

«شێواوی، سەگاور؟ کە وایە لە بارەی تۆ دا هەق بە من بوو!

بۆ ئەوە کە دیسان هەق بە من بێ، گوێ لە سەگاورێکی دیکە بگرە کە بە راستی لە دڵی زەوییەوە قسە دەکا.

هەناسەکەی زێڕی لێدەپژێ و بارانی زێڕن: دڵی وەها دەخوازێ. ئەو چ ئیشی بە خۆڵەمێش و چڕەدووکەڵ و گڵی پێژراوە!

پێکەنین لە دەروونیەوە وەک هەورێکی رەنگین دەدرەوشێتەوە. ئەو لە قوڵتەقوڵت و هێڵنج و قۆڕەی زگی تۆ بێزارە.

بەڵام ئەو زێڕ و پێکەنین لە دڵی زەوی وەردەگرێ: چونکە، بزانە کە دڵی زەوی لە زێڕە.»

کە سەگاور لەوانە ئاگادار بوو، ئیدی تاقەتی گوێ گرتن لە منی نەما. شەرمەزار کلکی دە نێو گەڵۆزی نا و نووزەیەکی هات و خزاوە نێو لانەکەی.

وەهای گێڕاوە زەردەشت. بەڵام مریدەکانی هێندەیان گوێ نەدایە، چونکە زۆر تامەزرۆ بوون کە باسی دەریاوانان و کەروێشک و پیاوی باڵندەیان بۆ بگێڕێتەوە.

زەردەشت گوتی: «بڵێم چی؟ ئایا من تاپۆیەک نیم؟ بەڵام، دەبێ ئەو سێبەری من بووبێ. لەوانەیە شتێکتان لەمەڕ «ئاوارە و سێبەرەکەی» بیستبێ؟

بە هەر حاڵ، دەبێ پتر لەوە وریای بم ـ دەنا ئابڕووم دەبا.»

زەردەشت دیسان سەری راوەشاند و راما. دیسان گوتی:

«بۆ تاپۆ هاواری کرد: کاتە! کات!

«بۆچی، ئاخر ـ کات!»

وەهای گوت زەردەشت.

## پێشگۆ

«... وە دیتم کە مەینەتێکی مەزن بە سەر مرۆڤ دا دێ. هەرە باشەکان لە کارەکانیان ماندوو بوون.

ئامۆتەیەک سەری هەڵدا دەگەڵ باوەڕێک لە پەنای: هەموو شت بەتاڵە، هەموو شت وەک یەکە، هەموو شت تەواو بوە!

لە تەواوی تەپکەکان دەنگ دەگەڕاوە: هەموو شت بەتاڵە، هەموو شت وەک یەکە، هەموو شت تەواو بوە!

راستە کە خرمانمان هەڵگرتۆتەوە: بەڵام بۆچی بەرەکانمان هەموو زایە بوون و رەش هەڵگەڕاون؟ دوێشەو لە مانگی بەدفەڕ چ داکەوت؟

گشت ئیشێک بێکەلک بوە، شەرابەکەمان بۆتە ژار و چاوی پیس داغێکی زەردی لە مەزرا و دڵەکانمان داوە.

ئێمە هەمووومان ویشک هەڵگەڕاوین و ئەگەر ئاگرمان تێکەوێ، دەبینە دووکەڵ و خۆڵەمێش. ئادی، ئێمە ئاگریشمان وەگیان هێناوە.

کانیاوەکانمان هەموو ویشک بوون، دەریاش پاشەکشەی کردوە. زەوی، بە تەواوەتی دەیەوێ لێک بقەڵەشێ، بەڵام قوولایی نایەوێ قووتی بدا!

ئاخ، لە کوێیە ئەو دەریایەی کە دەکرێ تێیدا بخنکێی؟ ـ پاڕانەوەکانمان وەها بە سەر گۆلاوە تەنکەکان دا زایەڵەی دێ.

بە راستی، تەنانەت ماندووتر لەوەم کە بمرم؛ هەروا بەخەبەرین و زیندوو ـ بەڵام، لە گۆڕەکان دا!»

زەردەشت بیستی کە پێشگۆیەک وەها دەڵێ؛ و پێشگۆییەکەی وەبەر دڵ کەوت و تێکیدا. ئەو پەشێو و شەکەت ئاوارە بوو و هەر وەک ئەوانەی لێهات کە پێشگۆ لێیان دوا بوو.

زەردەشت وەهای بە مریدەکانی گوت: «بە راستی، چی وای بۆ داهاتنی ئەم شەوە درێژە نەماوە. ئاخ، چلۆن دەتوانم شۆقی خۆمی لێ دەرباز بکەم؟

ئەو نابێ لەم مەینەتە دا دابکەوێ! چونکە دەبێ شۆقێک بێ بۆ دوورترین



دونیاکان و دوورترین شەوەکان.»

زەردەشت، وەها بە دڵێکی شێواو ئاوارە بوو و سێ رۆژان چی نەخوارد و نەخواردەوە و حەجمینی لێبڕابوو و قسەیەکی نەکرد. لە ئاکام، وا هەڵکەوت کە خەوێکی قورسی بە سەر داهات. بەڵام مریدەکانی بە چاوەدێری شەو و رۆژە لە دەوری دانیشتن و دڵنگەران چاوەڕوان مانەوە هەتا کەی لە خەو هەستێ و جارێکی دی بدوێ و لەو مەینەتە بێتەوە.

ئەمەیە ئەوەی زەردەشت دوای هەستانی گوتی؛ بەڵام دەنگی هەر وەک دەنگێک لە دوورەدەستانەوە دەگەیشتە گوێی مریدەکانی:

«هاوڕێیان، نووکە گوێ لە خەونێک بگرن کە دیتوومە و بۆ لێکدانەوەی ماناکەی یاریدەم بدەن!

ئەم خەونە هێشتا لێم پەردەکێکە: ماناکەی لە دەروونی دا شاراوەیە و لە بەند دایە و هێشتا بە باڵی وەشاوە لە سەری هەڵنافڕێ.

لە خەونم دا دیتم کە پشتم لە تەواوەتی ژیان کردوە: من لە کێو بورجی چۆلی مەرگ دا چاوەدێری شەو و گۆڕەکان بووم.

من لەوێ چاوەدێری تابووتەکانی ئەو بووم: دەخمە شێدارەکان پڕ بوون لە وەها نیشانەگەلێکی سەرکەوتن. ژیانی بەزیو لە نێو تابووتە شووشەییەکانەوە دەیڕوانیە من.

بۆنی ئەبەدیەتە تۆزاوییەکان لە هەناسەم دا بوون و رەوانم برشاوی و تۆزاوی کەوتبوو. ئاخر کێ توانیویەتی لەوێ هەوای تازە بدا بە رەوانی؟

رووناکایی نیوەشەو هەر لە دەوروبەرم بوو و تەنیایی لە پەنای هەڵکورمابوو؛ و سێهەمین و خرابترین هاوڕێم، بێدەنگی زەنگداری مەرگ بوو.

گەلێکم کلیل، کلیلە هەر ژەنگاوییەکان پێبوون و دەمزانی کە چلۆن بە جیڕەترین دەروازەکانی پێبکەمەوە.

کاتێک باڵەکانی دەروازە لێک کرانەوە، دەنگی وەک گوڕەیەکی زۆر تووڕە لە دالانەکان دا دەنگی داوە، ئەم مەلە نابەدڵ چریکاندی، چونکە نەیدەویست لە خەو هەڵیهەستێنن.

بەڵام ترسناکتر و دڵازارتر لەو، کاتێک بوو کە دیسان بێدەنگی هاتەوە و

دەوروبەری داگرتمەوە. من لەو بێدەنگیە بەدخوازە دا بە تەنیا دانیشتم.

وەها زەمان خزی و بە سەر من دا تێپەڕی. هەرچەند کە زەمانێک لە ئارا دا نەبوو. من لە کوێوە دەزانم؟ بەڵام لە ئاکام شتێک قەوما کە وەخەبەری هێنام.

سێ تەقەی برووسکاسا لە دەرگا بەرز بۆوە و دەخمەکان سێ جار ئەم دەنگەیان وەرگرت و نەڕاندیان: ئەودەم من بۆ لای دەروازە چووم.

هاوارم کرد: ئەهای! کێ ژیلەمۆکەی خۆی بۆ کوێستان دەبا؟ ئەهای! ئەهای! کێ ژیلەمۆکەی خۆی بۆ کوێستان دەبا؟

کلیلم لە قفڵ نا و بە دەرگاوە نووسام و بە زۆر کێشام. بەڵام هێشتا قولانجێک نەکرابۆوە کە ـ

بایەکی بەگوڕ باڵەکانی ئەوی لێک کردەوە و بە وژەوژ و بە گوڕ و تینەوە تابووتێکی رەشی پێدادام:

لە نێوان وژە و گوڕە و هاوارەوە، تابووت لێک بڵاو بوو و لە نێوانی قاقایەکی هەزارتوێ هاتە دەر.

بە هەزار بیچمی منداڵ، فریشتە، کوند، شێت و پەپوولەگەلێکی بە قەرا منداڵێک، بە من پێکەنی و گوڕاندی و گاڵتەی پێکردم.

ئەم زەندەقی بردم و بە زەوی دادام. من لە ترسان وەهام چریکاند کە قەت وام نەچریکاندبوو.

بەڵام هەمان چریکە منی وەخەبەر هێنا ـ و من وەخۆ هاتمەوە.

زەردەشت خەونەکەی ئاوا گێڕاوە و لە دوایی بێدەنگ بوو: چونکە هێشتا پەیامی خەونەکەی نەدەزانی. بەڵام خۆشەویستترین مریدەکەی، گورج راپەڕی و دەستەکانی زەردەشتی گرت و گوتی:

«ئەی زەردەشت! ژیانی تۆ خۆی ئەم خەونەمان بۆ لێکدەداتەوە.

مەگەر تۆ هەر ئەو بایە نی کە بە وژە تیژەکەی، دەروازەکانی بورجی مەرگ لێک دەکاتەوە؟

ئایا تۆ خۆت هەر ئەو تابووتەی ئاخنراو لە بەدخوازییە رەنگاوڕەنگ و بیچمەکانی فریشتە سیمای ژیان نی؟



بە راستی، زەردەشت هەر وەک قاقای هەزارتوێی منداڵەکان رێ دەباتە نێو هەموو گۆڕخانەکانەوە، بە هەموو ئەم چاوەدێرانەی شەو و گۆڕ و ئەوانەی کە جرینگە لە کلیلە شوومەکانەوە دێنن، پێدەکەنێ.

تۆ بە قاقای خۆت ئەوان دەترسێنی و لە زەوییان دەدەی. بێهۆش بوون و وەهۆش هاتنەوەیان بەڵگەی زاڵ بوونی دەستەڵاتی تۆیە بە سەر ئەوان دا.

و ئەودەم کە شەوی درێژ و شەکەتی مەرگاسا دابێ، تۆ، تۆ ئەی لاگری ژیان! لە ئاسمانی ئێمە ئاوا نابی.

تۆ چاوی ئێمەت بەرەو هەسێرە تازەکان و رازە تازەکانی شەو کردەوە، بە راستی، تۆ پێکەنینت وەک تاوڵێکی رەنگاوڕەنگ لە سەر ئێمە هەڵداوە.

نووکە کەنینی منداڵان هەمیشە لە تابووتەکانەوە هەڵدەقوڵێ، نووکە بایەکی بە هێز هەمیشە هەڵیدەکاتێ، سەرکەوتوو بە سەر گشت ماندوویەتیە مەرگاساکان دا، کە تۆ خۆت پەنا و پێشگۆی ئێمەی لە بەرابەر ئەو دا!

بە راستی، **تۆ خۆت ئەوانت لە خەونت دا دی،** دوژمنەکانت: ئەمە ناخۆشترین خەونی تۆ بوو!

بەڵام هەر ئەو جۆرەی کە تۆ بە هۆی ئەوانەوە وەخەبەر هاتی و وەخۆ هاتیەوە، ئەوانیش لە خۆوە وەخەبەر دێن ـ و بۆ لای تۆ دێن.»

مرید وەهای گوت؛ و مریدەکانی دی لە دەورەی زەردەشت ئاپوورەیان دا و دەستەکانیان گرت و ویستیان هانی بدەن کە نوێن و مەینەت وەلابنێ و بۆ لایان بگەڕێتەوە. بەڵام زەردەشت راست لە سەر نوێنەکەی دانیشت و بە نیگایەکی غەریب، هەر وەک کەسێک کە لە غوربەتێکی درێژخایەنەوە گەڕابێتەوە ماڵ، روانیە مریدەکانی و لە سیمایان ورد بۆوە؛ و هێشتا ئەوانی نەناسیبۆوە. بەڵام کاتێک مریدەکانی ئەویان هەستاند و لە سەر پێیان راگرت، بڕوانە! لەپڕ چاوەکانی گۆڕان و ئەوەی کە بە سەری هاتبوو وەبیری هاتەوە. ئەودەم دەستێکی بە ردێنی داهێنا و بە دەنگێکی بەقەو گوتی:

«ئادی! ئەمەش بە وەختی خۆی! بەڵام مریدەکانی من، لە هەوڵی ئەوە دابن کە چێشتێکی خۆش ساز کەن و دەستبەجێ! من لە سەر ئەم باوەڕەم کە خەونی خراپ دەبێ ئاوا قەرەبوو بکەنەوە!

بەڵام پێشگۆش لەپەنا من دەخوا و دەخواتەوە! و بە راستی دەریایەک بەو نیشان دەدەم کە دەکرێ تێیدا بخنکێ!»

وەهای گوت زەردەشت. ئەودەم درێژماوەیەک روانیە سیمای مریدێک کە خەونەکەی لێک دابۆوە و لە دوایی بە دەم روانینەوە سەری راوەشاند.

## سەبارەت بە نەجات

رۆژێک هەروا کە زەردەشت بە سەر پردێکی گەورە دا تێدەپەڕی، زەلیل و گەداکان دەورەیان دا و پشتکووڕێک وەهای پێگوت:

«بڕوانە، زەردەشت!خەڵکیش لە تۆ شت فێر دەبن و ئیمان بە ئامۆتەکانت دێنن: تۆ لە پێشدا دەبێ ئێمە زەلیلەکان بڕوادار بکەی! نووکە تۆ گردەکۆیەکی باشت لەبەر دەست دایە و هەلێکی چەند لایەنە! تۆ دەتوانی کوێر شەفا بدەی و پێی رۆیین بدەی بە فەلەج؛ و هەروەتر لەو کەسەی کە بارێکی قورسی هەیە، هەندێکی لێهەڵگری. ئەمە بە بڕوای من، رێگای دروستی بڕوادار کردنی زەلیلەکانە بە زەردەشت!»

بەڵام زەردەشت وەها وڵامی ئەو کەسەی داوە کە ئەم قسەی کردبوو: «هەڵگرتنی کووڕی لە پشت کووڕ، وەرگرتنی گیانی ئەوە ـ خەڵک وەهادەڵێن. ئەگەر چاو بدەیە کوێر، خراپەی وا لە سەر زەوی دەبینێ کە تووک لەو کەسەی دەکا کە شەفای داوە، بەڵام ئەو کەسەی کە پێ دەداتە فەلەج، گەورەترین زەرەر لەو دەدا: چونکە هێشتا هەر لە جێی خۆی نەبزووتوە، چەپەڵییەکانی دەگەڵ ئەو وەجووڵە دەکەون ـ خەڵک سەبارەت بە زەلیلەکان وەها دەڵێن و ئەگەر خەڵک لە زەردەشت شت فێر دەبن، بۆچ زەردەشت لە خەڵک فێر نەبێ؟

بەڵام لەو دەمەوە کە لە نێو مرۆڤ دا دەژیم، ئەمە بە هێند ناگرم کە ئەم یەکە، چاوی نەبێ و ئەمی دی گوێ و ئەوی سێهەم، پێی نەبێ و یان کەسی دیکە هەبن کە زمانی خۆیان لە دەست دابێ یان کەپۆ، یان سەری خۆیان.

لەوانە خراپتر، گەلێکم دیون و دەیبینم و هەندێک لەوان وەها رقم هەڵدەستێنن کە لە یەک یەکیان نادوێم و لە سەر هەندێکیان بە گشتی ناتوانم بێدەنگ بم: یانی لەمەڕ ئەو مرۆڤانەی کە لە هەموو شت هیچیان نیە و لە شتێک پتر لەوەی کە



پێویستە هەیانە ـ ئەو مرۆڤانەی کە شتێک پتر لە چاوێکی گەورە یان زارێکی گەورە یان زگێکی گەورە یان شتێکی گەورەی دی نین: من ئەوانە بە زەلیلی بەراوەژوو ناو دەبەم.

ئەودەم کە من لە تەنیایی خۆم هاتمە دەر و بۆ یەکەم جار لەم پردە تێپەڕیم، ئەوەی کە چاوەکانم دەیدیت باوەڕم پێنەدەکرد. روانیم و دیسان روانیم، لە ئاکام گوتم: ئەمە گوێیەکە! گوێیەک بە قەرا مرۆڤێک! دیسان باشتر روانیم: هەر بە راستی، لە ژێر گوێ دا شتێکی بەستەزمانی بچووک و هیچەکە و لاواز دەجووڵاوە. بە راستی، ئەم درنج گوێیە لە سەر ساقەتێکی چووک و باریک هەڵکوتبوو ـ و ئەم ساقەتە مرۆڤێک بوو! ئەگەر زەرەبینێکت لە پێش چاو با دەتتوانی سیمای ورد و بە ئێرەییانەی بناسیەوە، هەروەتر رەوانی چووک و پەنەماوی کە لە سەر ئەو ساقەتە دەلەراوە. بەڵام خەڵک بە منیان گوت کە گوێی گەورە هەر تەنیا مرۆڤێک نیە، بەڵکە مرۆڤێکی مەزنە، بلیمەتێکە. بەڵام هەر کات کە خەڵک باسی مرۆڤە مەزنەکانیان کردوە، قەت باوەڕم بە قسەکانیان نەکردوە ـ و هەروا لە سەر ئەوە سوورم کە ئەو زەلیلێکی بەراوەژوو کراوە، کە لە هەموو شتێک گەلێکی کەمە و لە شتێک گەلێک زۆر.»

کاتێک زەردەشت بە کووڕ و ئەوانەی کە ئەو نوێنەر و وێژەریان بوو، وەهای گوت، زۆر بە دڵێشاوی رووی لە مریدەکانی کرد و گوتی:

«هاوڕێیانی من، بە راستی، لە نێو مرۆڤ دا وەها دەگەڕێم هەر وەک بڵێی لە نێو کوتەکانی لەش و دەست و پێی ئەوان دا دەگەڕێم!

ئەوەی کە لای من بە سامە دیتنی مرۆڤ بە ئەنجراوی و لەت و پەتییە، هەر وەک شەڕگە و کوشتارگا.

هەر کات نیگام لە ئێستاوە بەرەو رابوردوو رادەکا، هەمیشە هەر ئەوە دەبنیێ: کوتەکان و دەست و پێیەکان و کارەساتە بە سامەکان ـ بەڵام نەک مرۆڤەکان!

ئاخ، هاوڕێیانی من، ئێستا و رابوردووی زەوی ـ بۆ من تاقەت نەهێنراوترین شتە و ئەگەر من پێشگۆی ئەوەی کە دەبێ ببێ، نەبوایەم، نەمدەزانی چلۆن دەبا ژیابام.

پێشگۆیەک، خوازیارێک، ئافرێنەرێک، خۆ هەم داهاتوویەک و هەم پردێک بۆ داهاتوو ـ هەروەتر، مخابن، خۆ هەروەک زەلیلێک لە سەر ئەم پردە وەستاو: زەردەشت تەواوی ئەمانەیە.

تەنانەت لەوانەیە، ئێوەش لە خۆتان پرسیبێ: «زەردەشت بۆ ئێمە کێیە؟ چ ناوێک لەو بنێین؟» و ئێوەش، هەر وەک من، وڵامی خۆتان بەم پرسیارانە داوەتەوە:

ئایا بەڵێندەرێکە؟ یان تەواوکەرێک؟ سەرکەوتوویەک؟ یان میراتخۆرێک؟ خرمانێک یان کێڵەرێک؟ بژیشکێک؟ یان چاک بۆوەیەک؟

ئایا شاعیرێکە؟ یان راستەقینەخوازێک؟ رزگارکراوێک؟ یان لە بەندکەرێک؟ پیاو چاکێک؟ یان بەدخوازێک؟

لە نێوان مرۆڤ دا وەها دەگەڕێم کە دەڵێی لە نێوان کوتەکانی داهاتوو دا دەخولێمەوە: ئەو داهاتوویەی کە من دەیبینم.

تەواوی بیر و هۆشم ئەمەیە ئەوەی کە لەت و پەتە و راز و کارەساتی بە سامە، بیانکەمە یەک و لە جێیەک کۆیان کەمەوە.

ئەگەر مرۆڤ کۆکەر و رازکەرەوە و رزگاریدەری کارەسات نەبا، چلۆن دەمتوانی بەرگەی ئەوە بگرم کە مرۆڤ بم؟

رابوردوەکان رزگار کردن و هەر «وەها بوو»یەک وەک «من ئەوم وەها ویست!» ئافراندنەوە ـ ئەمەیە ئەوەی کە من بە نەجات ناوی دەبەم!

ویست! ئەمەیە ناوی ئەوەی کە رزگاریدەر و شادی هێنەرە: ئێوەم وەها فێر کردوە، هاوڕێکانم! بەڵام نووکە ئەمەش فێر بن کە ویست بۆ خۆی هێشتا زیندانیە.

ویستن، رزگاریدەرە: بەڵام ناوی چیە ئەوەی کە رزگاریدەریش لە بەند دەخا؟

«وەها بوو»: ئەوەیە ناوی ددان دەچیرەوە بردنی مەیل و بە تەنیا ماوەترین مەینەتی ئەو. ئەو، بێدەستەلات لە ئاست ئەوەی کە ئەنجام دراوە، بینەری بەدخوازی هەموو رابوردوەکانە.

ویست ناتوانی بەرەو دواوەی بوێ. ناکرێ زنجیری زەمان و تەماحخوازی زەمان بپچڕێنی ـ ئەمەیە بە تەنیاماوەترین مەینەتی ویست.



ویستن، رزگاریدەرە: بەڵام ویست بۆ رزگار بوون لە مەینەتی خۆی و بە گاڵتە گرتنی زیندانی خۆی چ بیرێک دەکاتەوە؟

ئاخ، هەر بەندییەک شێت دەبێ! ویستی بەندکراویش شێتانە خۆی رزگار دەکا.

تووڕەیی ئەو لەمەیە کە زەمان بۆ دواوە ناگەڕێتەوە. «ئەوەی بوو» ـ ئەمەیە ناوی بەردێک کە ویست ناتوانی تلی پێبدا.

لەبەر ئەوە لە رق و قینان بەردەکان جاڵە دەکاتەوە و لە هەر کەسێک کە وەک ئەو هەست بە رق و قین نەکا، تۆڵە دەستێنێتەوە.

ویستی رزگاریدەر، بەمجۆرە دەبێتە ئازاردەر و لە هەر چییەک کە رەنج دەبا، لەبەر ئەوە کە ناتوانێ بۆ دواوە بگەڕێتەوە، تۆڵە دەستێنێتەوە.

ئادی، تۆڵە هەر ئەمەیە و بەس: یانی دوژمنایەتی ویست دەگەڵ زەمان و «وەها بوو»یەکەی.

بە راستی، شێتایەتییەکی گەورە لە ویستی ئێمە دا دەژی: و ئەمە کە ئەم شێتایەتیە دەستی بە گیان راگەیشتوە، تووکێکە لە هەر شتێکی مرۆڤانە.

**رووحی تۆڵە**: هاوڕێیانم، ئەمەیە باشترین شتێک کە هەتا ئێستا مرۆڤ بیری لێکردۆتەوە و لە هەر کوێ کە رەنج هەبوە، سزاشیان هێناوەتە کایەوە.

چونکە «سزا» ناوێکە کە تۆڵە دەیدا بە خۆی: ئەو بە وشەیەکی بە درۆی ریاکارانە ویژدانێکی ئاسوودە بۆ خۆی ساز دەکا.

لەبەر ئەوە کە ویستیار خۆی لە رەنج دایە، لەبەر ئەوە کە ناتوانێ ویستی بەرەو دواوەی هەبێ: کەوایە، ویست و تەواوەتی ژیان دەبێ بە سزایەک دابندرێن.

ئەودەم هەور بە دوای هەور دا بە سەر گیان دا کەوتن: هەتا ئەوەکە لە ئاکام شێتایەتی موعیزەی کرد: «هەموو شتێک تێدەپەڕێ، کەوایە هەموو شتێک شیاوی تێپەڕینە!»

«و عەداڵەت، خۆی هەر ئەم قانوونەی زەمانە کە دەبێ منداڵەکانی خۆی قووت بدا» ـ شێتایەتی وەهای موعیزە کرد.

«شتەکان هەموو بە پێی عەداڵەت و سزا رێک و پێک کراون. ئاخ، لە کوێیە

رزگاری لە ڕووباری شتەکان و لە سزای ژیان؟ ـ شێتایەتی وەهای موعیزە کرد.

«لەو جێیەی کە عەداڵەتی هەمیشەیی هەبێ، ئایا رزگاری لە ئارا دا دەبێ؟» مخابن کە بەردی «وەها بوو» بۆ تل دان دەست نادا: کەوایە هەموو سزاکانیش دەبێ هەمیشەیی بن!» شێتایەتی وەهای موعیزە کرد.

«هیچ کردەوەیەک ناکرێ بفەوتێنی: چلۆن دەکرێ بە سزا کردەوەیەک بکەی بە نەکراوە؟ ئەمەیە، ئەمەیە ئەوەی کە لە سزای «ژیان» دا هەرمانە: ژیانێکی وەها هەرمان دەبێ کردەوە و گوناهی پەیتاپەیتا بێ.»

«مەگەر ئەوەکە ویست لە ئاکام خۆی نەجات بدا و ویستن، ببێتە نەویستن.» ـ بەڵام برایان، ئێوە ئەم سترانە خەیاڵییەی شێتایەتی دەناسن!

من بە فێر کردنی ئەوە کە «ویست ئافرێنەرە» ئێوەم لەم سترانە خەیاڵیانە دوور کردۆتەوە.

«وەها بوو» هەمووی کوت کوت و پەردەک و کارەساتی بەسامە ـ هەتا ئەوەکە ویستی ئافرێنەر بڵێ: «بەڵام من ئەوم ئاوا ویست!»

هەتا ئەوەکە ویستی ئافرێنەر بڵێ: «بەڵام من ئەوم ئاوا دەوێ: من ئەوم دەبێ ئاوا بوێ!»

بەڵام تا ئێستا وەهای گوتوە؟ و کەی وەها شتێک روو دەدا؟ ئایا ویست هێشتا لە گەوجایەتی خۆی رزگاری نەبوە؟

ئاخۆ ویست بۆتە رزگاریدەر و شادیدەری خۆی؟ ئایا رووحی تۆڵە و ددان دەچیڕەوە بردنی بە تەواوەتی لە بیر کردوە؟

و چ کەسێک ئەوی فێرە ئاشت بوونەوە دەگەڵ زەمان و ئەوەی کە بەرزتر لە هەر ئاشت بوونەوەیەکە کردوە؟

ویستێک کە «ویستی دەستەڵاتە» دەبێ شتێک سەرتر لە ئاشت بوونەوەی بوێ ـ بەڵام ئەمە چلۆن دەگونجێ؟ هەتا ئێستا کێ بەرەو دوا ویستنی فێرە ئەو کردوە؟

بەڵام، کاتێک قسەکانی زەردەشت گەیشتە ئێرە لەپڕ لە دوان وەستا و وەک



کەسێک کە وا دەنوێنێ هەراسێکی گەورە و گرانی تێکەوتبێ بە نیگایەکی هەراسان روانیە مریدەکانی و نیگای وەک تیرێک بە نێوان بیر و بیرە شاراوەکانیان دا تێپەڕی. بەڵام، تاوێک دوای ئەوە، جارێکی دی پێکەنی و ئارام گوتی:

«ژیان دەگەڵ مرۆڤ دژوارە؛ چونکە بێدەنگ مانەوە گەلێک دژوارە؛ بە تایبەت بۆ زۆربڵێ.»

وەهای گوت زەردەشت. بەڵام پشتکووڕ کە گوێی لەم قسانە گرتبوو و لەو نێوە دا خۆی شاردبۆوە؛ کاتێک پێکەنینی زەردەشتی بیست، سەرەتاتکێیەکی کرد و بە سەبرا گوتی:

«بەڵام بۆچی زەردەشت دەگەڵ ئێمە بە شێوەیەکی جگە لەوە دەدوێ کە دەگەڵ مریدەکانی؟»

زەردەشت وڵامی داوە: «چ جێی سەرسوڕمانە؟ دەگەڵ کووڕەکانیش دەکرێ کووڕانە قسە بکەی!»

پشتکووڕ گوتی: «زۆرباشە. دەگەڵ شاگردەکانیش دەکرێ لە دەرەوەی فێرگە لە هەر بابەتێکەوە بدوێن.

بەڵام بۆچی زەردەشت دەگەڵ شاگردەکانی بە شێوەیەکی جگە لەوە دەدوێ کە دەگەڵ خۆی؟»

## سەبارەت بە زیرەکی مرۆڤ

هەڵدێر بە سامە نەک بەرزایی!

هەڵدێر، شوێنێکە کە نیگا لە **خوارەوە** دەکەوێ و دەست بۆ **بەرزایی** چنگ داوێژێ. لەوێ دڵ لە ویستی دووجۆرەی خۆی سەری دەگێژەوە دێ.

ئاخ هاوڕێیانی من، ئایا ئێوەش لە ویستی دووجۆرەی دڵی من ئاگادار بوون؟

ئەمەیە، ئەم، هەڵدێر و مەترسییەی من، کە نیگام بە بەرزایی دەکەوێ و دەستم دەیەوێ چنگ لە قووڵایی داگرێ و پێوەی بنووسێ.

ویستم بە مرۆڤەوە دەنووسێ. بە زنجیر خۆم بە مرۆڤەوە دەبەستمەوە، چونکە

بۆ لای بەرزەمرۆڤ هەڵدەکێشرێم: چونکە ویستەکەی دیکەم وەهای دەوێ.

لەبەر ئەمـە، لە نێـو مـرۆڤ دا وەک کـوێران دەژیم، وەک دەڵێی ئەوان هەر ناناسم: هەتا ئەوە کە دەستەکانم ئیمانی خۆیان بە خۆڕاگریان بە تەواوی لە دەست نەدەن.

من ئێوە مرۆڤەکان ناناسم: ئەم تاریکییە و ئەم دڵدانەوەیە زۆرجار دەورووبەری داگرتووم.

چاوەڕوانی هەر خاپێنەرێک لەبەر دەروازە دادەنیشم و دەپرسم: «کێ دەیەوێ من فریو بدا؟»

ئەمەیە یەکەم زیرەکی مرۆڤیم، کە خۆ لە ژێر دەستەڵاتی فریو دەنێم هەتا لە ئاست فریودەران ئاگاداری خۆم نەبم.

ئاخ، ئەگەر لە ئاست مرۆڤ دا ئاگاداری خۆ بام، مرۆڤ چلۆن دەیتوانی لەنگەری باڵۆنی من بێ و باڵۆن چ سانا منی هەڵدەکێشا و دەیبرد!

لە چارەنووسم دا وەها پێشبینی کراوە کە نابێ زۆر وریا بم.

ئەو کەسەی کە نایەوێ لە نێو مرۆڤ دا لە تینوان قڕ بێ، دەبێ فێر بێ کە لە هەر جامێک بخواتەوە؛ هەر کەسێک کە دەیەوێ لە نێو مرۆڤ دا پاک بمێنێتەوە، دەبێ بزانێ کە چلۆن تەنانەت بە ئاوی ناپاکیش خۆی بشوا.

زۆر جار بۆ دڵدانەوەی خۆم وەهام بە خۆ گوتوە: «زۆر باشە، وەرە، ئەی دڵی پیر! کارەساتێکت لێتێپەڕی: لە وەها بەختیارییەکی خۆت شاد بە!»

بەڵام ئەمەیە زیرەکی دیکەی مرۆڤیم: دەگەڵ خۆخوازەکان پتر هەڵدەکەم هەتا دەگەڵ بە غروورەکان.

مەگەر خۆخوازیی بریندار کراو دایکی هەموو تراژیدیەکان نیە؟ بەڵام لەو شوێنەی غروور بریندار بکرێ، شتێکی باشتر لە غروور دەپشکوێ.

بۆ ئەوە کە ژیان شیاوی تەماشا کردن بێ، دەبێ بە باشی دەوری نمایشەکەی بگێڕدرێ: و بۆ ئەمە پێویستی بە دەورگێڕانێکی باش هەیە.

گشت خۆخوازەکانم بە دەورگێڕانێکی باش هاتوونە بەر چاو: دەور دەگێڕن و پێیانخۆشە کە تەماشایان بکەن ـ لە گیانیان دا جگە لەم ویستە، شتێکی دیکە



نیە.

ئەوان خۆ دێننە سەر شانۆ، ئەوان دەوری خۆیان دەگێڕن؛ پێمخۆشە لە نزیکی ئەوان تەماشای ژیان بکەم ـ ئەم کارە دەرمانی داماوییانە.

لەبەر ئەوەیە کە دەگەڵ خۆخوازەکان هەڵدەکەم چونکە بژیشکی داماویی منن و من وەها بە مرۆڤایەتی دڵبەند دەکەن کە بە نمایشێک.

جگە لەوە، کێ دەتوانێ پەی بە قووڵایی خۆ بەچووک دانانی پیاوێکی خۆخواز بەرێ؟ من لەبەر خۆ بەچووک دانانی دەگەڵی باشم و بۆی دڵسۆز.

ئەو دەیەوێ لە ئێوە ئیمان بە خۆ هەبوون فێر بێ، ئەو لە نیگای ئێوە خۆراک وەردەگرێ! ئەو لە چەپڵەی ئێوە پێهەڵکوتن وەردەگرێ.

ئەو باوەڕ بە درۆکانی ئێوەش دەکا ئەگەر بە درۆ لە چاکەی بدوێن: چونکە دڵی لە ناخی خۆی دا ئاخ هەڵدەکێشێ کە «**من** کێم؟»

ئەگەر ئاکارباشی راستەقینە ئەوە بێ کە هیچ سەبارەت بە خۆی نازانێ: بڕوانە، خۆخواز هیچ لە خۆ بەچووک دانانی خۆی نازانێ!

بەڵام ئەمەیە سێهەم زیرەکی مرۆڤیم کە نەهێڵم ترسی ئێوە دیداری **بەدخوازانم** لێ ناخۆش بکا.

من لە دیتنی ئەوانەی کە دەست پەروەردەی هەتاوی سووتێنەرن بەختەوەرم: بەبرەکان و دارخورماکان و مارەزەنگیەکان.

لە نێو مرۆڤیش دا دەست پەروەردەکانی جوانی هەتاوی سووتێنەر هەن و چ شتگەلێکی جێی سەرسوڕمانیش کە لە بەدخوازان دا هەیە.

بە راستی، هەر ئەو جۆرەی کە زاناترین کەسانی ئێوە لە لای من زۆر زانا دیاری ناکەن، خراپەی مرۆڤیشم وەها نەدیوە کە باسی لێکراوە.

وابوە کە سەرم راوەشاندوە و پرسیومە: بۆچی هێشتا هەر زەنگ لێدەدەن ئەی مارەزەنگییەکان؟

بە راستی، بۆ خراپەکانیش هێشتا داهاتوویەک هەیە! و گەرمترین باشوور هێشتا بۆ مرۆڤ نەدۆزراوەتەوە.

گەلێک شت هەن کە نووکە بە خرابترینی خراپەکان دەناسرێن، بەڵام پانایان

دوازده هەنگاو و درێژاییان پتر لە سێ مانگ نیە! بەڵام ڕۆژێک ئەژدیهاگەلێکی گەورەتر دێنە سەر دونیا.

هەتا بەرزەمرۆڤ بێ ئەژدیها نەمێنێتەوە ـ بەرزەئەژدیهایەکی شیاوی ئەو ـ هێشتاش دەبێ هەتاوێکی سووتێنەر گەلێک بە سەر لێڕەوارە چڕ و شێدارەکان دا هەڵبێ.

لە پێشدا دەبێ کتکە کێوییەکانی ئێوە ببنە بەبر و بۆقە ژاردارەکانتان ببنە تیمساح، هەتا ڕاوکەری باش، ڕاوێکی باشی هەبێ!

بە ڕاستی، ئەی چاکان و دادخوازان! گەلێک شت لە ئێوە دا شیاوی پێکەنینە، بە تایبەت ترسی ئێوە لەوەی کە هەتا ئێستا ناوی «شەیتان» تان لێناوە.

ڕەوانی ئێوە وەها دەگەڵ مەزنایەتی بێگانەیە کە بەرزەمرۆڤ لە کاتی چاکەش دا بۆ ئێوە **ترسناک** دەبێ!

ئێوە فرەزانان و زانایان لە بەرابەر تینی هەتاوی فرەزانییەک کە بەرزەمرۆڤ بە شادییەوە ڕووتایەتی خۆی تێدا دەشوا، ڕادەکەن!

ئەی پایەبەرزترین خەڵکێک کە بە بەر چاوم دا تێپەڕیون! ئەمەیە شکی من و پێکەنینی شاراوەم بە ئێوە: پێموایە ئێوە بەرزەمرۆڤی من بە شەیتان ناو دەبەن!

ئاخ، لەم پایەبەرزترین و باشترین کەسانە ماندوو بووم: لە «بەرزاییەکانی» ئەوانەوە بوو کە من ئاواتی ڕاکردن و دەرکەوتن و دوور بوونەوەم بۆ لای بەرزەمرۆڤ هەبوو!

کاتێک ئەم باشترین کەسانەم بە ڕووتی دیت، سەرسامییەک دایگرتم: ئەوسا باڵم بۆ فڕین بەرەو داهاتوو دوورەکان لێڕوا.

بەرەو داهاتووگەلێکی دوورتر، بەرەو باشوورگەلێکی باشوورتر لەوەی کە قەت لە خەیاڵی نەقاشێک دا نەنەخشاوە: بۆ ئەو شوێنەی کە خوداکان لە هەموو جلێک دا شەرم دەیانگرێ!

بەڵام دەمەوێ **ئێوە** لە جلی بەدەڵ دا ببینم، ئێوە هاوساکان و هاورەگەزەکان و بە ناوی «چاکان و دادخوازان» ڕازاوە و خۆخواز و بەڕێز.

خۆشم لە نێو ئێوە دا بە جلی بەدەڵ دادەنیشم ـ هەتا هەم ئێوە نەناسمەوە و



هەم خۆم: چونکە ئەمەیە دوایین زیرەکی مرۆڤی من.

وەهای گوت زەردەشت.

## بێدەنگترین سات

هاوڕێیان، چم لێقەوماوە؟ پەشێوم دەبینن، هاندراو، بێویستی خۆ فەرمانبەر، ئامادەی ڕۆیشتن ـ مخابن، ڕۆیشتن لە لای ئێوە!

بەڵێ، زەردەشت جارێکی دی دەبێ بۆ نێو تەنیایی خۆی بگەڕێتەوە: بەڵام: ئەمجارە ورچ ناشاد بۆ ئەشکەوتەکەی خۆی دەگەڕێتەوە!

چم لێقەوماوە؟ کێ ئەم فەرمانەی داوە؟ ئاخ، بانووی تووڕەی من وەهای دەوێ. ئەو قسەی دەگەڵ کردووم: ئایا قەت ناوی ئەوم بە ئێوە گوتوە؟

دوێنێ، نزیک تاریکان، بێدەنگترین ساتی من دەگەڵ من قسەی کرد: ئەوەیە ناوی بانووی بە سامی من.

ڕووداوەکە ئاوا بوو ـ چونکە من دەبێ هەموو شتێک بە ئێوە بڵێم هەتا دڵتان لەم لەپڕ ـ وەڕێ ـ کەوتوویە، نەیەشێ.

ئایا ئێوە هیچ لە سامی ئەو کەسەی کە خەوی لێدەکەوێ دەزانن؟

ئەو سەراپا سامە، چونکە زەوی ژێر پێی ڕۆدەچێ و خەون دەست پێدەکا.

ئەوە بۆ کینایە بە ئێوەی دەڵێم. دوێنێ، لە بێدەنگترین سات، زەوی ژێر پێم ڕۆچوو: خەون دەستی پێکرد.

میلەی سەعات جووڵاوە، سەعاتی ژیان هەناسەی هەڵکێشا ـ هیچکات لە ئاقاری خۆم وەها بێدەنگییەکم نەبیستبوو: وەها بێدەنگییەک کە خۆفی دە دڵ خستم.

ئەودەم بێدەنگەکە بە منی گوت تۆ دەزانی، زەردەشت؟»

لەم سرتەیە سەرسام هاوارم کرد و ڕەنگی ڕوخسارم پەڕی، بەڵام بێدەنگ مامەوە.

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ دەزانی، زەردەشت، بەڵام دەنگ هەڵنابڕی!»

له ئاكام لاسارانه گوتم: «ئادی، دەزانم، بەڵام دەنگ هەڵنابڕم!»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ **ناتەوێ**، زەردەشت؟ ڕاستە؟ لە پشت لاسارییت خۆ مەشارەوە!»

من وەک منداڵێک گریام و لەرزام و گوتم: «ئاخ، ئاشکرایە کە دەمەوێ، بەڵام چۆن دەتوانم؟ تەنیا بۆ ئەوە لێم خۆش بە! ئەمە پتر لە ڕادەی توانایی منە!»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ کێی، زەردەشت! وتەکەت بێژە و تێکی بشکێنە!»

من وڵامم داوە: «ئاخ، ئایا ئەمە وتەی منە؟ من کێم؟ من چاوەڕێی لە خۆ شیاوترم، من تەنانەت ئەوەندە شیاو نیم کە بۆ خاتری تێک بشکێم.»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ کێی! تۆ هێشتا ئەوەند کە پێویستە خۆت بەچووک دانانێی، خۆ بەچووک دانان خاوەنی ئەستوورترین پێستە.»

من وڵامم داوە: «ئەوە چیە کە پێستی خۆبەچووکدانەری من هەتا ئێستا بەرگەی نەگرتوە؟ من لە ژێر بەرزاییەکانی خۆم دەژیم. هێشتا چ کەس بە منی نەگوتوە کە بەرزایی ترۆپکەکانم چەندەن؟ بەڵام دۆڵەکانم باش دەناسم.»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «زەردەشت، کەسێک کە چیاکان ڕاگوێزێ، دۆل و دەرە و نشیوانیش ڕادەگوێزێ.»

من وڵامم داوە: وتەی من هێشتا کێوێکی ڕانەگوێزتۆتەوە و ئەوەی کە گوتوومن بە مرۆڤ نەگەیشتوون. بە ڕاستی من بۆ لای مرۆڤ چووم، بەڵام هێشتا نەگەیشتوومەوە سەریان.»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ لەوە چ دەزانی! لە بێدەنگترین کاتی شەو دایە کە ئاونگ دەکەوێتە سەر شیناوەرد.»

من وڵامم داوە: «کاتێک ڕێگای خۆم دۆزیوە و ڕۆیشتم، ئەوان بە من پێکەنین؛ بە ڕاستی ئەوەدەم پێیەکانم لەرزین.

و وەهایان بە من گوت: «تۆ ڕێگات لە بیر چۆتەوە، نووکە ڕێ ڕۆیشتنیشت لەبیر دەچێتەوە!»



ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «پێکەنینی ئەوان چیە! تۆ کەسێکی کە فەرمانبەرییت لە بیر کردوە: نووکە دەبێ فەرمان بدەی!

نازانی کە خەڵک پتر لە هەر کەسێک پێویستیان بە کێ هەیە؟ بەو کەسەی کە فەرمان بۆ کارە گەورەکان بدا.

بەجێ گەیاندنی کارە گەورەکان دژوارە: بەڵام دژوارتر لەو فەرمان دان بۆ کارە گەورەکانە.

نەبەخشراوترین شت لە تۆ دا ئەمەیە کە تۆ دەسەڵاتت هەیە و ناتەوێ فەرمان بدەی.»

من وڵامم داوە: «بۆ فەرمان دان دەنگی شێرم نیە.»

ئەودەم جارێکی دی بە سرتە بە منی گوت: «بێدەنگترین وتەکانن کە تۆفان ساز دەکەن. بیرێک کە بە ڕەوتی کۆترانەوە بێ، ڕێبەرایەتی دونیا دەکا.

زەردەشت! تۆ وەک سێبەرێک لەوەی کە دەبێ بگاتێ، دەبێ وەپێش کەوی: وەها دەبێ فەرمان بدەی و بە فەرماندەریی ڕەپێش کەوی.»

من وڵامم داوە: «من شەرمەزارم.»

ئەودەم جارێکی دی بێدەنگەکە بە منی گوت: «تۆ دەبێ ببیەوە منداڵ و بێبەری لە شەرم.

غروری لاوەتی هێشتا لە تۆ دایە؛ تۆ درەنگ بوویە لاو: بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ ببێتەوە منداڵ، دەبێ بە سەر لاوەتی خۆشی دا زاڵ بێ.»

من درێژماوەیەک دەبیرەوە چووم و لەرزام. بەڵام، لە ئاکام هەر ئەوەم گوتەوە کە لە پێشدا گوتبووم «من نامەوێ.»

ئەودەم لە ئاقارم قاقایەک لێدرا. ئای کە ئەم قاقایە چلۆن دەروونی هەڵدڕیم و دڵی دادڕیم!

بۆ دوایین جار بە منی گوت: «زەردەشت، بەرەکانت گەیشتوون، ئایا تۆ بۆ بەرەکانت نەگەیشتووی!

کەوایە دەبێ بۆ نێو تەنیایی بگەڕێیەوە: چونکە هێشتا دەبێ پێبگەی.»

جارێکی دی لە قاقای دا و هەڵات: ئەودەم بێدەنگیی دەوروبەری داگرتم،

بێدەنگییەکی دووهێندە. بەڵام من کەوتبوومە سەر زەوی و دەست و پێم شەلاڵی ئارەقە بوو.

نووکە ئێوە هەموو شتێکتان بیستوە و دەزانن کە بۆچی دەبێ بۆ نێو تەنیایی خۆم بگەڕێمەوە. هاوڕێیان، من هیچم لە ئێوە نەشاردۆتەوە.

بەڵام ئێوە ئەمەتان لە من بیست، لە کەسێک کە هێشتا کەم وێژترین مرۆڤە ـ و دەیەوێ کە وەها بێ!

ئاخ، هاوڕێیانی من، بریا دیسان شتێکم بۆ گوتن بە ئێوە پێبا، بریا دیسان شتێکم بۆ پێدانتان هەبا! بۆچ نەدەم؟ مەگەر من بەغیلم؟

کاتێک زەردەشت ئەم قسانەی کرد، رادەی ژان و دەمی دوور بوونەوە لە هاوڕێکانی وەهای لەبەر گران هات کە هۆڕهۆڕ گریا: و کەس نەیدەزانی چلۆن دڵی بداتەوە. بەڵام شەوێ تەنیا وەرێکەوت و هاوڕێکانی جێ هێشت.

# وەهای گوت زەردەشت

## بەشی سێهەم

ئێوە ئەودەم کە ئاواتەخوازی عرووجن، چاو لە سەرەوە دەکەن و من چاو لە خوارەوە ـ چونکە عرووجم کردوە.

کێ دەتوانێ لە نێو ئێوە دا هەم پێبکەنێ و هەم عرووجی کردبێ؟

ئەو کەسەی کە دەچێتە سەر ترۆپکی بەرزترین کێو، بە هەموو نمایشە غەمێنەرەکان و بە راستی بوونە غەمێنەرەکان پێدەکەنێ

**زەردەشت، بەشی یەکەم، سەبارەت بە خویندنەوە و نووسین**

## ئاوارە

نیوەشەو بوو کە زەردەشت بە سەر کێو و گردەکانی دوڕگە دا وەڕێکەوت، هەتا بۆ بەرەبەیان بگاتە بەستێنەکەی دیکەی؛ چونکە دەیەویست لەوێ سواری کەشتی بێ. ئەوێ لەنگەرگایەکی دڵڕفێن بوو کە کەشتیەکانی بێگانەش پێیان خۆش بوو لەنگەری لێبگرن و گەلێک کەسیش کە دەیانەویست لە دوڕگەکانی بەختەوەرییەوە سەفەر بکەن، سوار دەکرد. بەڵام، زەردەشت، هەروا کە بە کێو هەڵدەگەڕا، بەڕێوە بیری لە گەلێک ئاوارەیی تەنیایی خۆی لە لاوەتییەوە دەکردەوە و ئەوە کە تاکوو ئێستا چەندە کێو و گرد و ترۆپکی بڕیوە.

زەردەشت بە دڵی خۆی گوت: من ئاوارەم و شاخەوان. دەشتەکانم خۆش ناوێن و وەهام کە دەڵێی ماوەیەکی زۆر ناتوانم ئارام دانیشم.

هەر شتێکی کە وەک چارەنووس و ئەزموون بۆ لای من دێ ـ ئاوارەیی و شاخەوانییەکی بە دواوە دەبێ: مرۆڤ، لە ئاکام تەنیا هەر خۆی ئەزموون دەکا.

ئەو سەردەمەی کە رووداوەکان دەیانتوانی بەرەنگارم بن، تەواو بوو؛ ئێستا دەکرێ چیم لێ بقەومێ کە هەتا ئێستا هی من نەبووبێ!

ئەمە گەڕانەوەی ئەوە، ئەو لە ئاکام بۆ ماڵ، بۆ لای من دێتەوە: ئەو هەر خۆیی خۆمە و ئەوانەی کە هی ئەوە و درێژماوەیەک لە نێوان شتەکان و رووداوە بەربڵاوەکان دا ئاوارە بوە.

ئەمەش دەزانم کە نووکە من لە بەرابەر دوایین ترۆپکی خۆم و لە بەرابەر ئەوەی کە درێژتر لە هەموو شتێک بۆ من وەلا نرابوو، وەستاوم. ئاخ، دەبێ لە دژوارترین رێگای خۆم سەرکەوم! ئاخ، تەنیاترین ئاوەارەیی خۆم دەست پێکردوە!

بەڵام ئەوەی کە لە رەگەزی منە لە وەها دەمێک راناکا: ئەو دەمەی کە پێیدەڵێ: «نووکە تۆ پێت لە رێبازی مەزنایەتی خۆت ناوە! ترۆپک و هەڵدێر ـ نووکە بوونە یەک!

تۆ پێت لە رێبازی مەزنایەتی خۆت ناوە: ئەوەی کە بە دوایین مەترسیت



دادەندرا، نووکە بۆتە دوایین پەنات!

تۆ پێت لە رێبازی مەزنایەتی خۆت ناوە: ئەوە دەبێ گەورەترین دلێریت بێ چونکە لە پشت سەرت ئیدی رێگایەکی دیکە نیە!

تۆ پێت لە رێبازی مەزنایەتی خۆت ناوە: لێرە ئیدی کەس بە دزی بەشوێن تۆوە نابێ! پێت ئەو رێگایەی کە جێت هێشتوە دەیسرێتەوە. و لە سەر ئەم رێگایە نووسراوە: مەحاڵ!

ئەگەر لەوە بەدوا پەیژەیەک نەمابێ، دەبێ بزانی کە بە سەر سەری خۆت دا وەسەربکەوی: دەنا چلۆن دەچیە سەر؟

بە سەر سەری خۆ دا و بە سەر دڵی خۆت دا! نووکە ئەوەی کە لە تۆ دا هەرەنەرمە دەبێ ببێتە هەرەرەق!

ئەوەی کە هەمیشە خۆی زۆر دەلاوێنێتەوە، لە ئاکام لەم لاوانەوەیە نەخۆش دەبێ. بژی هەرچییەک کە رەق ساز دەکا!

من رێز لەو وڵاتە ناگرم کە شیر و هەنگوینی پێدا دەڕوا!

بۆ زۆر دیتن، چاو لە سەر خۆ هەڵگرتن پێویستە: هەر شاخەوانییەک پیویستی بە وەها سەختییەک هەیە.

بەڵام ئەو هەڵسەنگێنەرەی کە چاوێکی کەم سۆمای هەیە، جگە لە رواڵەتی شتەکان چ دەتوانێ ببینێ؟

بەڵام تۆ ئەی زەردەشت، ویستووتە کە لە بنج و بناوانی هەر شتێک بڕوانی: لەبەر ئەوە دەبێ لە خۆت وەسەرکەوی ـ سەرتر و بەرزتر، هەتا ئەو رادەیە کە هەسێرەکان بخەیە ژێر پێت!»

ئادی، ئەوەی کە من بە ترۆپکی خۆمی دادەنێم لە بەرزاییەوە روانین لە خۆ و لە هەسێرەکانی خۆیە: ئەمە هێشتا وەک دوایین ترۆپک بۆ من ماوەتەوە!

زەردەشت هەروا کە هەڵدەگەڕا وەهای بە خۆی گوت و دڵی خۆی بەم وتە سەختانە ئارام کردەوە: چونکە دڵی وەها گیرابوو کە پێشتر قەت ئاوا نەببوو و کاتێک گەیشتە بەرزایی دوڕگەکە، ئەوسا، دەریا لە بەرابەری هەڵکەوتبوو: ئەو وەستا و درەنگانێک بێدەنگ بوو. بەڵام شەو لەم بەرزاییە سارد و ساو و پڕهەسێرە بوو.

لە ئاکـام، غـەمین گـوتی: دەزانم بـەشم چیـە. ئـەهای، من ئامـادەم! هـەنووکـە دوایین تەنیاییم دەست پێکرا.

ئاخ لەو دەریا رەش و غەمبارەی ژێر پێم! ئاخ لەو شـەوە تار و نێوچاوان تاڵە! ئاخ، چارەنووس و دەریا! من بۆ لای ئێوە دەبێ داگەڕێم!

لە حاند چیای هەرە بەرز و ئاوارەیی هەرە درێژی خـۆم وەستـاوم: لەبەر ئەوە لە پێـشـدا دەبێ ئەوەندە لە قـووڵایی بچـمـە خـوارەوە کـە هـەتا ئێـسـتـا وەسـەر کەوتووم:

لەو قووڵتر لە ناخی ژانەوە رۆچم کە هەتا ئێستا وەسەر کەوتووم ـ بۆ خوار هەتا لافاوە هەرە رەشەکەی! چارەنووسم وەهای دەوێ: ئەهای! من ئامادەم.

جارێک پرسیم: چیا هەرە بەرزەکان لە کوێوە دێن؟ لە دوایی پێگەیشتم کە لە دەریاوە سەرهەڵدەدەن.

ئەم بەڵگەیە لە سـەر رەوەز و ترۆپکەکانیـان نووسـراوە. لە قـووڵتـرین جێگاوە هەرە بەرز دەبێ هەتا بەرزایی خۆی سەر هەڵدا.

وەهای گـوت زەردەشت لە سـەر کـێـو، لەو شـوێنەی کـە سـارد بوو. بەڵام کـە گەیشتە نزیک دەریا و لە ئاکام، تـەنیـا لە نێوان رەوەزەکـان وەسـتـا، لە رێ بڕین شەکەت ببوو و پتر لە جاران تامەزرۆ.

ئەو گـوتی: هێـشـتـا هەمـوو شت لە خـەو دان، دەریاش هـەروەتر. چاوەکـانی چەشنی بێگانە و مەستی خەو تێمدەڕوانن.

بەڵام هەناسەی گەرمە، هەست بە گەرماکەی دەکەم و هەست دەکەم کە خەون دەبینێ و هەروا لە خەو دا، لە سەر باڵنجە پتەوەکان جینگڵان دەدا.

گوێ بگرە! گوێ بگرە! چلۆن لە یادە ناخـۆشـەکانی دەناڵێ! یا لە چاوەڕوانیـە ناخۆشەکانی!

ئاخ، ئەی درنجی تار، منیش لە غەمت غەمینم و لەبەر تۆ لە خۆم تووڕە.

ئاخ دەستەکانم ئەوەند کە پێویستە بە هێز نین! چونکە، بە راستی، داخوازی ئەوەم کە تۆ لە خەونە ناخۆشەکانت رزگار کەم!

زەردەشت وەهای گـوت، کەنینێکی تاڵ و غـەمـباری بە خـۆی هاتێ و گـوتی:



چلۆن؟ زەردەشت! دەتەوێ بۆ دەریاش سترانێکی لاواندنەوە بێژی؟

ئاخ، ئەی شـێـتی دلاوا، زەردەشت! ئەی گـیـرۆدەی بـڕوا! تۆ هـەمـیـشـە هەروا بووی: تۆ هەمیشە بە بڕواوە لە هەر شتێکی خۆفناک نزیک بوویەوە.

تۆ هەمـیـشـە دەتەوێ هەر غوولێک بلاوێنیـەوە. هـالاوی هەناسـەیەکی گەرم و کـەمـێک مـووی سـەر پەنجـە بۆ تۆ بـەسـە هەتا بەجـارێک ئەویندار بی و هەڵیفریوێنی.

ئەوین مەترسییەکە لە بۆسـەی تەنیـاترین کـەس دا، ئەوین بە هـەر شـتێک کە بەس زیندوو بێ! بە راستی، شـێتـایەتی و خـۆ بە چووک دانانی من لە ئەوین دا شیاوی پێکەنینە!

وەهای گـوت زەردەشت و جـارێکی دی پێکەنـی؛ ئەودەم بیـری لە هاوڕێ جێ هێشتووکانی کردەوە و هەر وەک بڵێی بە بیرەکانی خەتایەکی سەبارەت بە ئەوان کردبێ، لەبەر ئەم بیرانە لە خۆی تووڕە بوو. لەپڕ وەهای لێهات کە پیاوی دەم بە پێکەنین وەگریان کەوت: زەردەشت لەبەر تووڕەیی و تاسە، هۆڕهۆڕ دەگریا.

# سەبارەت بە روخسار و پەردەک

١

کاتێک ئەم هەواڵە لە نێو سەرنشینەکانی کەشتی دا بڵاو بۆوە کە زەردەشت لە کەشتی دایە ـ چونکە هاوکات دەگەڵ ئەو پیاوێکی دانیشتووی دورگەکانی بەختەوەریش سواری کەشتی ببوو ـ پرسایی و چاوەڕوانییەکی زۆر سەری هەڵدا. بەڵام زەردەشت دوو رۆژان بێدەنگ بوو و لە غەمان سارد و کەڕ، وەها کە نە وڵامی نیگاکانی داوە و نە وڵامی پرسیارەکان. بەڵام لە ئێوارەی دووهەمین رۆژ دا، سەرەڕای ئەوە کە هێشتا بێدەنگ بوو، گوێیەکانی جارێکی دی کردەوە: چونکە لەم کەشتیە دا کە لە دوورەدەستانەوە هاتبوو و دیسان دەیەوست دوورتر بڕوا، شتگەلی سەیر و سەمەرە و پڕمەترسی شیاوی بیستن زۆر بوو. بەڵام، زەردەشت دۆستی هەموو ئەو کەسانە بوو کە دەچنە سەفەری دوورەدەستان و ناتوانن بەبێ مەترسی بژین. بڕوانە، لە ئاکام بۆ گوێ هەڵخستن زمانی کراوە و سەهۆڵی دڵی شکا؛ ئەودەم وەهای دەست بە قسە کرد:

دەگەڵ ئێوە، ئەی لێکۆڵەران و بەتاقیکەرەوە بێباکەکان و، دەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە باسپێرە ژیرەکان لە سەر دەریا بە سامەکان داژۆن ـ

دەگەڵ ئێوە، ئەی سەرمەست لە پەردەکەکان، ئەی شادخوازانی بوولێڵ، کە گیانتان بە هەوای بلوێر بۆ لای هەر گێژاوێکی فریو رادەکێشرێ ـ

چونکە ناتانەوێ بە دەستی لەرزۆک، کوێرانە بە دوای ریسێک دا بڕۆن و لەو شوێنە کە دەتوانن دڵنیا بن، لە لێکدانەوە بێزارن ـ

تەنیا بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە ئەو پەردەکی کە من دیتوومە ـ روخساری تەنیاترین پیاو.

ماوەیەک لەمەوبەر بە دڵتەنگی بە نێوان ئێوارەیەکی رەنگ مردوو دا تێدەپەڕیم ـ دڵتەنگ و شێواو، بە لێوگەلێکی رێک کوشراو. بۆ من، تەنیا هەر هەتاوێک ئاوا نەببوو.



ئاهەڕێیەک بوو کە بە لاساری وەسەر رەوەز دەکەوت، ئاهەڕێیەکی بەدخواز و تەنیا، کە ئاسەوارێک لە دڵگری گیا و چرپی بەدی نەدەکرا: ئاهەڕێیەکی کوێستانی کە لەبەر پێخوستی پێیەکانم ددانی دەچیڕەوە دەبرد.

پێم بێدەنگ بە سەر تەقەتەقی گاڵتەجاڕی تەقتەقەبەردەکان دا دەڕۆیشت و بەردە خزەکانی ورد دەکرد و وەسەردەکەوت.

بۆ سەر، بەپێچەوانەی گیانێک کە ئەوی بۆ خوار، بۆ لای هەڵدێر دەکێشا، ئەو «گیانقورسی» شەیتانی من و سەرووی دوژمنەکانم.

بۆ سەر، سەرەڕای ئەوە کە ئەو سواری من ببوو، نیوەی گوڕنی، نیوەی جرجەمشک، گردەنشین و گردەنشینکەر و؛ سوربی دەگوێم دەتکاند و بیروڕای سوربی دەمێشکم.

بە پرتە و بۆڵە، ئارام ئارام، چرپاندی: «ئەی زەردەشت، ئەی بەردی فرەزانی! تۆ خۆت بۆ سەر هاویشتوە. بەڵام هەر بەردێکی هاویشتراو دەبێ ـ داکەوێ!

ئەی زەردەشت، ئەی بەردی فرەزانی! ئەی بەردی قەڵماسەنگ! ئەی هەسێرەشکێن! تۆ خۆت وەها بۆ سەرەوە هاویشتوە. بەڵام هەر بەردێکی هاویشتراو دەبێ ـ داکەوێ!

«تۆ خۆت بە بەردەباران کردن بە دەستی خۆ مەحکووم کردوە: ئەی زەردەشت، تۆ، بە راستی، بەردەکەت دوور هاویشتوە؛ بەڵام ئەم بەردەش بە سەر تۆ دا ـ دادەکەوێ!»

ئەوسا گوڕنی بێدەنگ بوو؛ و ئەم بێدەنگییە ماوەیەکی خایاند. بەڵام ئەم بێدەنگییە قورسایی لە سەر دەکردم. بە راستی، لە وەها پێکەوە بوونێک دا مرۆڤ لە تەنیا بوون تەنیاترە.

چوومە سەر و چوومە سەر، خەونم دیت و بیرم کردەوە ـ بەڵام هەموو شتێک قورسایی لە سەر دەکردم. وەک نەخۆشێک بووم کە عەزابی بە سامی لە کەلکی خستبێ و جارێکی دی خەونێکی ناخۆشتر ئەوی لە خەو راپەڕاندبێ.

بەڵام شتێک لە من دایە کە بوێریی پێدەڵێم: ئەو هەتا ئێستا هەر دڵ ژاکاوییەکی منی کوشتوە. ئەم بوێرییە لە ئاکام فەرمانی پێدام کە بوەستم و بڵێم: «گوڕنی! یا تۆ! یا من!»

بەڵام، بوێریی مەزنترین کوشتارگەرە. بوێریی هەر ئەوەیە کە هێرش دەبا و لە هەر هێرشێک دا هەوای دەهۆڵ و کەڕەنای بەرز دەبێتەوە.

بەڵام، مرۆڤ بوێرترین گیانلەبەرە: ئەو بەم بوێرییە بە سەر هەر گیانلەبەرێک دا زاڵ بوە. بە هەوای دەهۆڵ و کەڕەنا بە سەر هەر دەردێک دا زاڵ بوە؛ بەڵام دەردی مرۆڤ قووڵترین دەردە.

بوێریی سەرەگێژەی سەر هەڵدێرەکانیش دەکووژێ. و لە کوێیە کە مرۆڤ لە سەر هەڵدێرەکان نەوەستابێ؟ مەگەر دیتن هەر هەمان ـ دیتنی هەڵدێر نیە؟

بوێریی مەزنترین کوشتارگەرە؛ بوێریی بەزەییش دەکووژێ. بەڵام، بەزەیی قووڵترین هەڵدێرە. هەر چی مرۆڤ قووڵتر لە ژیان بڕوانێ، قووڵتر لە رەنجی روانیوە.

بەڵام، بوێریی مەزنترین کوشتارگەرە، بوێرییەک کە هێرش دەبا، کە مەرگیش دەکووژێ، چونکە دەڵێ: «هەر ئەمە بوو ژیان؟ کەوایە، جارێکی دیش!»

بەڵام لەوەها وتەیەک دا گەلێک هەوای دەهۆڵ و کەڕەنا هەیە. ئەوەی کە گوێیەکی هەیە، بیبیسێ.

## ۲

گوتم: «بوەستە! گوڕنی! یامن! یا تۆ! بەڵام من لە تۆ بە هێزترم: تۆ بیری هەڵدێریی من ناناسی! باری ئەو بە تۆ هەڵناگیرێ!»

ئەودەم سووکتر بووم: چونکە گوڕنی بە قوتی لە سەر شانم بازدی دا و لە سەر گابەردێک بەرابەرم هەڵکورما. بەڵام دروست هەر لەو شوێنەی کە ئێمە وەستابووین دەروازەیەکی لێبوو.

درێژەم بە قسەی خۆم دا و گوتم: «گوڕنی! چاو لەم دەروازەیە بکە! دوو رووی هەیە؛ دوو رێگا لێرە دەگەنەوە یەک: و هیچکەس تاکوو ئێستا هەتا بنەبانی ئەوان نەڕۆیشتوە.

ئەم کۆڵانە درێژەی کە بۆ دواوە دەچێ و هەتا ئەبەد دەخایەنێ و ئەو کۆڵانە



درێژەی کە بۆ پێشەوە دەچێ ـ ئەبەدییەتێکی دیکەیە.

ئەم دوو رێگایە دژی یەکدین و سەرەکانیان لێک دەکوتن ـ و لێرە لەبەر ئەم دەروازەیەیە کە پێک دەگەن. ناوی دەروازەیان لە سەر دەرگا ئاوا نووسیوە: «سات».

بەڵام ئەگەر کەسێک یەکێک لەوان بگرێتە بەر و هەر دوورتر و دوورتر بڕوا، ئایا تۆ، ئەی گوڕنی، پێت وایە کە ئەم دوو رێگایە هەتا ئەبەد هەر دژی یەک دەبن؟»

گوڕنی، بە تەوسەوە، بە ورتە گوتی: «هەرچییەک کە راستە درۆ دەکا، راستەقینە هەمووی خواروخێچە، زەمان خۆی جەغزێکە.»

دەرهەڵبووم و گوتم: «ئەی گیانقورسی! ئەمە وا سانا لە سەر خۆت مەگرە! دەنا تۆ هەر لەو شوێنەی کە بە پێی شەلەوە هەڵکورماوی، بە هەڵکورماوی بە جێ دێڵم ـ چونکە من بووم کە تۆم هێنا سەر.»

درێژەم بە قسەی خۆم دا و گوتم: «ئەم ساتە بڕوانە! لە دەروازەیەک کە ئەم ساتەیە کۆڵانێک هەتا ئەبەد بەرەو دواوە دەڕوا: لە پشت سەری ئێمە ئەبەدیەتێک هەڵکەوتوە.

ئایا نابێ هەرچییەک کە دەتوانێ بڕوا، بەرلەمە لەم کۆڵانە تێپەڕیبێ؟ ئایا نابێ هەرچییەک کە دەتوانێ بقەومێ، بەرلەمە قەومابێ، کرابێ، تێپەڕیبێ؟

ئەگەر هەموو شتێک بەرلەمە بوە، ئەی گوڕنی، بۆ ئەم ساتە دەڵێی چی؟ ئایا نابێ ئەم دەروازەیە بەرلە ئێمە ـ بووبێ؟

ئایا هەموو شتێک مەگەر وەها توند لێک گرێ نەدراون کە ئەم ساتە هەموو شتەکانی داهاتوو بە دوای خۆی دا دەکێشێ؟ و لەبەر ئەمە ـ خودی خۆشی؟

کەوایە، ئەوەی کە دەتوانێ تێپەڕێ، دەبێ جارێکی دیکە لەم کۆڵانە درێژە ـ تێپەڕێ!

ئەم جاڵجاڵۆکە شلڕەوە کە لە ژێر تریفە دا دەخزێ و خودی ئەم تریفەیە، من و تۆ کە لەبەر ئەم دەروازەیە لە شتگەلی هەرمان دەدوێین ـ ئایا نابێ هەموومان بەرلەمە لێرە بووبین؟

و گەڕابێینەوە و لەو کۆڵانەی دیکە کە لە بەرەو رووی ئێمەیە، تێپەڕیبێین، لەم

کۆڵانە درێژە سامناکە ـ ئایا نابێ ئێمە بە نەمری بگەڕێینەوە؟»

وەهام گوت و هەردەم ئارامتر: چونکە خۆم لە بڕواکانم و نهێنی بڕواکانم هەراسم تێکەوتبوو. ئەودەم لەپڕ بیستم کە سەگێک لەو نزیکانە دەلووڕێنێ.

ئایا قەت وەها لوورەیەکم بیستبوو؟ بیرم بەرەو دواوە رای کرد! ئادی! بۆ سەردەمی منداڵیم، بۆ دوورەدەستترین منداڵەتیم ـ

ئەودەم وەها لوورەیەکم لە سەگێک بیستبوو، و ئەویشم دیبوو، موو زیک، سەر بەرز کردوو، لەش لەرزۆک، لە بێدەنگترین نیوەشەو دا ـ ئەودەم کە سەگەکانیش بڕوایان بە هەبوونی تاپۆکان هەیە ـ

وەها دڵم پێی سووتا. چونکە، ئەودەم مانگی تەواو، بە بێدەنگییەکی مەرگاسا، لە سەر ماڵ هەڵاتبوو و ئەودەم، وەک تەبەقێکی درەوشاوە، ئارام وەستابوو، ئارام لە سەر بانێکی تەخت، وەک کەسێک کە لە سەر مڵکێکی بێگانە وەستابێ ـ

هەر ئەوەش سەگی ترساندبوو؛ چونکە سەگ ئیمانیان بە هەبوونی تارمایی و تاپۆکان هەیە. کاتێک جارێکی دیکە وەها لوورەیەکم بیست، جارێکی دیکە دڵم پێی سووتا.

نووکە بۆ کوێ چووبوون؟ گوڕنی؟ دەروازە؟ جاڵجاڵۆکە و ورتەکان؟ ئایا خەونم دیتبوو؟ ئایا وەخەبەر هاتبووم؟ لەپڕ دیتم کە لە نێوان رەوەزە دڕەکان دا، تەنیا و هەڵوەدا، لە هەڵوەداترین مانگەشەو دا وەستاوم.

**بەڵام مرۆڤێک لەوێ کەوتبوو!** و ئەوەتا سەگەکە، موو زیک، بە هەڵبەز هەڵبەز و بە مڕەمڕ. ئێستا منی دەدیت کە دەهاتم ـ ئەودەم دیسان لووراندی، ئەوسا نووزاندی. ئایا قەت بیستبووم کە سەگێک ئاوا بە نووزەوە داوای یارمەتی بکا؟

بە راستی، شتێکی وەهام دیت کە قەت هاوتاکەیم نەدیبوو. شوانێکی لاوم لە ئاویلکەدان دا دیت، بە هەناسەبڕکە، خۆ لەبەر ژان گڕمۆڵە کردوو، بە سیمایەکی تێکچڕژاو و مارێکی قەف ئەستووری رەش لە زاری شۆڕ ببۆوە.

ئایا قەت ئەو هەمووو بێز و سامی رەنگ بزڕکاوم لە سەر سیمایەک دیتبوو؟ لەوانەیە ئەو لە خەو دا بوە کە مار دە گەرووی خزاوە و ددانی بە توندی لێ گیر کردوە.



دەستم ماری کێشا و کێشای: بەڵام بێکەلک بوو! دەستم نەیدەتوانی مار لە گەرووی دەرکێشێتەوە. ئەوسا هاوارێک لە دەروونم هاتە دەر: «قەپی لێداگرە! قەپی لێداگرە!»

«سەری هەڵکەنە! قەپی لێداگرە!» ـ وەها هاوارێک لە دەروونم هاتە دەر. ترسم، رقم، بەزەییم، بێزم، گشت چاکە و خراپەم هاوهاوار لە دەروونم هاتنەدەر.

ئەی دلێرانی دەوروبەرم! ئێوە ئەی لێکۆڵەران و تاقیکەرەوەکان و ئەی ئەو کەسانەی لە نێو ئێوە دا باسپێرە ژیرەکان لە سەر دەریا نەدیتراوەکان داژۆن، ئێوە ئەی سەرمەست لە پەردەکەکان!

بۆم رەها بکەن پەردەکێک کە ئەودەم دیتم. بۆم مانا بکەنەوە روخساری تەنیاترین کەس!

چونکە ئەمە روخسارێک و پێشبینییەک بوو: چ بوو ئەوەی کە من بۆ کینایە دیتم؟ کێیە ئەو کەسەی کە دەبێ رۆژێک سەر هەڵبدا؟

کێیە ئەو شوانەی کە مار ئاوا لە گەرووی خزابوو؟ کێیە ئەو مرۆڤەی کە ئەوەی کە قورسترین و رەشترینە ئاوا لە گەرووی دەخزێ؟

بەڵام، شوان قەپی داگرت، هەر ئەوجۆرەی کە هاوارم رێی چارەی پێگوتبوو، ئەویش چ قەپێک! و سەری ماری بۆ دوور تف کرد ـ و هەستا سەر پێ.

ئیدی نە شوان بوو و نە مرۆڤ ـ گۆڕاو و نوورانی و بە پێکەنین! قەت لە سەر زەوی وەها مرۆڤێکی بە پێکەنینم نەدیتبوو کە ئەو پێدەکەنی!

برایان، پێکەنینێکم گوێ لێبوو کە پێکەنینی مرۆڤانە نەبوو ـ نووکە تینوایەتییەک من دەخوا، تامەزرۆییەک کە هێچکات ئارام ناگرێ.

تامەزرۆیی ئەم پێکەنینە من دەخوا: ئاخ، نووکە چلۆن بەرگەی ژیان دەگرم! چۆن بەرگەم گرت کە نووکە بمرم!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە بەختەوەری داوانەکراو

زەردەشت بەو پەردەک و دڵ گیراوییانەوە، بە سەر دەریا دا سەفەری دەکرد. کاتێک چوار رۆژ لە دوورگەکانی بەختەوەری و لە هاورێکانی دوور بۆوە، بە سەر گشت دەردەکانی خۆی دا زاڵ بوو و سەرکەوتوانە و بە پێیەکی قایم جارێکی دی لە سەر چارەنووسی خۆی وەستا و ئەودەم بە ویژدانی شادی خۆی وەهای گوت:

جارێکی دی تەنیام و دەمەوێ کە وەها بم، تەنیا دەگەڵ ئاسمانی ساو و دەریای هەراو؛ جارێکی دی ئێوارە دایگرتووم.

یەکەم جار رۆژێک لە ئێوارە دا بوو کە هاورێکانم دیتەوە، جاری دووهەمیش ئێوارە بوو: لەودەمە دا کە شۆقەکان گشتیان ئارامتر دەبنەوە.

چونکە ئەوەی کە لە بەختیاری دا هێشتا لە نێوان زەوی و ئاسمان دا بەرێوەیە، نووکە لە رەوانێکی نوورانی دا لە هێلانەیەک دەگەڕێ: لە حاند بەختیاری دا شۆقەکان هەموو ئارامتر بوون.

ئەی ئێوارەی ژیانم! بەختیاری منیش رۆژێک بەرەو دۆڵەکان داگەڕا هەتا هێلانەیەک بدۆزێتەوە: و لەوێ ئەم گیانە ئاوەڵە میوانگرانەی دیتەوە.

ئەی ئێوارەی ژیانم! من بۆ وەدەست خستنی ئەم تاکە شتە چ ماوە کە داینەنێم: بۆ دەست خستنی ئەم نەمامستانەی برواکانم و شۆقی ئێوارەی بەرزترین هیواکانم!

ئافرێنەر رۆژێک لە دۆستانی خۆ و لە منداڵانی هیواکانی خۆی دەگەڕا: بروانە! ئەو پێیوابوو کە ناتوانێ ئەوان بدۆزێتەوە، مەگەر ئەوە کە لە پێشدا بۆ خۆی ئەوان بافرێنێ.

لەبەر ئەوە من لە نیوەی کاری خۆ، لە حاڵی هاتوچۆ و گەڕانەوە لە لای منداڵەکانی خۆمم. لەبەر خاتری منداڵەکانی زەردەشت دەبێ خۆی پێبگەیەنێ.

چونکە مرۆڤ هێشتا بەگیان و دڵ تەنیا ئەوینداری منداڵەکان و کاری خۆیەتی؛ و لەو شوێنەی کە ئەوینی گەورە بە خۆ هەبێ نیشانەی ئاوس بوونە: من وەهام دیوە.

منداڵەکانم هێشتا لە شینایی یەکەم بەهاری خۆیان دان. دارەکانی باغ و



باشترین خاکم، لە پەنا یەک وەستاون و وێکڕا لەبەر بایەکان دەلەرزێنەوە.

بە راستی، دوورگەکانی بەختەوەری ئەو شوێنەن کە وەها دارگەلێک لە پەنا یەکدی وەستاون. بەڵام بە تەمام کە رۆژێک ئەوان هەڵکەنم و هەر کامیان بە تەنیا بچەقێنم هەتا تەنیایی و لاساری و دووربینی فێر بن.

ئەو قەف لە سەر قەف و چەماو، بە پتەوییەکی پڕ لە نەرمی، وەک فانووسێکی دەریایی زیندوو لە ژیانێکی کۆڵنەدەرانە، لە بەستێنی دەریا دەوەستێ.

ـ لەو شوێنە کە تۆفانەکان خۆ بە دەریا دادەدەن و لمبۆزی کێو، ئاو دەخواتەوە. لەوێ هەر کام لەوان سەردەمێک شەو و رۆژ چاوەدێری دەکەن هەتا تاقی کردنەوە و ناسینەوەیان تێپەڕ بکەن.

لەبەر ئەوە دەبێ تاقی بکرێتەوە و بناسرێ هەتا روون بێتەوە کە لە رەگەز و رەچەڵەکی منە یا نا ـ یانی، خاوەنی ورەیەکی پشوودرێژ، بێدەنگ تەنانەت لە کاتی قسە کردن دا، وەها بەخشێنەرێک کە بە پێدان دەستێنێ:

ـ هەتا ئەوەکە ئەو رۆژێک ببێتە هاودەمی من و هاورێی زەردەشت لە رۆژی ئاسایی و جەژن دا، کەسێکی وا کە بۆ پێگەیاندنی پتری هەر شتێک ویستی من لە سەر دەپەکانم دەنووسێ.

من لەبەر ئەو و هاوتاکانی ئەو دەبێ خۆ پێبگەیەنم. هەر بۆیە، نووکە بۆ دوایین تاقی کردنەوە و ناسینەوەی خۆ لە بەختیاری خۆم خۆ دەکێشمەوە، خۆم دەکێشمەوە و خۆم پێشکەشی گشت بێبەختییەک دەکەم.

بە راستی، کاتی رۆیشتن داهاتبوو کە سێبەری ئاوارە و درێژترین سات و بێدەنگترین سەعات ـ هەموو بە منیان گوت: «کاتە، کات!»

با بە کونی قفڵ دا هەڵیکردە سەرم و گوتی «وەرە!» دەرگا فێڵەزانانە لە سەر من کراوە و گوتی «برۆ!»

بەڵام من لەوێ بە ئەوینی منداڵەکانم زنجیر کرابووم: حەز ئەم داوەی بۆ نابوومەوە، حەزی ئەوین، ئەم حەزە کە فەدای منداڵەکانی خۆم بم و خۆمیان بۆ بەخت بکەم.

حەز ـ هەنووکە بۆ من واتە: خۆ بەخت کردن . چونکە من ئێوەم هەیە، منداڵەکانم! و لەم «ویستە» دا دەبێ هەموو شت متمانە بێ و حەزیش هیچ ـ

بەڵام، هەتاوی ئەوینم، کورک لە سەر من هەڵنیشتبوو؛ زەردەشت لە شیلەی خۆی دا دەکوڵا ـ کە سێبەر و گومانەکان بە بان سەرم دا فڕین و تێپەڕین.

تاسەی سەهۆڵبەندان و زستانم هەبوو و ئاخم هەڵدەکێشا: «بریا سەهۆڵبەندان و زستان جارێکی دیکە منیان وە لەرزەلەرز و کرەکرِ دەخست» ئەوسا مژێکی سەهۆڵینم لێ بەرز دەبۆوە.

رابوردووم گۆڕەکانی خۆی داوە و گەلێک دەردی زیندەبەگۆڕ لە خەو هەستان: ئەو دەردە لە کفن پێچراوانەی کە تەنیا خەویان لێکەوتبوو.

وەها هەموو شتێک بە ئاماژەکانیان بانگیان کردم: «کاتە!» بەڵام من نەمدەبیست: هەتا ئەوە کە هەڵدێرم جووڵاوە و بیرم پێوەی دام.

ئاخ، ئەی بیر و باوەڕی هەڵدێریی، ئەی ئەوە کە بیری منی! کەی وەها هێزێکم دەبێ کە دەنگی رەهەند لێدانت ببیسم و ئیدی لەرزم تێنەکەوێ؟

کاتێک دەنگی رەهەند لێدانت دەگاتە گوێم، دڵم هەتا گەرووم لێدەدا! بێدەنگی تۆش دەیەوێ بمخنکێنێ؛ بێدەنگی تۆ ئەی بێدەنگ هەڵدێر!

هەتا ئێستا قەت نەموێراوە کە تۆ بەرەو سەروو بانگ بکەم: ئەوەندەم بەسە کە تۆم دەگەڵ خۆم داکێشاوە. هەتا ئێستا بۆ دوایین بوێریی و بەدفەڕیی شێراسا ئەوەند کە پێویستە بە هێز نەبووم.

قورساییت هەمیشە ئەوەند کە پێویستە بە سام بوە. بەڵام رۆژێک ئەو هێز و ئەو نەڕەی شێرانە دەبینمەوە کە تۆ بۆ سەر بانگ دەکەن!

ئەودەم کە لەم کارە دا بە سەر خۆم دا زاڵ بم، لە گەورەتر لەمەش دا بە سەر خۆم دا زاڵ دەبم و سەرکەوتنێک پێگەیشتنم مۆر دەکا.

لەم نێوە دا هێشتا لە سەر دەریا نادیارەکان داژۆیم. کارەساتی خۆرێکخەر زمانلووسیم دەگەڵ دەکا. دەڕوانمە پاش و پێشم ـ بەڵام هێشتا کۆتاییەک نابینم.

هێشتا کاتی دوایین جەنگم دانەهاتوە ـ یا لەوانەشە ـ ئێستا خەریکە دابێ؟ بە راستی، دەوراندەورم دەریا و ژیان بە جوانییەکی ئەفسووناوی تێمدەڕوانن!

ئەی ئێوارەی ژیانم! ئەی بەختیاری بەر لە ئێوارە! ئەی لەنگەرگای دەریای ئازاد! ئەی ئەهوەنی لە کاتی ناهێمنایەتی دا! چەندە گومان لە هەمووتان دەکەم!



بە راستی، لە جوانی ئەفسووناوی ئێوە بە گومانم! وەک ئەویندارێک دەچم کە لە بزەی زۆر نازدارانە بە گومانە.

منیش هەروەک ئەویندارێکی دڵ پیس کە دڵداری لە خۆ دەتارێنێ و سەرەڕای تووڕەیی نەرمە، ئەم ساتە پیرۆزە لە خۆم دەتارێنم.

دوور کەوە ئەی ساتی پیرۆز! بەختەوەری داوانەکراو دەگەڵ تۆ هاتە لای من! من لێرە بە ویستی خۆم بۆ هەڵکێشانی قووڵترین رەنجی خۆم وەستاوم: تۆ بێوەخت هاتووی!

دوور کەوە ئەی ساتی پیرۆز! وا باشترە لەوێ، لای منداڵەکانم هێلانەی دانێی! زووکە! بەر لە ئێوارە بە بەختیاری من ئەوان شاد بکە!

هەر ئێستا ئێوارە دادێ: هەتاو دەپەڕێ. دوور کەوە بەختیاری من!

وەهای گوت زەردەشت و سەراسەری شەو چاوەڕێی بێبەختی خۆی بوو: بەڵام چاوەڕوانییەکەی بێسوود بوو. شەو ساو و ئارام ماوە و بەختیاری لەو نزیک و نزیکتر بۆوە. لای بەیانی زەردەشت لە دڵی دا پێکەنی و بە تەوسەوە گوتی: «بەختیاری وەدوای من دەکەوێ. چون ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە من وەدوای ژنان ناکەوم. بەڵام بەختیاریش ژنە.»

## بەر لە ئەنگووتنی هەتاو

ئەی ئاسمان کە لە بان منی! ئەی پاک! ئەی قووڵتر! ئەی هەڵدێری نوور! کە دەڕوانمە تۆ لە تاسەکانی خودایی وەلەرزە دەکەوم.

قووڵایی من ـ خۆ ئاویتنە نێو بەرزایی تۆیە! بێگوناهی من ـ خۆشاردنەوە لە پاکی تۆ دایە.

هەر ئەوجۆرەی کە جوانییەتی خودا ئەو دادەپۆشێ، تۆش هەسێرەکانت وەها دەشاریەوە. قسە ناکەی و بەمجۆرە من لە فرەزانیت ئاگادار دەکەی.

ئەمرۆ، بێزمان بە سەر دەریای بەگوڕ دا بۆ من هەڵاتی و ئەوین و شەرمت بۆ

رەوانی بەگوڕم دەرکەوت.

ئەمە کە تۆ بۆ لای من دەهاتی، داپۆشراو بە جوانی خۆت، ئەمە کە تۆ بێزمان قسە دەگەڵ من دەکەی، ئاشکرا لە فرەزانی خۆ دا:

ئای، چلۆن دەبێ کە پەی بە تەواوەتی ئەوەی کە لە رەوانی شەرمنت دایە، نەبەم! تۆ بەر لە هەتاو بۆ لای من هاتی، بۆ لای تەنیاترین.

ئێمە لە سەرەتاوە ئاواڵی یەکدی بووین: مەینەت و ناخۆشی و زەوی هی هەر دووی ئێمەیە: هەتاویش هی هەردووکمانە.

ئێمە دەگەڵ یەک قسە ناکەین، چونکە زۆر دەزانین: ئێمە دەگەڵ یەک بێدەنگین، ئێمە زانایی خۆمان دەگەڵ یەک بە بزەوە دەدرکێنین.

ئایا تۆ شۆقی ئاگری من نی؟ ئایا تۆ رەوانێکت نیە کە خوشکی روانگەی من بێ؟

ئێمە گشت شتێک بە یەکەوە فێر بووین؛ بە سەر خۆمان دا بۆ لای خۆمان سەرکەوتن و بەبێ هەور، وە بزە هاتن بە یەکەوە فێر بووین ـ

بەبێ هەور وە بزە هاتن بە خوارەوە لە چاوە گەشەکانەوە و لە فەرسەخگەلێکی دوورەوە، ئەودەم کە لە ژێر پێی ئێمە زەخت و ئامانج و گوناه وەک باران هەڵم دەکا.

لە ئاوارییەکانی تەنیاییم، رەوانم لە شەوان و لاڕێیەکان دا برسی چ بوو؟ لە کێو هەڵگەڕانەکانم دا هەمیشە جگە لە تۆ لە کێوەکان دا لە کێ دەگەڕام؟

ئاوارییەکان و شاخەوانیەکانم هەمووی هەر نیازێک بوون و دەرمانی داماوییەکان: تەنیا شتێک کە بە هەموو ویستمەوە دەمەوێ، هەڵفڕینە، هەڵفڕین بۆ نێو تۆ!

قەت لە چ کەسێک پتر لەو هەورە سەرگەردانانەی کە تۆ پەڵەدار دەکەن، بێزار بووم؟ و لە بێزاری خۆشم بێزار بووم، چونکە پەڵەداری دەکردی!

دوژمنی هەورە سەرگەردانەکانم، دوژمنی ئەم گورپە رفێنەر و بە پەنامەکیانە: چونکە ئەوەی کە هی هەردووکمانە ئەوان لە تۆ و لە منی دەستێنن: ئادی و ئامین گوتنی زۆر و زەوەند.



ئێمە دەگەڵ ئەم دەلاڵ و تێکەڵکەرانە دوژمنین، دەگەڵ ئەم هەورە سەرگەردانانە: ئەم ناتەواوانەی کە نە بەدڵ وبەگیان ئافەرین گوتن فێر بوون و نە تووک لێکردن.

لە نێو کووپەیەک دا لە ژێر ئاسمانی بەستراو دا دانیشتن بۆ من خۆشترە، لە چاڵێکی بێ ئاسمان دا دانیشتن بۆ من خۆشترە هەتا تۆ، ئەی ئاسمانی ساو، بە هەورە سەرگەردانەکانەوە پەڵەدار دیتن!

وابوە کە ئاواتم ئەوە بوە کە بە هەودا زێڕنەکانی برووسک هەڵکوتمە سەریان هەتا وەک هەورەتریشقە، لە سەر بۆشکەی زگەکانیان دەهۆڵ بکوتم:

ـ وەک دەهۆڵ کوتێکی تووڕە، چونکە ئەوان «ئادی!» و «ئامین!»ی تۆم لێدەرفێنن، تۆ ئەی ئاسمان کە لە بان منی، تۆ ئەی پاک! ئەی نوورانی! ئەی هەڵدێری نوور ـ چونکە ئەوان «ئادی!» و «ئامین!»ی من لە تۆ دەرفێنن.

چونکە من گرمە و هەورەتریشقە و تووکەکانی تۆفانم لەم ئارامییە بە پەنامەکییە و دوودڵانە گورپەئاسایە پتر خۆش دەوێن. و لە نێو مرۆڤیش دا لە کاسەلێس و ناتەواوان و هەورە سەرگەردانەکانی دوودڵی داماو بێزارم.

«ئەوەی کە ئافەرین گوتن نازانێ، لە سەری پێویستە کە تووک لێکردن فێر بێ!» ـ ئەم ئامۆتە رووناکە لە ئاسمانی رووناک بۆ من داکەوت. ئەم هەسێرە لە شەوانی تاریش دا بە ئاسمانی منەوەیە.

بەڵام، من ئافەرین وێژم و ئادی بێژ، ئەودەم کە تەنیا تۆ لە دەوروبەرم بی، تۆ ئەی پاک! ئەی نوورانی! ئەی هەڵدێری نوور! ـ ئەودەم ئادی بێژی ئافەرین وێژی خۆم بۆ گشت هەڵدێرەکان دەبەم.

بوومە ئافەرین وێژێک و ئادی بێژێک: و بۆ ئەمە گەلێک زۆرەبانیم گرتوە و زۆرانباز بووم هەتا ئەوە کە رۆژێک دەستەکانم بۆ ئافەرین گوتن ئازاد بکەم.

بەڵام ئەمەیە ئافەرین گوتنی من: لە سەرووی هەموو شت وەستان، وەک ئاسمانەکەی، وەک بانە خڕەکەی، وەک گومبەزی شین و ئەهوەن و هەرمانەکەی. خۆزگەم بەوەی کە وەها ئافەرین دەبێژێ!

چونکە شتەکان گشتیان لە کانیاوی هەرمان و لەوپەڕی چاکە و خراپە دا تەعمید دراون؛ بەڵام چاکە و خراپە خۆیان جگە لە سێبەرگەلێکی تێپەڕ و

مەینەتگەلێکی شێدار و هەورگەلێکی ئاوارە نین.

بە راستی ئەمە ئافەرین گوتنە نە کوفرویژی، ئەگەر من فێربکەم: «ئاسمانی پێشهات، ئاسمانی بێگوناهی، ئاسمانی هەڵکەوت، ئاسمانی بوێریی، لە سەرووی گشت شت وەستاوە.

«هێژا هەڵکەوت» ـ ئەمە کۆنترین ئەشرافی دونیایە کە من ئەوم بە هەموو شتەکان داوەتەوە؛ من ئەوانم لە بەردەیی ئامانج رزگار کردوە.

من ئەم ئازادی و شادی ئاسمانم وەک گومبەزێکی شین لە بان سەری هەموو شتێکەوە داناوە، چونکە فێرم کردن کە لە بان و لە دەروونی ئەوان دا هیچ «ویستێکی ئەزەلی» ـ حوکم ناکا.

من ئەم لاساری و ئەم شێتایەتییەم لە جیات ئەو ویستە دانا، چونکە فێرم کردن کە: «لە گشت شت دا مەحاڵێک هەیە: و ئەویش عەقڵانیەتە!»

بێشک، لە هەسێرەیەکەوە بۆ هەسێرەیەکی دی هەندێک عەقڵ، تۆمێک لە عەقڵ، پرژاوە ـ ئەم هەوێنە دەگەڵ گشت شت ئاوێتە بوە: لەبەر شێتایەتی، عەقڵ ئاوێتەی گشت شت بوە!

هەر دەم هەندێک عەقڵ دەگونجێ؛ بەڵام من ئەم باوەڕە پیرۆزەم لە گشت شت دا دیتوە کە شتەکان گشتیان پێیان خۆشە کە بە پێیەکانی پێشهات ـ سەما بکەن.

ئەی ئاسمان کە بان سەری منی، ئەی پاک! ئەی بەرز! پاکیی تۆ بۆ من نووکە لەمە دایە کە هیچ جاڵجاڵۆکەیەکی هەرمان و تەونۆکەی جاڵجاڵۆکەیەک لە عەقڵ دا لە ئارا دا نیە:

ـ کە تۆ مەیدانی سەمایەکی بۆ پێشهاتەکانی خودایی، کە تۆ تەختەنەردێکی بۆ نەردێن و کایەکەرانی خودایی!

بەڵام تۆ ئەوە خەریکە سوور هەڵدەگەڕێی؟ ئایا من لە نەگوتراوەکان دوام؟ ئایا ئەودەم کە تەمای ئافەرین گوتنی تۆم هەبوو، کوفرم کرد؟

یا شەرمی پێکەوە بوونمانە کە تۆی سوور هەڵگەڕاندوە ـ دەفەرمووی کە برۆم و بێدەنگ بم، چونکە رۆژ خەریکە دادێ؟

دونیا قووڵە: و قووڵتر لەوەی کە رۆژ بە بیری دا هاتبێ. گشت شتێک دەگەڵ



رۆژ نابێ بێنیە سەر زمان. بەڵام، رۆژ دادێ: وەرە نووکە لێک جیا بینەوە!

ئەی ئاسمان کە لە بان سەری منی، ئەی شەرمن! ئەی گڕگرتوو! ئەی شادیهێنەری من بەر لە ئەنگووتنی هەتاو! رۆژ دادێ: وەرە نووکە لێک جیا بینەوە!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە ئاکارباشی بە چووکدانەر

### ١

کاتێک زەردەشت جارێکی دی پێی لە سەر زەوی رەقەن دانا، یەکڕاست بۆ کوێستان و ئەشکەوتەکەی خۆی نەچۆوە، بەڵکەم گەلێک رێگای بڕی و گەلێک پرسیاری کرد و لەم و لەو هەواڵی وە چنگ خست، وەها کە بە تەوسەوە سەبارەت بە خۆی گوتی: «بڕوانە رووبارێک کە بە گەلێ پێچ و خەمەوە بەرەو سەرینچاوەی خۆی دەگەڕێتەوە!» چونکە دەیەویست لە نزیکەوە بە تاقی کاتەوە کە لەم نێوە دا مرۆڤ چی بە سەر هاتوە: ئاخۆ گەورەتر بوە یا چووکتر. جارێک ریزەماڵێکی تازە سازکراوی چاو پێکەوت، سەری سوڕما و گوتی:

«ئەم ماڵانە چ مانایەکیان هەیە؟ بە راستی، هیچ رووحێکی گەورە ئەوانەی مینا وێنەیەک لە خۆی ساز نەکردوە!

لەوانەیە منداڵێکی نەفام ئەوانەی لە سندووقی لەیستۆکەکانی دەرهێنابێ؟ خۆزیا منداڵێکی دیکە ئەوانەی دیسان لە سندووقەکەی خۆی ناباوە!

ئەم ژوورانەی خەو و دانیشتن، ئایا پیاوەکان دەتوانن هاتوچۆی تێدا بکەن؟ دەڵێی ئەوانەیان بۆ بووکۆڵە هەوریشمییەکان یا بۆ پشیلە چڵێسەکان کە حەز لە چڵێسی لە خۆشیان دەکەن، ساز کردوە.»

زەردەشت وەستا و وچانی گرت. لە ئاکام غەمین گوتی: «هەموو شت چووکتر

بۆتەوە!

لە گشت شوێنێک دەرگاکان نەوی دەبینم: ئەوەی کە لە رەگەزی منە هێشتا دەتوانێ پێیان دا تێپەڕێ ـ بەڵام دەبێ خۆی دانەوێنێ!

کاتێک بۆ زێدی خۆم بگەڕێمەوە، لەوێ ئیدی نابێ خۆ دانەوێنم ـ لەمە پتر نابێ لە ئاست بچووکەکان دا دابێمەوە!» زەردەشت ئاخێکی هەڵکێشاو لە دوورەدەستان راما.

بەڵام هەر ئەو رۆژە وتاری خۆی سەبارەت بە ئاکارباشی بە چووکدانەر دەربڕی.

**٢**

بە نێوان ئەم خەڵکە دا تێدەپەڕم و چاوەکانم ئاوەڵە دێڵمەوە؛ ئەوانە لەوەی کە ئێرەیی بە زانایییان نابەم، لێم خۆش نابن.

ئەوان دەمرێنن چونکە پێیان دەڵێم کە خەڵکی بچووک ئاکارباشی چووکیان شایەنە ـ چونکە سەلماندنی ئەوەم بۆ دژوارە کە خەڵکی بچووکیش پێویستن.

لێرە وەک کەڵەبابێکم لە حەوشێکی بێگانە کە مریشکەکانیش دندووکی لێدەدەن؛ بەڵام لەبەر ئەمە دەگەڵ ئەم مریشکانە خراپ نیم.

لە ئاستیان دا بە ئەدەبم، هەر ئەوجۆرەی لە ئاست گشت ئازارە چووکەکان دا؛ بە بڕوای من، دڕک نواندن لە ئاست هەر شتێکی چووک، زانایی ژووژکانەیە.

ئێواران کاتێک ئەوان لە دەوری ئاگر دادەنیشن، گشتیان باسی من دەکەن: لە من دەدوێن، بەڵام هیچکامیان ـ بیر لە من ناکەنەوە.

بێدەنگییەکی تازە کە فێری بووم ئەمەیە کە قاوەقاوی ئەوان لە ئاقاری من، پەردەیەک بە سەر بیر و بڕواکانم دا دەکێشێ.

ئەوان لە نێو خۆیان دا قاوەقاویانە کە ئەم هەورە تارە دەیەوێ چ لە ئێمە بکا؟ وریا بین، نەکا بەڵایەکمان تووش بکا!»

ماوەیەک لەمەوبەر ژنێک کە دەیەویست منداڵەکەی خۆی بۆ لای من بێنێ، کشاوە دواوە و قیژاندی: «منداڵەکانی خۆتان دوور خەنەوە! ئەم چاوانە داغ بە



رووحی منداڵەکانەوە دەنێ.»

کاتێک کە من قسە دەکەم، ئەوان دەکۆخن: پێیان وایە کۆخین دژایەتییەکە دەگەڵ باهێزەکان ـ ئەوان لە گوڕەی بەختیارییم پەی بە هیچ نابەن.

ئەوان دژایەتی دەکەن کە: «ئێمە هێشتا بۆ زەردەشت وەختمان نیە» بەڵام چ بایەخێکی هەیە سەردەمێک کە بۆ زەردەشت «وەختی نەبێ؟»

کاتێک پەسنم بکەن، چلۆن دەتوانم لە سەر پەسنیان بحەسێمەوە؟ پەسنی ئەوان بۆ من هەروەک پشتبەندێکی دڕکە کە ئەگەر لە خۆشمی بکەمەوە هێشتا هەر من دەخورێنێ.

ئەمەش لە نێو ئەوان دا فێر بووم: پەسنکەر وەها دەنوێنێ کە شتێک لە جیاتی دەداتەوە، بەڵام لە راستی دا دەخوازێ کە پتری پێببەخشن!

لە پێم بپرسە کە ئاخۆ نەوای پەسن و فریودەرانی پێخۆشە؟ بە راستی، بە وەها تەق و زرم و کوتێک پێم نە سەما کردنی پێخۆشە و نە بە سەر پێوە وەستان.

دەیانەوێ بە پەسن و فریویان من بۆ لای ئاکارباشیە بچووکەکەیان راکێشن، دەیانەوێ پێم بە دوای زرم و کوتی بەختیاری بچووک دا بکێشن.

بە نێو ئەم خەڵکە دا تێدەپەڕم و چاوەکانم ئاوەڵە دێڵمەوە. ئەوان بچووکتر بوونەوە و هەر دێن و بچووکتر دەبنەوە: و ئەمە بە هۆی ئامۆتەی ئەوانەوەیە سەبارەت بە بەختیاری و ئاکارباشی.

چونکە ئەوان لە ئاکارباشیش دا شەرمنن ـ لەبەر ئەوە کە داخوازی حەسانەوەن. بەڵام، تەنیا ئاکارباشی شەرمنانە دەگەڵ حەسانەوە یەک دەگرێتەوە.

هەڵبەت ئەوان بە شێوەی خۆیان هەنگاو هەڵێنانەوە و چوونە پێش فێر دەبن: بەڵام من ئەوە بە لەنگانیان ناو دەبەم. ئەوان بەم چەشنە دەبنە لەمپەری رێگای ئەو کەسانەی کە پەلەیان هەیە.

گەلێک لەوان دەچنە پێش و هەر ئەودەمیش بە ملی بەرزەوە، ئاوڕ دەدەنەوە: و پێم خۆشە سینگم وە سینگیان بکەوێ.

پێ و چاو نابێ درۆ بکەن و یا درۆ بۆ یەک هەڵبەستن. بەڵام لە نێو خەڵکی

بچووک دا درۆ زۆرە.

هەندێک لەوان دەخـوازن بەڵام زۆربەیان دەیانەوێ بخـوازرێن. هەندێک لەوان ڕەسەنن، بەڵام زۆربەیان دەورگێڕی خراپن.

لە نێویان دا دەورگێڕ هەن کە نازانن دەورگێڕن و دەورگێڕ هەن کە بەبێ ویست دەورگێڕن؛ ڕەسەنەکان هەمیشە کەمتر دەست دەکەون، بە تایبەت دەورگێڕانی ڕەسەن.

لێرە پیاوەتی کەمە: لەبەر ئەوە ژنەکانیان خۆیان وەک پیاو لێدەکەن. چونکە تەنیا ئەو کەسەی کە بە ڕادەی پێویست پیاوەتی هەیە، ژنایەتی لە ژن دا ـ ئازاد دەکا.

خرابترین شتێک کە لە نێو ئەوان دا دیتم ئەم دووڕوویییە بوو کە تەنانەت فەرماندەرانیش دەگەڵ ئاکارباشی خزمەتکارەکان دووڕوویی دەکەن.

«من خزمەتکارم، تۆ خزمەتکاری، ئێمە خزمەتکارین» ـ دووڕوویی خونکارەکان لێرە وەها دوعا دەکەن؛ هاوار لەو ڕۆژگارەی کە لەو دا یەکەم خونکار یەکەم خزمەتکارە!

ئاخ، پرسیایی چاوەکانم بۆ دەروونی دووڕوویی ئەوان باڵی گرت و چ سانا پەیم بە بەختیاری مێشانە و وزەوزیان لە دەوری پەنجەرەی بەربەڕۆچکەکان برد.

ئەوەند کە چاکەی دەبینم ئەوەندیش کەمایەسی. ئەوەند دادخوازی و بەزەیی ئەوەندیش کەمایەسی.

دەگەڵ یەک ساف و بە ئینساف و دڵاوان، وەها کە دەنکە خیزەکان دەگەڵ دەنکەخیزەکانی دیکە ساف و بە ئینساف و دڵاوان.

خۆ بەچووک دانان و وەخۆ گرتنی بەختیارییەکی چووک بە «تەسلیم و ڕەزا» ناو دەبەن! و لە هەمان حاڵ دا لە بن چاویانەوە، بە خۆ بەچووک دانان بە شوێن بەختیارییەکی بچووکی دیکەوەن.

لە قووڵایی دڵی ساویلکەیانەوە پتر لە هەر شتێک داخوازی ئەوەن کە کەس ئازاریان پێنەگەیەنێ. لەبەر ئەوە بەرەو پیری هەرکەسێک دەچن و چاکەی دەگەڵ دەکەن. بەڵام ئەمە ترسەنۆکییە: هەرچەند کە بە «ئاکارباشی» دابنێن.



کاتێک ئەم خەڵکە بچووکە بەرز قسە بکەن، ئەوەی کە دەگاتە گوێی من تەنیا دەنگ نووسانیانە ـ بە هەر سرەوەیەک دەنگیان دەنووسێ.

زیرەکن و ئاکارباشیەکانیان ئەنگوستگەلێکی زیرەکیان هەیە. بەڵام مستیان نیە. ئەنگوستەکانیان خۆ شاردنەوە لە پشت مست فێر نەبوون.

ئاکارباشی لای ئەوان وەها شتێکە کە چووک و دەستەمۆ دەکا: بەمە لە گورگ سەگیان ساز کردوە و لە خودی مرۆڤ باشترین گیانداری کەوی بۆ مرۆڤ.

بزەی خۆخوازییان بە من وەها دەڵێ: «ئێمە کورسی خۆمان لە نێوەڕاست دادەنێین ـ ئەوەند دوور لە شەڕکەرانی لەخۆبوردوو ئەوەندیش لە مالۆسە شادەکان.»

بەڵام ئەمە نێوان خوازییە هەرچەند کە بە نێوان ژمێری دابندرێ.

## ۳

بە نێوان ئەم خەڵکە دا تێدەپەڕم و دێڵم کە پەیڤێکی زۆر دابکەون: بەڵام ئەوان نە هەڵگرتنەوە دەزانن و نە ڕاگرتن.

ئەوانە پێیان سەیرە کە بۆچی بۆ سەرکۆنەی لۆمەکان و هەوەسەکان نەهاتووم! بەراستی، من بۆ ئەمەش نەهاتووم کە ئەوان لە گیرفانبڕەکان دوور بخەمەوە.

ئەوانە پێیان سەیرە کە بۆچی ئامادە نیم کە ئەقڵیان تێگەیشتووتر و تیژتر بکەم: دەڵێی هێشتا ئەو ئەقڵانەی کە تەقەیان هەر وەک قەڵەمی بەردتاشەکان گوێم ئازار دەدا بەس نین!

کاتێک هاوار بەرز دەکەمەوە کە «تووک لە گشت ئەو ئەهریمەنە ترسەنۆکانەی دەروونی خۆ بکەن کە پێیان خۆشە بناڵێن و دەستەکانیان لەسەر یەک دانێن و عیبادەت بکەن،» هاوار دەکەن کە «زەردەشت بێ خودایە.»

بەتایبەت مامۆستاکانی تەسلیم و ڕەزایان وەها هاوار بەرز دەکەنەوە؛ ڕاست لە گوێی ئەوانە دایە کە پێم خۆشە بەقەو بچریکێنم: «ئادی! منم زەردەشت،

پیاوی بێخودا!»

ئەم مامۆستایانەی تەسلیم و ڕەزا، لە هەر کوێییەک پیس و نەخۆش و ڕشکنێک هەبێ، وەک ئەسپێ بەرەو ئەوێ دەخزێن: و تەنیا بێزی من ناهێڵێ قرچەیان لێببێنم.

ئادی، ئەمەیە موعیزەی من بۆ گوێیەکانی **ئەوان**: منم زەردەشت، پیاوی بێخودا، کە دەڵێ «کێیە ئەو لە من بێخوداترە کە لەزەت لە ئامۆتەکانی ببەم؟»

منم زەردەشت، پیاوی بێخودا: لە کوێ مینا خۆیەک دەبینمەوە؟ مینا منەکان ئەوانەن کە خۆیان ویستی خۆیان دەدەن بە خۆ و ئەوەی تەسلیم و ڕەزایە لە خۆیان دوور دەخەنەوە.

منم زەردەشت، پیاوی بێخودا: من هێشتاش هەر پێشهاتێک لە مەنجەڵی خۆم دا دەکوڵێنم و ئەودەم کە باش کوڵی، وەک چێشتێک بۆ خۆم، بە خێر هاتنی دەکەم.

بەڕاستی، گەلێک پێشهات بە دەستەڵاتەوە بۆ لام هاتوون، بەڵام ویستی من بە دەستەڵاتتر دەگەڵی دواوە ـ و ئەودەم ئەو بە لالانەوە چۆکی داداوە.

ـ بە لالانەوە، هەتا لە من دا پەنایەک و لە دڵم دا ڕێگایەک بکاتەوە و خۆ ڕێکخەرانە گوتوویەتی: «زەردەشت، بڕوانە کە دۆست چلۆن بۆ لای دۆست دێ!»

بەڵام لەو شوێنەی کە هیچ کەس گوێیەکانی منی نیە، من چ بڵێم! کەوایە دەمەوێ ئەم قسەیە لە دەروونی گشت بایەکانەوە هاوار بکەم:

ئێوە هەر دێ و بچووکتر دەبنەوە، ئێوە خەڵکی بچووک! ئێوە ورد دەبن ئێوە ڕاحەتی ـ خوازەکان!

ئێوە لەبری گەلێک ئاکارباشیە بچووکەکانتان دەفەوتێن، لەبری گەلێک خۆپارستنی بچووکتان، لەبری تەسلیم و ڕەزای بچووکتان!

خاکەکەتان گەلێک نەرم و لێبوورە! بەڵام دار بۆ ئەوەی کە گەورە بێ دەیەوێ لە دەوری ڕەوەزە پتەوەکان ڕیشە پتەوەکانی باژوێ!

ئەوانەی کە خۆی لێدەپارێزن تەونۆکەی گشت داهاتووی مرۆڤ دەتەنن: هیچی ئێوەش تەونۆکەی جاڵجاڵۆکەیەکە و جاڵجاڵۆکەیەک کە بە خوێنی داهاتوو دەژی!



ئێوە خاوەن ئاکارباشە بچووکەکان، وەها وەردەگرن کە دەڵێی دەدزن؛ بەڵام شەرەف لە نێو ناکەسەکانیش دا دەڵێ کە: «تەنیا لەو شوێنە دەبێ بدزی کە نەتوانی بە تالانی بەری.»

«بۆ خۆی جێبەجێ دەبێ» ـ ئەمەش ئامۆتەیەکی تەسلیم و ڕەزایە. بەڵام من بە ئێوە دەڵێم، ئێوە ڕاحەتی خوازەکان: **ئەو بۆ خۆی دەستێنێ** و هەمیشەش زۆرتر و پترتان لێدەستێنێ!

ئاخ، بریا ئەم نیوە ویستنەتان لە خۆ دوور خستباوە و بۆ بێکار بوونیش هێندەی کار کردن ورەتان هەبا!

ئاخ، بریا لە قسەم گەیشتبان: «هەمیشە هەرچی دەتەوێ بیکە ـ بەڵام لە پێشدا لەو کەسانە بە کە توانای ویستنیان هەیە!

هەمیشە وەک خۆت هاوساکەت خۆش بوێ ـ بەڵام لە پێشدا لەو کەسانە بە کە خۆیان خۆش دەوێ ـ

لەو کەسانە، کە بە خۆشەویستییەکی گەورەوە خۆشیان دەوێ، کە بە بەسووک دانانێکی گەورەوە خۆشیان دەوێ!» وەها دەڵێ زەردەشت، پیاوی بێخودا.

بەڵام لەو شوێنەی کە هیچ کەسێک گوێیەکانی منی نیە چ دەڵێم! لێرە هێشتا سەعاتێک بۆ کۆتایی هاتنی کاتم ماوە.

پێشەنگی خۆمم لە نێو ئەم خەڵکە دا، قووقەی کەڵەبابی خۆمم لە کۆڵانە تاریکەکان دا.

بەڵام ساتی ئەوان دادێ! و هەروەتر ساتی من! دەم بە دەم بچووکتر، هەژارتر، بێبەر و بەرهەمتر دەبنەوە ـ گژ و گیای هەژار! خاکی هەژار!

بەم زوانە هەروەک گیا و مێرگی ویشک لە بەرابەرم دا دەوەستن، و بە ڕاستی بێزار لە خۆ ـ و پتر تینووی ئاگر هەتا ئاو!

ئەی ساتی پیرۆزی برووسک! ئەی ڕازی بەر لە نیوەڕۆ! ڕۆژێک ئاگرێکی پەرەگر لەوان ساز دەکەم و مزگێنیدەرانێک بە زمانی ئاگرینەوە:

ڕۆژێک بە زمانی ئاگرینەوە مزگێنی دەدەن: دێ، نزیکە، نیوەڕۆی مەزن!
وەهای گوت زەردەشت.

## له سەر کێوی زەیتوون

زستان، ئەم میوانە جاڕزکەرە، لای من لە ماڵ دانیشتوە و دەستەکانم لەبەر ڕێک کوشینی دەستی دۆستایەتی ئەو شین هەڵگەڕاون.

من ڕێز لەم میوانە جاڕزکەرە دەگرم، بەڵام لام خۆشترە کە بە تەنیای بێڵمەوە. پێم خۆشترە بە راکە ـ راکە لێی دوور کەومەوە! و بە باش هەڵاتن دەکرێ لێی راکەی!

بە پێی گەرم و بیروڕا گەرمەکان بۆ ئەو شوێنە رادەکەم کە با وەستاوە، بۆ بەرۆژی کێوی زەیتوونی خۆم.

لەوێ بە میوانە مۆنەکەم پێدەکەنم و سەرەڕای ئەوە سپاسی لێدەکەم، چونکە ئەو مێش لە ماڵەکەم دەتارێنێ و گەلێک وردە دەنگ بێدەنگ دەکا.

چونکە ئەو تاقەتی وزەی مێشوولەیەکی نیە چ بگا بە دوو؛ ئەو کۆڵانەکانیش چۆل دەکا وەها کە تریفەی مانگە شەویش تێیدا خۆفی رێدەنیشێ.

ئەو میوانێکی بێبەزەیە ـ بەڵام ڕێزی لێدەگرم و هەروەک دەست و پێ سپیلکەکان، بوتی زگ زلی ئاگر ناپەرستم.

هەندێک تەقەتەقی ددان لە پەرستنی بوتەکان باشترە! مەیلم وەهای دەوێ. بە تایبەت دوژمنی گشت بوتە سوتێنەرەکان و چڕەدووکەڵ و هاڵاوی ئاگرم.

ئەوەی کە خۆشم بوێ، لە زستان دا پتر لە هاوین خۆشم دەوێ. لەو کاتەوە کە زستان لە ماڵەکەم دانیشتوە بە دوژمنەکانم باشتر و لە قووڵایی دڵەوە پێدەکەنم.

بە راستی لە قووڵایی دڵەوە، تەنانەت ئەودەم کە دە نوێنەکەم دەخزێم: ئەودەمیش بەختیاری شاراوەم هەر پێدەکەنێ و گاڵتەی دەکا؛ خەونی هەڵخەڵەتێنەریشم پێدەکەنێ.

من و ـ خزین؟ لە ژیانم دا قەت لە ئاست زۆرداران دا نەخزیوم و ئەگەر درۆیەکیشم کردبێ، لە خۆشەویستییەوە کردوومە. لەبەر ئەوە لە نوێنی زستانی خۆشم دا شادم.



نوێنێکی هەژارانە باشتر لە نوێنێکی دەوڵەمەندانە من گەرم دەکاتەوە؛ چونکە من سەبارەت بە دەستکورتی خۆم بە غیرەتم و ئەو لە زستان دا دەگەڵ من لە هەر کاتێکی دیکە بە ئەمەگترە.

هەر رۆژێک بە بەدفەڕییەک دەست پێدەکەم: بە ئاوێکی سارد بە خۆ داکردن گاڵتە بە زستان دەکەم و هاوماڵە مۆنەکەم دەبۆڵێنێ.

هەروەها پێمخۆشە ئەو بە شەمێکی مۆمی قەدیلکە بدەم هەتا لێگەڕێ ئاسمان، لە ئاکام، لە جەرگەی بوولێڵی بۆر سەر دەربخا.

چونکە من بە تایبەت بەیانیان بەدفەڕم: لە دەمێکی زوو کە شەقەشەقی سەتڵ لە چاڵاو دێ و ئەسپەکان لە کۆڵانە بۆرەکان دا بە گەرمی دەحیلێن.

ئەوسا بێئۆقرە چاوڕوان دەبم هەتا لە ئاکام ئاسمانی روون بۆ من دەرکەوێ، ئاسمانی ردێن ـ بەفرینی زستان، ئەو پیرەی پرچ سپی.

ـ ئاسمانی زستان، ئاسمانی بێدەنگ کە تەنانەت سەبارەت بە هەتاوەکەشی بێدەنگ دەمێنێتەوە!

ئایا من بێدەنگیی ڕووناکایی درێژخایەن لەو فێر بووم؟ یا ئەو لە من؟ یا ئەوە کە هەرکام لە ئێمە ئەوەمان بۆ خۆمان بنیات ناوە؟

بازگەی گشت شتە باشەکان هەزار توێیە، شتە باشە لاسارەکان لەبەر لەزەت بۆ پانتایی بوون باز دەدەن: چلۆن دەبێ کە ئەوان ئەم کارە تەنیا ـ بۆ جارێک ئەنجام بدەن!

یەک لە شتە باشە لاسارەکان، بێدەنگیی درێژخایەنە و هەروەک ئاسمانی زستان بە لای ڕووناک و خڕی چاو دا روانین ـ

هەروەک ئەو لەمەڕ هەتاوی خۆی و ویستی هەتاوی پتەوی خۆی بێدەنگ مانەوە. بە راستی، من ئەم هونەر و لاساریی زستان بە باشی فێر بووم!

خۆشترین بەدخوازیی و هونەر لای من ئەمەیە کە بێدەنگییم فێر بوە کە بە بێدەنگ مانەوە خۆی وە دەستەوە نەدا.

بە شەقەشەقی وشەکان و تاسەکان، گاڵتە بە چاوەڕوانانی بە فیز دەکەم هەتا ویست و ئامانجم لە چنگ ئەم چاوەدێرە مۆنانە دەرباز بێ.

بێدەنگیی رووناکایی درێژخایەنم لەبەر ئەوە بۆ خۆ ساز کردوە هەتا چ کەس نەتوانێ لە ناخ و داوای دوایینم بڕوانێ.

چونکە گەلێک خەڵکی زیرەکم دیون کە بە دەمامک رووی خۆیان گرتوە و ئاوی خۆیان قوڕاوی کردوە هەتا چ کەس نەتوانێ دەروون و قووڵایی ئەوان ببینێ.

بەڵام بەدگومانەکان و فندق شکێنە زیرەکترەکان راست چوونە زگ ئەوان و شاراوەترین ماسی ئەوانیان دەرکێشاوە!

بەڵام بێدەنگە هەرە زیرەکەکان لای من رووناکەکان و پاکەکان و روونەکانن: ناخی ئەوان ئەوەند قووڵە کە ئاوە هەرە روونەکانیش ناتوانن دەری بخەن.

تۆ ئەی ئاسمانی بێدەنگی ردێن ـ بەفرینی زستان، ئەی چاو خڕی پرچ سپی، کە لە بان منی! تۆ ئەی مینا ئاسمانی رەوانی من و لاسارییەکەی!

ئایا نابێ من هەروەک زێڕ قووتدەران خۆم بشارمەوە ـ هەتا رووحم لێک هەڵنەدڕن؟

ئایا نابێ من بە شەقە بە رێ دا بڕۆم هەتا درێژایی لینگەکانم وەبەر چاویان نەیە ـ وەبەر چاوی گشت ئەم ئێرەیی بەرانە و زیانی خورۆیانەی دەوروبەرم؟

ـ ئەم رووحە دووکەڵاوییانە، تونخانەنشینانە، رزیوانە، برشاوی پەشێوانە، نێوچاوان تاڵانەی ئەوان چلۆن دەتوانن بەرگەی بەختیاری من بگرن؟

لەبەر ئەوە، من تەنیا سەهۆڵ و زستانی ترۆپکەکانمیان نیشان دەدەم ـ ئەوەنیە چیاکەم گشت پشتێندەکانی هەتاوی لە خۆی بەستوە.

ئەوان تەنیا وژەی کڕێوەی زستانییم دەبیسن: ئەوەنیە کە من، هەروەک با تاسەبارە قورس و داغەکانی باکوور، دەریا گەرمەکانیش دەپێوم.

ئەوان لەبەر پێشهاتە خراپەکان و ئەو کارەساتانەی کە بە سەر من دێن دڵیان دەسووتێ. بەڵام پەیڤی من دەفەرمێ: «بڵا کارەسات هەتا نزیک من بێ: ئەو هەروەک منداڵێکی ساوا بێگوناهە!»

ئەوان چلۆن دەیانتوانی تاقەتی بینینی بەختیاری منیان هەبێ ئەگەر من پێشهاتە خراپەکان و بێ گەڵاییەکانی زستانی و کڵاوگەڵێک لە کەوڵی ورچ و جلگەڵێک لە ئاسمانی بەفرینم دەبەر بەختیاری خۆم نەکردبا!



ئەگەر خۆم دڵم بە بەزەییان نەسووتابا: بەزەیی ئەم ئێرەیی بەرانە و زیانی خورۆیانە! ـ

ئەگەر خۆم لە بەرابەریان دا ئاخم هەڵنەکێشابا و لە سەرمان هەڵنەلەرزابام و سێبوورانە خۆم پێنەسپاردبان کە لە بەزەییان دا داپۆشریم!

لاساریی و خۆشیی زانایانەی رەوانم ئەمەیە کە زستان و کڕێوەکانی ناشارێتەوە؛ هەروەتر ئەو لە سەرما رەق هەڵاتوەکانیشی ناشارێتەوە.

تەنیایی بۆ کەسێک راکردنی نەخۆشە و بۆ کەسێکی دی راکردن لە نەخۆشەکان.

بێڵە ئەم رەزیلە بەرچاوتەنگە هەژارانەی دەوروبەرم گشتیان ببیسن کە لەبەر سەرمای زستان هەڵدەلەرزم و ئاخ هەڵدەکێشم! بە وەها ئاخ و لەرزێک هێشتاش لە ژوورە گەرمەکەیان رادەکەم.

بێڵە دڵیان پێم بسووتێ و وێڕای من لەبەر رەق هەڵاتنم ئاخ هەڵکێشن و بناڵێنن چونکە: «ئەو بە سەهۆڵی زانیاری رەق هەڵدێ!»

بەڵام من لەم بەینە دا بە پێ گەرمەکانم بە کێوی زەیتوونی خۆم دا بۆ سەر و خوار هەڵدێم و لە بەرۆژی کێوی زەیتوونی خۆم گۆرانی دەڵێم و بزەم بە گشت بەزەییەک دێ.

وەهای ستران بێژت زەردەشت.

## سەبارەت بە لێ تێپەڕین

وەها، زەردەشت، بە پێیان بە نێوان گەلێک گەل و گەلێک شار دا، بە رێگا نێوبڕەکان دا بۆ کوێستان و ئەشکەوتەکەی خۆی دەگەڕاوە. بڕوانە، لە سەفەرەکەی دا لە نەکاو رێی دە دەروازەی شاری گەورەش کەوت: بەڵام لێرە شێتێکی کەفچڕێن بە باوەشی ئاوەڵە بۆ لای ئەو بازدی دا و بەر رێگای لێگرت. بەڵام، ئەمە هەر ئەو شێتە بوو کە خەڵک پێیان دەگوت «مەیموونی زەردەشت»: چونکە ئەو شتێک لە شێوەی ئاخاوتن و دەم و راوێژی زەردەشت فێر ببوو، هەروەتر پێیخۆش بوو کە لە خەزێنەی زانایی ئەو شتێک دەست بخا. بە هەر حاڵ، شێت وەهای بە زەردەشت گوت:

«زەردەشت، ئێرە شاری گەورەیە: ئێرە شتێکی لێ نیە کە تۆ بە دوایەوە بی و جێگایەکە کە تۆ هەموو شتێک لە کیس دەدەی.

بۆچ دەتەوێ بە نێو ئەم چڵپاوە دا تێپەڕی؟ بەزەییت بە پێیەکانت دابێ! وا باشترە تفێک لە دەروازەی شار بکەی و ـ بگەڕێیەوە!

ئێرە دۆزەخی بڕوای خەڵوەنشینەکانە: لێرە بڕوا گەورەکان بە زیندەسەری دەکوڵێنن و ئەوەندەی دەکوڵێنن کە بچووک بێتەوە

لێرە هەستە گەورەکان هەموو دەڕزێن و تەنیا هەستە بچووکە بە زیقەکان ئیزنی زیقەزیقیان هەیە!

ئایا هەر ئێستا بۆنی کوشتارگەکان و کوڵێنخانەکانی گیانت بۆ نایە؟ ئایا ئەم شارە هالاوی گیانە کوشتار کراوەکانی لێهەڵناستێ؟

نابینی ئەو رووحانەی کە هەروەک بزگوڕی چرچی چەپەڵی کۆنە هەڵواسراون؟ تازە ئەوان لەم بزگوڕە کۆنانە رۆژنامەش ساز دەکەن!

نابیسی کە لێرە گیان بۆتە کایە بە وشە و گەنداوی بە بێزی وشەکان دەڕشێنێتەوە؟ تازە ئەوان لەم گەنداوی وشانە رۆژنامەش ساز دەکەن!

بە دوای یەک دا رادەکەن و نازانن بۆ کوێ؟ یەکدی دەهاروژێنن و نازانن، بۆ؟ خللە لە دراوەکانیان دێنن و جرینگە لە زێڕەکانیان!

ساردن و لە ئاوە ئاگرینەکان دا لە گەرما دەگەڕێن: هەڵگڕاون و لە گیانە سەهۆڵ بەستووەکان دا لە فێنکایی دەگەڕێن. هەموویان لە بیروڕای گشتی نەخۆش و دڵێشاون.

ئێرە ماڵی گشت هەوەس و ئاکارخراپەکانە؛ بەڵام بێبەری لە خەڵکی ئاکارباش و هەروەتر گەلێک ئاکارباشی زیرەکی کارامە نیە.

گەلێک ئاکارباشی زیرەک بە ئەنگوستە بنووسەکانیان و ماسوولکە رەقەکانیان بۆ دانیشتن و چاوەڕوان مانەوە؛ شاد لە هەبوونی هەسێرەگەلێکی بچووک لە سەر سینگ و ئەو کیژە بێسمتانەی کە بە خەرگە خۆ پڕ دەکەن.

لێرە هەروەتر گەلێک ئەویندار هەن و گەلێک تف لێستنەوەی دیندارانە و کلکەسووتە لە ئاست خێوی لەشکر.



چونکە هەسێرە و تفی رەحمەت «لە سەرەوە» دادەبارن و هەر سینگێکی بێهەسێرە رووی تاسەی بەرەو سەرەوەیە.

مانگ بۆ خۆی بارەگایەکی هەیە و بارەگا بۆ خۆی گوێلک ـ مانگێک؛ بەڵام خەڵکی سەرسواڵکەر و گشت ئاکارباشە زیرەکە سەرسواڵکەرەکان لە ئاست ئەوەی کە لە بارەگاوە دێ بە چۆک دادەکەون.

«من خزمەتکارم، تۆ خزمەتکاری، ئێمە خزمەتکارین» ـ ئاکارباشە زیرەکەکان گشتیان وەها لە ئاست پاشا دا بە چۆک دادەکەون تا ئەوەکە هەسێرەی شایانی ئەوان لە سەر سینگی تەنگیان بدا!

بەڵام مانگ هێشتا بە دەوری ئەوەی کە زەوینییە دەگەڕێ: پاشاش هەروەتر بە دەوری زەویترین شتەکان دا دەگەڕێ ـ کە ئەویش زێڕی دوکاندارەکانە.

خێوی لەشکر، خێوی شمشە زێڕەکان نیە: لە پاشا حەڕەکەت و لە دوکاندارەکان بەرەکەت.

ئەی زەردەشت، سوێندت دەدەم بەوەی کە لە تۆ دا بە گرشە و بە هێز و باشە، کە تف لەم شاری دوکاندارانە بکە و بگەڕێوە!

لێرە لە نێو تەواوەتی رەگەکان دا خوێنی بۆگەنی شیلەوتینی کەفاوی دەگەڕێ: تف لە شاری گەورە بکە کە کەلاوەیەکی گەورەیە و گشت تڵتە و بنژیلەکان کەوتوونە سەر یەک!

تف لە شاری رووحە تێکقرماو و سینگە تەنگەکان، چاو لێک داپچڕاوەکان و ئەنگوستە پێکەوە نووساوەکان بکە ـ

لە شاری پڕڕوو، بێشەرم، هەتڵەبێژ، دەم هەراش و بە فیزانی دەم بە هاوار:

لەو جێیەی کە تەواوی شتەکانی رزێو، بێئابروو، حەکەدار، نێو رەش، پێشێلکراو، چڵکن و گزیکار کە پێکەوە چڵک و کێم ساز دەکەن.

تف لە شاری گەورە بکە و بگەڕێوە!»

بەڵام، ئالێرە دا زەردەشت  وتاری شێتی کەفچڕێنی بڕی و دەمی گرت.

زەردەشت هاواری کرد: «بەسە ئیدی! درێژماوەیەکە کە لە قسەکانی تۆ و لە چەشنی تۆ هێڵنجم دێتێ!

تۆ بۆ ئەوەند لە نزیک مردواو ژیای هەتا خۆت بوویە بۆق؟ نووکە لە رەگەکانی کەسێکی وەک تۆ دا کە وەها قیراندن و جوێن دان فێر بوە، مەگەر خوێنی بۆگەن و کەفاوی مردواوێک ناگەڕێ؟

بۆچ نەچوویە لێڕ؟ یا زەویت نەکێڵا؟ مەگەر دەریا پڕ لە دوڕگە شینەکان نیە؟

من بە سووک دانانی تۆ بە سووک دادەنێم؛ و تۆیەک کە من وریا دەکەیەوە ـ بۆچ خۆت وریا ناکەیەوە؟ مەلی بە سووک دانەر و وریاکەرەوەی من تەنیا لە ناخی ئەوینەوەیە کە باڵ دەگرێ، نە لە ناخی مردواوەوە!

بە تۆ دەڵێن مەیموونی من، تۆ شێتی کەفچڕێن: بەڵام من تۆ بە بۆقەی بەرازی خۆم ناو دەبەم: تۆ بە بۆقەبۆقی خۆت رێزگرتنی من لە شێتایەتی خراپ دەکەی.

چ شتێک لە پێشدا تۆی ناچار بە بۆقەبۆق کرد؟ ئەوە کە هیچکەس ئەوەند کە پێویستە کلکەسووتەی بۆ نەکردی: لەبەر ئەوە لەم گەنداوە مایەوە هەتا بۆ بۆقاندنی زۆرت بیانووت هەبێ ـ

هەتا بۆ تۆڵەی زۆر بیانووت هەبێ! چونکە گشت کەف پرژاندنی تۆ، تۆ شێتی خۆخواز، جگە بۆ تۆڵە نیە. من تۆم چاک ناسیوە!

بەڵام قسەی شێتانەی تۆ زیانم پێدەگەیەنێ، تەنانەت لەو جێیەش کە هەق بە تۆ بێ! ئەگەر قسەی زەردەشت سەد هێندەش بە هەق بووبا: تۆ هەمیشە قسەی منت ـ بەناهەق دە کار دێنا!»

وەهای گوت زەردەشت و چاوێکی لە شاری گەورە کرد و ئاخێکی هەڵکێشا و درەنگانێک بێدەنگ ماوە. لە ئاکام وەهای گوت:

نە تەنیا ئەم شێتە بەڵکە ئەم شارە گەورەش بێزم هەڵدەستێنن. لەم و لەو دا شتێک نیە کە باشتر یا خراپتر بێ.

هاوار لەم شارە گەورە! بریا هەر ئێستا بڵێسەیەکی ئاگرم دیتبا کە ئەم شارە تێیدا سووتابا!

چونکە وەها بڵێسەگەلێک دەبێ سەرەتایەکی نیوەڕۆی مەزن بن. ئادی، ئەمەش کاتی خۆی و چارەنووسی خۆی هەیە!

بەڵام، ئەی شێت، بۆ مالاوایی ئەم ئامۆتەیە پێشکەشی تۆ دەکەم: لەو شوێنە کە ئیدی ناکرێ ئەویندار بی دەبێ لێگەڕێی و **تێپەڕی**!



وەهای گوت زەردەشت و لە شێت و شاری گەورە دوور کەوتەوە.

## سەبارەت بە بێدین بوان

### ١

مخابن، ئەوەی کە هەتا ماوەیەک لەمەوبەر لەم مێرغوزارە زەنوێر و رەنگینە وەستابوو، نووکە ژاکاو و بۆر کەوتوە و من لێرە چەندە هەنگوینی هیوام بەرەو کەندووی خۆم بردۆتەوە!

ئەو دڵە لاوانە نووکە گشتی پیر بوون ـ نە تەنیا پیر، بەڵکە شەکەت و بێزێز و تەوەزەل: ئەوان ئەمە وەها ناو دەبەن: «ئێمە جارێکی دی دیندار بووینەوە.»

ماوەیەک لەمەوبەر بوو ئەوانم دیت کە بەرەبەیانییان بە پێ بوێرەکانیان هەڵدەهاتنە دەر: بەڵام پێی زانایییان ماندوو بوە و نووکە بە خراپ باسی بوێریی بەرەبەیانی خۆیان دەکەن!

بە راستی، رۆژگارێک گەلێک لەوان پێیەکانیان هەروەک سەماکەران بەرز دەکردەوە و پێکەنینێک کە لە فرەزانی دایە چەپڵەی بۆ لێدەدا: ئەوسا ئەم لەم کارە شکی کرد و نووکە دیتم کە پشت داچەماو ـ بۆ لای خاچ دەخزێ.

رۆژگارێک هەروەک مێشوولە و شاعیرە لاوەکان لە دەوری نوور و ئازادی دەفڕین: کەمێک پیرتر، کەمێک ساردتر: نووکە تاریک بروان و بە ورتە و گۆشەنشین.

ئایا دڵەکانیان لەوە کە تەنیایی منی وەک نەهەنگێک هەڵلووشی خۆفیان رێنیشت؟ یا لەوانەیە گوێچکەکانیان لە خۆوە درەنگ ماوەیەک بە تاسەوە چاوەڕوانی من و دەنگی بۆڕیە و هاواری جاڕی من بوون.

مخابن! هەمیشە چ کەمەن ئەوانەی کە دڵیان بوێریی و دلێرییەکی درێژخایەنی هەیە و گیانیشیان سێبوور دەمێنێتەوە. جگە لەوانە ئەوانی دیکە ترسەنۆکن.

جگە لەوان ـ هەمـوو زۆربە ، بێـبـایەخ، زێدە، فـرەزۆرن ـ ئەوانە گـشـتـی ترسەنۆکن!

بەڵام ئەوەی کە لە رەگەزی منە تووشی بە تووشی ئەزموونەکانی رەگەزی من دێ: وەها کە یەکەم هاوڕێکانی دەبێ کەلاک و ویشکەڕنەکان بن.

بەڵام دووهەمین هـاوڕێکانی ـ خۆ بـە لاگری ئەو دەزانن: کـۆمـەڵێکی زیندووی لێوڕێژ لە ئەوین، لێوڕێژ لە شێتایەتی، لێوڕێژ لە رێزی مێرمنداڵانە.

بەڵام ئەوەی کە لە نێو مرۆڤ دا لە رەگەزی منە دڵ بە وەها لاگرانێک خۆش ناکا. ئەوەی کە دەروونی ترسەنۆک و ناپتەوی رەگەزی مرۆڤ دەناسێ، بڕوا بەو نەوبەهار و مێرغوزارە رەنگینانە ناکا!

ئەوانەی کە جگە لەمەیان دەتوانی، جگە لەمەیان دەویست. ناتەواوەکان هەر تەواوەتییەک دەفەوتێنن. چ قەیدی کە گەلاکان دەژاکێن!

بلا هەڵوەرێن و داکەون، ئەی زەردەشت غەمت نەبێ! وا باشترە کە بە گژەبایەکانەوە هەڵکەیە نێویان ـ

زەردەشت، هەڵکە سەر ئەم گەلایانە هەتا ژاکاوەکان گشتیان بە هەشتاوتر لەبەرت رابکەن.

## ۲

«ئێمە جارێکی دی دیندار بووینەوە» ـ ئەم بێدین بوانە وەها دەدرکێنن و هەندێک لەوان تەنانەت لەوە ترسەنۆکترن کە ئەمە بدرکێنن.

بەڵام من چاو لە چاوی ئەمانە دەبڕم ـ من بەرەو رووی ئەوانە و سوور هەڵگەڕانی کولمەکانیان دەڵێم: ئێوە هەر ئەوەن کە جارێکی دی عیبادەت دەکەنەوە!

بەڵام عیبادەت نەنگە! بەڵام نەک بۆ هەموو کەس، بەڵکە بۆ من و تۆ و ئەو کەسەی کە لە سەری دا، ویژدانی خۆی هەیە! عیبادەت بۆ تۆ نەنگە!

تۆ ئەمە باش دەزانی کە ئەو شەیتانە ترسەنۆکەی کە لە ناخی تۆ دایە پێیخۆشە دەستەکانی لێک قایم کا و دەستەوئەژنۆ دانیشێ و خۆی ئاسوودەتر



بکا: ئەو شەیتانە ترسەنۆکە بە تۆ دەڵێ کە: «خودایەک هەیە!»

بەڵام، بەم چەشنە تۆ چوویە نێو ریزی لە نوور ترساوەکانەوە، لە ریزی ئەوانەی کە نوور حەسانەوەیان لێدەستێنێتەوە: نووکە تۆ دەبێ گشت رۆژێک سەری خۆت قووڵتر بەریە نێو شەو و مژەوە!

بە راستی، کاتێکی باشت هەڵبژاردوە: چونکە نووکە مەلەکانی شەو جارێکی دی وە فڕین دەکەونەوە. کاتی گشت خەڵکی لە نوورترساو داهاتوە. کاتی تاریکان و حەسانەوە کە ئەوان حەسانەوەیان تێدا نیە.

دەبیسم و بۆن دەکەم کە کاتی راو و کۆچیان داهاتوە، بەڵام بە راستی، نەک بە شوێن نێچیرێکی کێوی، بەڵکەم نێچیرێکی کەوی، شەل، مل کەچی بە کلکە سووتە و نێچیری بە چرپە دوێن.

ـ بۆ راوی جرجەمشکە هەستیارەکان گشت تەڵە مشکەکانی دڵیان دیسان وەکار خستوە! لە هەر کوێ کە پەردەیەک لا دەدەم پەپوولەیەکی شەوفڕ دەردەپەڕێ.

ئایا لەوێ دەگەڵ پەپوولەیەکی شەوفڕی دی هەڵکورمابوو؟ چونکە لە گشت شوێنێک بۆنی کۆمەڵە بچووکە پشت داچەماوەکان دێ، و لە هەر کوێیەک کە دیوێکی بچووک هەبێ زاهیدە تازەکانی تێدایە و تۆزی ئەهلی عیبادەت.

ئەوان ئێواران لە پەنا یەک دادەنیشن و دەڵێن: «وەرن جارێکی دی ببینەوە منداڵێکی ساوا و بڵێین: خودای دلاوا!» شەکرپێژی زاهیدەکان زار و گەدەی رزاندوون.

یا ئێواران چاو لە جاڵجاڵۆکەی خاچنشین و گزیکار دەبڕن کە لە بۆسە دایە و موعیزەی زیرەکیی بۆ جاڵجاڵۆکەکان دەکا و فێریان دەکا کە «ژێر خاچەکان باش دەتوانن بتەنن!»

یا سەراسەری رۆژ، بە قولاپ لە دەم زەلکاو دادەنیشن و خۆ بە قووڵ دادەنێن؛ بەڵام من ئەو کەسەی کە لە شوێنی بێ ماسی، ماسی بگرێ بە سەراییشی دانانێم.

یا بە رەزامەندییەکی زاهیدانە لای ئاهەنگساز چەنگ ژەنین فێر دەبێ کە لە پیرێژنەکان و پێهەڵکوتنەکانیان ماندوو بوە و پێیخۆشە کە لە دڵی ژنە لاوەکان دا

چەنگێک بژەنێ.

یا لە لای زانیارێکی نیوە شێت کە لە دیوە تاریکەکان دا چاوەڕوانی رووحەکانە، لە ترسان هەڵلەرزان فێر دەبێ ـ و رووحیان هەڵدەفڕێ!

یا گوێ لە فیتەی پیرەمێردێکی گەڕۆڵ دەگرێ کە لە با غەمینەکان گۆرانییە غەمینەکان فێر بوە و نووکە، سۆز لە گۆرانییە غەمینەکان دا موعیزە دەکا.

تەنانەت هەندێک لەوان بوونە شەوگەڕیش: ئەوان نووکە دەزانن کە چلۆن فوو دە بۆڕیەکانیان بکەن و شەوانە بگەڕێن و شتە پیرەکان کە درەنگانێک دە خەو راچوون، وە ئاگا بێننەوە.

دوێشەو لە پەنا دیواری باغ پێنج قسەم لەمەڕ شتە پیرەکان بیست: ئەم قسانە لە دەمی وەها شەوگەڕانێکی پیری کەلەلا و داهێزاو هاتە دەر.

ـ «ئەو وەک باوکێک هێندە غەمی منداڵەکانی ناخوا، باوکەکانی مرۆڤ ئەم کارە باشتر دەکەن!»

شەوگەڕێکی دی وەها وڵامی داوە: «ئەو زۆرە پیرە و ئیدی پتر لەوە غەمی منداڵەکانی ناخوا.»

ـ «مەگەر ئەو منداڵیشی هەیە؟ ئەگەر ئەو خۆی ئەمە نەسەلمێنێ کەسی دیکە ناتوانێ. لەمێژە داخوازی ئەوەم کە جارێک ئەمە بە تەواوی بسەلمێنێ.»

«بسەلمێنێ؟ مەگەر ئەو هەتا ئێستا شتێکی سەلماندوە؟ سەلماندن بۆ ئەو دژوارە؛ ئەوەی کە بۆ ئەو گرینگە ئەمەیە کە ئیمانیان بەو هەبێ.»

ـ «ئادی، ئادی، ئیمان ئەو رازی دەکا، ئیمان بە ئەو. خەڵکی پیر گشتی وەهان! ئیمەش هەروەتر!»

دوو شەوگەڕ و لە نوور ترساوی پیر وەها دەگەڵ یەک دوان و لە دوایی غەمین فوویان دە بۆڕیەکانیان کرد. دوێشەو لە پەنا دیواری باغ وەها تێپەڕی.

بەڵام لە دەروون دا من دڵم لە پێکەنینان لە خۆ بۆوە و دەیەویست لێک بپچڕێ و نەیدەزانی بۆ کام لا بڕوا و داکەوتە نێو پەردەی زگم.

بە راستی، ئەودەم کە کەرەکان بە مەستی دەبینم و قسەی شەوگەڕەکانم بە گوێ دەگا کە وەها لەمەڕ خوداوە شک دەکەن، دەمەوێ لە پێکەنینان بمرم.



مەگەر درەنگانێک نیە کە سەردەمی شکی وا تەواو بوە؟ کێ دەتوانێ هێشتا شتە پیرەکان، خەوتوو و لە نوور ترساوەکان وەئاگا بێنێتەوە؟

کاری کۆنە خوداکان دەمێکە کۆتایی پێهاتوە ـ و بە راستی خودایانە ـ ئاکامێکی باش و خۆشیان هەبوە!

مەرگی ئەوان «ئاوا بوون»یان نەبوو ـ هەر چەند وەها درۆیەکیان کردوە! بەڵکە ئەوان جارێک وەها پێکەنین کە مردن!

ئەمە هەر ئەو جارە رووی دا کە ئەم ناخودایانەترین پەیڤە لە دەمی خودایەک هاتە دەر ـ ئەم پەیڤە: «خودا یەکێکە! لە پەنا من خودایەکی دیکە ناگونجێ!»

خودایەکی تووڕە، خودایەکی دڵ پیس، وەها خۆی لە بیر کرد.

ئەودەم خوداکان گشتیان پێکەنین و لە کورسیەکانیان دا خۆیان راژاند و هاواریان کرد: «مەگەر خودایەتی ئەوە نیە کە خوداکان هەبن، نەک خودا؟»

ئەوەی کە گوێچکەیەکی هەیە ببیسێ!

وەهای گوت زەردەشت و لە شارێک کە خۆشی دەویست و ناوی «مانگای رەنگاڕەنگ» بوو. بەڵام لێرەوە هەتا گەیشتنەوە بە ئەشکەوت و گیاندارەکانی دوو رۆژە رێ پتر نەبوو و رەوانی لە نزیک بوونەوەی دەمی گەیشتنەوە بۆ ماڵ شادی دەکرد.

## گەڕانەوە بۆ ماڵ

ئەی تەنیایی! ئەی ماڵی من، تەنیایی! درەنگ ماوەیەک کێوییانە لە وڵاتانی نامۆی کێوی دا ژیاوم هەتا بە چاوی پڕ لە گریانەوە بۆ لای تۆ بۆ ماڵ نەگەڕێمەوە.

نووکە بە قامکت هەڕەشەم لێبکە، هەر ئەوجۆرەی کە دایکەکان دەیکەن؛ نووکە بە رووم پێبکەنە، ئەوجۆرەی کە دایکەکان دەیکەن؛ نووکە تەنیا بێژە: «کێ بوو ئەوەی کە رۆژێک وەک گژەبا بەلەز لە لام رای کرد؟

ـ و کاتی جیا بوونەوە هاواری کرد: درەنگ ماوەیەک لە پەنا تەنیایی

دانیشتووم، لەبەر ئەوە خامۆشیم لە بیر کردوە! نووکە ئەمە ـ باش فێر بووی؟

زەردەشت، من هەموو شتێک دەزانم: من ئەوە دەزانم کە تۆ، ئەی تاکانە، لە نێو فرەزۆران دا وەلانراوتر بووی هەتا لە لای من!

وەلانان شتێکە و تەنیایی شتێکی دی: نووکە ئەمە فێر بووی؟ هەروەتر ئەمە دەزانم کە تۆ لە نێو مرۆڤ دا هەمیشە کێوی و نامۆ دەبی:

ـ کێوی و نامۆ، تەنانەت ئەودەم کە خۆشیان دەوێی: چونکە ئەوان پتر لە هەر شتێک داخوازی لاواندنەوەن.

تۆ لێرە لە سەر ماڵ و حاڵی خۆتی؛ لێرە دەتوانی لە گشت بدوێی و هەموو بنج و بناوانەکان دەربخەی. لێرە هیچ شتێک لە هەستە شاراوە و کەڵلەڕەقەکان شەرمەزار نیە.

لێرە شتەکان گشتیان دڵاوایانە دەگەڵ تۆ هاوڕا دەبن و دەگەڵ تۆ چێژ وەردەگرن: چونکە دەیانەوێ سواری پشتی پەیڤەکەت بن. تۆ لێرە سوار لە سەر هەر مەجازێک بۆ لای هەر راستەقینەیەک داژۆیی.

تۆ لێرە دەگەڵ گشت شت ڕووڕاست و بە راشکاوی دەدوێی: بە راستی، هەرکات کەسێک دەگەڵ گشت شت بە راشکاوی بدوێ، ئەم قسەیە لە گوێی ئەوان دا زایەڵەی پەسنێک لەوان دەداتەوە!

بەڵام، وەلانان شتێکی دیکەیە. زەردەشت، ئایا لە بیرت ماوە ئەودەم کە لانەواز و غەریب لە لێڕەوار وەستابووی و جەندەکێکت لە پەنا بوو و نەتدەزانی بۆ کام لا بڕۆی؟ ئەوسا مەلەکەت سیڕاندی.

ـ و تۆ گوتت: «بلا گیاندارەکانم ڕێبەرم بن! ژیان لە نێو مرۆڤم لە ژیانی نێو گیانداران پێ پڕمەترسیترە»: ـ ئەمە وەلانان بوو.

ئەمەت لە بیرت ماوە، ئەی زەردەشت، ئەو دەمەی کە مینا کانیاوێکی شەڕاب، بەخشێنەر و دابەشێنەر، لە نێو گۆزە بەتاڵەکان دا لە دوڕگەکەت دانیشتبووی و بە سەر تینووکان دا دەتبەشیەوە و پێشکەشت دەکرد:

ـ هەتا ئەوە کە بە زمانی ویشک لە نێو مەستەکان دا دانیشتی و شەو گازندەت کرد کە: «ئایا ستاندن پیرۆزتر لە بەخشین نیە؟ و دزین پیرۆزتر لە ستاندن؟» ـ ئەمە وەلانان بوو.



ئەمەت لە بیرت ماوە، ئەی زەردەشت، کە بێدەنگترین سەعاتی تۆ داهات و تۆی لە خۆ دوور خستەوە و بە چرپەیەکی بەدخوازانە گوتی: «بێژە و خۆت تێکی بشکێنە!»

ـ ئەوسا کە تۆی لە تەواوی چاوەڕوانی و بێدەنگیت سەرشۆڕ کرد و خۆفی دە بوێریی خۆبەچووک دانانت خست: ئەمە وەلانان بوو!» ـ

ئەی تەنیایی، ئەی ماڵی من، تەنیایی! دەنگت چەندە خۆش و بە لاواندنەوە دەگەڵ من دەدوێ!

ئێمە پرسیار لە یەکدی ناکەین. ئێمە گازندە لە یەکدی ناکەین. ئێمە بە کراوەیی دەگەڵ یەک بە نێو دەرگا کراوەکان دا تێدەپەڕین.

چونکە لای تۆ کراوە و رووناکە. لێرە سەعاتەکانیش شل هەنگاو هەڵدێننەوە. چونکە لە تاریکی دا زەمان سەختتر بە سەر مرۆڤ دا تێدەپەڕێ هەتا لە رووناکی دا.

لێرە وشەکان و وشەدانەکانی بوون گشتیان بۆ من دەکرێنەوە: بوون، لێرە دەیەوێ ببێتە وشە، بوون لێرە دەیەوێ لە من دوان فێر بێ. بەڵام لەو خوارە ـ هەر قسەیەک بێکەلکە. لەوێ بەرزترین فرەزانیی، لە بیر کردن و لێ تێپەڕینە: نووکە ئەمە فێر بووم.

ئەوەی بیەوێ گشت شتێکی مرۆڤ بناسێ، دەبێ دەست لە هەموو شتێکیان بدا. بەڵام دەستەکانی من لەوە پاکترن کە بۆ ئەم کارە ببن.

من تەنانەت نامەوێ لەو هەوایەی دا کە ئەوان پشوو دەدەن پشوو بدەم. ئاخ کە درێژماوەیەک لە نێوان هات و هەرا و هەناسە بۆگەنەکانیان دا ژیاوم!

ئەی بێدەنگیی پیرۆزی دەورووبەرم! ئەی بۆنە پاکەکانی دەورووبەرم! ئاخ، سینگی قووڵی ئەم بێدەنگییە چ پاک هەناسە هەڵدەکێشێ! ئاخ، چلۆن گوێ رادەدێرێ ئەم بێدەنگییە پیرۆزە.

بەڵام لەو خوارە ـ گشت شتێک قسە دەکا و گشت شتێک نەبیسراو دەمێنێتەوە. دەکرێ فرەزانیی خۆت، مینا ناقووسێک وە دەنگ بێنی؛ بەڵام دوکاندارەکان لە بازاڕ دەنگەکەی بە زرینگەزرینگی دراوەکانیان دەکووژن.

لای ئەوان گشت شتێک قسە دەکا و ئیدی کەس نازانێ چلۆن دەبێ تێبگا.

گشت شتێک دەبێتە بڵقی سەر ئاو، ئیدی شتێک دە چاڵاوە قووڵەکان ناکەوێ.

لای ئەوان گشت شتێک قسە دەکا و ئیدی شتێک بە جێ و ئاکامێک ناگا. گشتیان قرتەقرتیان دێ، بەڵام کێ هەیە کە هێشتا بیەوێ لە هێلانە دا کڕ بکەوێ و هێلکەکان پێبگەیەنێ؟

لای ئەوان گشت شتێک قسە دەکا و لە گشت شتێک زۆر قسە کراوە و ئەوەی کە دوێنێ بۆ رۆژگار و ددانەکان زۆر رەق بوو، ئێمڕۆ جووتراو و کوتراو لە لیچی مرۆڤە ئیمڕۆییەکان شۆڕ بۆتەوە.

لای ئەوان گشت شتێک قسە دەکا و گشت شتێک درکێندراوە و ئەوەی کە سەردەمایەک بە راز و نهێنی رووحە قووڵەکان دادەندرا، ئێمڕۆ هی جارِدەرانی کۆڵان و پەپوولەکانە:

ئەی زاتی مرۆڤایەتی، ئەی سەیر و سەمەرە! تۆ لە کۆڵانە تاریکەکان دا هات و هەرا دەکەی! نووکە تۆ دیسان لە پشت منی: گەورەترین مەترسیم لە پشتەوەی منە!

گەورەترین مەترسیم لاواندنەوە و بەزەییە؛ و ئەوەی کە زاتی مرۆڤایەتییە داخوازی لاواندنەوە و بەزەییە.

بە راستەقینە شاراوە، بە دەستی شێت و دڵی گیرۆدە و توانا لە درۆ بچووکەکانی بەزەیی: من لە نێو مرۆڤ دا هەمیشە وەها ژیاوم.

لە نێویان دا بە بەرگی گۆڕاو دانیشتووم، ئامادە بۆ خۆ نەناسینەوە، هەتا بتوانم توانای دیتنیانم هەبێ و وەها خۆم دڵ داوە کە «تۆ، ئەی شێت، مرۆڤ نەناسی!»

هەرکەس کە لە نێو مرۆڤ دا دەژی، ئەوان لەبیر دەکا: لە نێو مرۆڤ دا ئەوەند پێشوێنە هەیە کە چاوە دووربین ودوورگەڕەکان لەوێ کەلکی نیە.

کاتێک من نەناسنەوە، منی شێت پتر لە خۆم لێیان دەبوورم چونکە من دەگەڵ خۆم سەختگیرم و زۆر وایە کە لەبەر ئەم لێبوردنە تۆڵە لە خۆم دەکەمەوە.

پێوەدراو بە مێشە ژاردارەکان و وەک بەردی سواو بە دڵۆپە بێ ئەژمارەکانی بەدخوازیی، لە نێویان دا دانیشتم و دیسان بە خۆم گوت: «تاوانی بچووکیی بچووکەکان سووچی ئەوان نیە!»



بە تایبەت ئەوانەی کە خۆ بە «چاکان» ناو دەبەن چەشنی مێشە هەرە ژاردارەکانم دیتن. ئەوان بە بێگوناهییەکی تەواوەوە پێوە دەدەن، ئەوان بە بێگوناهییەکی تەواوەوە درۆ دەکەن. ئەوان چلۆن دەیانتوانی دەگەڵ من ـ دادخواز بن.

ئەوەی کە لە نێو چاکان دا دەژی، بەزەیی فێرە درۆ گوتنی دەکا. بەزەیی، هەوا بۆ گشت رەوانە ئازادەکان خەفە دەکا. چونکە گەوجایەتی چاکان کۆتایی ناناسێ.

شاردنەوەی خۆ و دارایی خۆ لەو خوارە فێر بووم: چونکە دانە بە دانەی ئەوانم بە گیان هەژار دیت.

ئەوە درۆی بەزەییم بوو کە منی وەها لێکرد هەتا لە هەر کەسێک دا بناسم و ببینم و بۆن بکەم ئەوەی کە بۆ گیانی بەسە و ئەوەی کە بۆ گیانی پتر لە رادەیە.

فرەزانە بێکەسایەتییەکانی ئەوانم بە فرەزان دانا نەک بە کەسایەتی: وەها فێر بووم کە وشەکان قووت بدەم. گۆڕکەنەکانیانم بە لێکۆڵەر و تاقیکەرەوە ناو بردن ـ وەها فێر بووم کە وشەکان قووت بدەم.

گۆڕکەنەکان نەخۆشی بۆ خۆیان هەڵدەکەنن. لە ژێر زبڵە کۆنەکان دا بۆنی گەنیو خەوتوە. نابێ لم و لیتە بشێوێنی، دەبێ لە سەر کێو بژی.

جارێکی دی بە لووتێکی شادەوە لە هەوای ئازادی کوێستان دا پشوو دەدەم و لە ئاکام لووتم لە بۆنی ئەوەی کە زاتی مرۆڤایەتییە ئازاد بوە!

رەوانم کە لەبەر شنە توندەکان و شەڕابە روونەکان وە خورووە کەوتوە، دەپشمێ ـ و پیرۆزبایی لە خۆی دەکا: عافیەتت بێ!

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە سێ شتی خراپ

### ١

لە خەونم دا، لە دوایین خەونی بەرەبەیان دا، ئێمڕۆ لە سەر دوندی کێوێک،

لەوبەری دونیا وەستا بووم و تەرازووییەکم بە دەستەوە بوو و دونیام دەسەنگاند.

مخابن بەیانی زۆر زوو ئەنگووت! ئەو بەخیلە بە شۆقەکەی منی وە ئاگا هێنا! ئەو هەمیشە بەخیلی بە شۆقی خەونەکانی بەرەبەیانیم دێ.

خەونەکەم دونیای وەها دیت: شیاوی ئەندازە گرتن بۆ ئەو کەسەی کە دەرفەتی هەبێ. شیاوی هەڵسەنگاندن بۆ هەڵسەنگێنەرێکی باش، شیاوی پێوان بە باڵە بە هێزەکان، شیاوی [پەردەک] هەڵدان بۆ فندق شکێنە خوداشێوەکان.

خەونەکەم، ئەم دەریاگەڕە بوێرە، نیوە کەشتی، نیوە گژەبا، بێدەنگ وەک پەپوولە، بێ ئۆقرە وەک باشوو: ئیمڕۆ چلۆن دەرفەت و تاقەتی هەڵسەنگاندنی دونیای هەبوو؟

لەوانەیە فرەزانیم بە نهێنی قسەی دەگەڵ کردبێ؟ فرەزانی دەم بە پێکەنین و بە ئاگای ڕۆژانەم، کە بە تەواوی «دونیا بێبنەکان» پێدەکەنێ، چونکە دەڵێ: «لەو شوێنەی کە هێز لە ئارا دابێ، **ژمار** سەرۆکە: هێزی ئەو پترە.»

خەونەکەم بە چ دڵنیاییەکەوە ڕوانیە ئەم دونیا بێبنە، نە نوێخواز و نە کۆنەخواز، نە هەراسان، نە داخواز.

وەک سێوێکی خڕ خۆی پێشکەشی من کرد، زێڕن سێوێکی گەیشتوو، توێکڵ ناسک، فێنک و نەرم: دونیا وەها خۆی پێشکەشی من کرد.

وەک دارێک لە ئاستم چەمیوە، دارێکی بەهێز و پتەو و بە لک و پۆ، داچەمیو هەر وەک پاڵگەیەک یا پێگەیەک بۆ ڕێبوارێکی ماندوو: دونیا وەها لە سەر دوندی کێوەکەم وەستا.

وەک دەستگەلێکی شووش سندووقچەیەکی لە بەرابەرم دانا ـ سندووقچەیەکی کراوە بۆ شادی چاوگەلێکی شەرمن و پەسنکەر: دونیا وەها خۆی پێشکەشی من کرد.

نە وەها پەردەکێک کە ئەوینی مرۆڤایەتی لە خۆی برەوێنێ. نە وەها کراوە کە فرەزانی مرۆڤانە بخەوێنێ: دونیا ئیمڕۆ بۆ من شتێکی باش و مرۆڤانە بوو، تەواوەتی ئەو دونیایەی کە ئەوەندە بە خراپ لێیدەدوێن!

چەندە لە خەونی بەیانیم بە سپاسم کە ئیمڕۆ دونیام وەها تێدا هەڵسەنگاند! ئەو هەروەک شتێکی باش و مرۆڤانە بۆ لای من هات، ئەم خەونە و ئەم



ئەهوەنییەی دڵ!

بۆ ئەوە کە لە ڕۆژ دا دەرسی لێوەرگرم و شتە هەرە باشەکانی لێ فێر بم و ڕەچاوی بکەم، نووکە دەمەوێ سێ شتی هەرە خراپ لە تەرازوو بنێم و باش و مرۆڤانە هەڵیانسەنگێنم.

ئەوەی کە ئافەرین گوتنی فێر کرد تووک کردنیش فێر دەکا: سێ شتی هەرە تووک لێکراو لە دونیا دا کامانەن؟ دەمەوێ ئەوان لە تەرازوو بنێم:

هەوەسبازیی، دەستەڵاتخوازیی، خۆخوازیی: ئەم سێیە هەتا ئێستا لە هەموان تووک لێکراوترن و لە هەموان خراپتر بەدناوییان کێشاوە و خراپەیان بیستوە. دەمەوێ ئەم سێیە باش و مرۆڤانە هەڵسەنگێنم.

باشە! لێرە دوندی کێوەکەی منە و لەوێ دەریا، کە بەرەو من دەگەوزێ، ئەم پرچ ئاڵۆزە خۆ ڕێکخەرە، ئەم پیرە بە ئەمەگە، ئەم سەگ سەری ـ درنجی سەد سەر، کە خۆشم دەوێ.

باشە! لێرە دەمەوێ تەرازوو لە سەر دەریای گەوزاوی ڕاگرم: و شاهیدێکیش هەڵبژێرم هەتا سەیری بکا ـ تۆ، ئەی تاکەداری خۆش بۆن و بەرامەی بە لک و پۆ، کە خۆشم دەوێی!

بە سەر کام پردی «ئێستا» دا بۆ لای ڕۆژگارە داهاتووەکان دەڕوا؟ کام هێز، بەرز بەرەو نزمی دەکێشێ؟ و کامەیە کە بە هەرە بەرز دەفەرمێ هەتا دیسان بەرزتر بێتەوە؟

نووکە تەرازوو تەراز و بێبزووتە: سێ پرسیاری قورسی تێدەخەم، قاپەکەی دیکەی سێ وڵامی قورسی تێدایە.

## ۲

هەوەسبازیی: بۆ پەشمینەپۆشەکانی بە سووک دانەری لەش وەک دڕک و سێدارەی سووتێنەری لادەرانی دین وایە و ئەهلی دوارۆژ بە ناوی «دونیا» تووکیان لە هەمووی ئەوان کردوە: چونکە ئەو گشت مامۆستایانی پەشێوی و سەرگەردانی بە گاڵتە دەگرێ و فشەیان پێدەکا.

هەوەسبازیی: بۆ رەزیلەکان ئاگرێکی کەم تینە کە لە سەری دەبرژێن؛ تەندوورێکی بە تینی بە چڕە دووکەڵی هەوەسبازییە بۆ گشت دارە کرمێونەکان و بزگوڕە شڕە چەپەڵەکان.

هەوەسبازیی: لای ئازادەدڵەکانی بێتاوان و ئازادەیە، باغی شادیی زەوی و هەڵقوڵانی سپاسەکانی تەواوەتی داهاتوو لە ئێستا دا.

هەوەسبازیی: بۆ ژاکاوەکان ژارێکی شیرینە، بەڵام بۆ ورە ـ شێرەکان هێزدەرێکی مەزنی دڵ و بادەی ئەو بادەیانەیە کە بە رێزەوە رادەگیرێن.

هەوەسبازیی: شادخوازییەکی گەورەیە کە ئیستعارەیەکە لە شادخوازییەکی گەورەتر و بەرزترین هیوا. چونکە مزگێنی ژن و مێردایەتی و بەرزتر لە ژن و مێردایەتیان بە گەلێکان داوە ـ

ـ گەلێک کە دەگەڵ یەک بێگانەترن لە ژن و مێرد ـ و کێیە کە بە تەواوەتی بۆی دەرکەوتبێ کە ژن و مێرد دەگەڵ یەک چەندە بێگانەن؟ ـ

هەوەسبازیی: ـ بەڵام دەمەوێ بە دەوری بڕواکانم و بە دەوری وشەکانم دا پەرژینێک بکێشم هەتا بەرازەکان و خۆش رابوێرەکان شالاو بۆ سەر بێستانەکەم نەهێنن!

دەستەڵاتخوازیی: قەمچی ئاگرین بۆ دڵڕەقترین دڵڕەقەکان؛ بە سامترین عەزابێک کە بۆ زۆردارترین کەس راگیراوە؛ کڵپەیەکی تار لە خەرمانی ئاوردوویەکی زیندوو.

دەستەڵاتخوازیی: مۆزێکی لاسار کە بە خۆخوازترین گەلەکانەوە نووساوە؛ کە گاڵتەجاڕانە لە گشت ئاکارباشیە گومان لێکراوەکان، لە سەر هەر ئەسپێک و هەر غروورێک سوارە.

دەستەڵاتخوازیی: بوولەرزەیەک کە شتە پواو و پووکەکان دەقەڵەشێنێ و لێکیان دەپچڕێ. سزادەرێکی بە گرم و هۆڕ کە گۆڕە رازاوەکان تێک دەشکێنێ، نیشانەی پرسیارێکی برووسکاسا لە پەنا وڵامە کۆنەکان.

دەستەڵاتخوازیی: مرۆڤ لە بەرابەر نیگاکەی دەخزێ و خۆ دەدزێتەوە و دەبێتە بەندە و لە بەراز و مار پەستتر دەبێ ـ هەتا ئەوە کە لە ئاکام بە سووک دانەریی گەورە لە دەروونیەوە هاوار بەرز دەکاتەوە.



دەستەڵاتخوازیی: مامۆستای بە سامی بە سووک دانانی گەورە، ئەوەی کە بەرەورووی شارەکان و وڵاتەکان موعیزەی دەکا: «مەرگ بۆ تۆ!» ـ هەتا ئەوەکە لە دەروونی خودی ئەوانەوە هاوار بەرز بێتەوە: «مەرگ بۆ من!»

دەستەڵاتخوازیی: هەر ئەوەی کە، بە وەسوەسەوە بۆ لای پاکان و تەنیایان و بۆ لای بەرزاییەکانی خۆی، گەلێک بەرز سەر دەکەوێ، درەوشاوە هەروەک ئەوینێک کە بە وەسوەسەوە شادی ئەرخەوانیەکان لە سەر ئاسمانەکانی زەوینی دەنەخشێنێ.

دەستەڵاتخوازیی: بەڵام کێ ئەو بە زۆرخۆر دادەنێ ئەگەر تاسەی بەرز بە دوای هێز دا بێتە خوار؟ بە راستی، ئەم تاسە و داهاتنە خوارە شتێکیان لە نەخۆشی و ناسازی تێدا نیە!

چونکە بەرزاییە تەنیاکان نابێ هەتا ئەبەد تەنیا و هەر بۆ خۆ بن؛ چونکە دەبێ چیا بەرەو دۆڵ دابێتە خوار و بای بەرزاییەکان بەرەو نزمیەکان.

ئاخ، چ کەسێک ناوێکی باش و ئاکارباشییەکی دروستی بۆ وەها تاسەیەک دۆزیوەتەوە؟ زەردەشت رۆژێک ئەم ناودێرکراوەی بە «ئاکارباشی لەخۆ بوردوو» ناو برد.

هەر ئەودەم ـ و بەراستی، بۆ یەکەم جار ـ وەها رێکەوت کە پەیڤی ئەو، خۆخوازیی بە پیرۆز دانا! خۆخوازییەکی ساغ و لەش ساغ کە لە رەوانێکی بە هێز سەرچاوە دەگرێ.

لە رەوانێکی بە هێز کە لەشی بەرز هی ئەوە، لەشێکی جوان، سەرکەوتوو خواز، لەشساغ کە لە دەوروبەری ئەو، گشت شتەکان دەبنە ئاوێنە.

لەشێکی شلک و هاندەر، سەماکەرێک کە «رەوانی لاسار» کینایەیەکە لە ئەو و بە کورتی لە بارەی ئەو دایە. لاساریی وەها لەش و رەوانگەلێک خۆ بە «ئاکارباش» ناو دەبا.

ئەم لاسارییە بە قسەکانی لەمەڕ چاک و خراپ خۆی وەها ئاگاداری خۆیەتی کە دەڵێی مێشەیەکی پیرۆزی لە دەوری دراوە. ئەو بە ناوە بەختیارییەکانی ئەوەی کە شیاوی بە سووک دانانە لە خۆی دەتارێنێ.

ئەو تەواوی ترسەکان لە خۆی دەتارێنێ؛ ئەو دەڵێ: خراپ ـ یانی ترس! و ئەو

کەسەی کە هەمیشە نیگەرانە و ئاخ هەڵدەکێشێ و دەناڵێ لەبەر چاوی سووک دەبێ و هەروەتر ئەو کەسەی کە لە کەمترین قازانجێک خۆش نابێ.

هەروەتر هەموو فرەزانییەکی غەمخۆری پێ سووکە: چونکە بەراستی، فرەزانییەک هەیە کە لە تاریکی دا دەپشکوێ، فرەزانییەکی شەوڕەو کە هەمیشە ئاخ هەڵدەکێشێ «هەموو شت پووچە!»

بەدگومانی شەرمنانەشی پێ پەستە و هەروەتر ئەو کەسەی کە لە جیات دەست و نیگا داوای سوێند دەکا و فرەزانی پتر لە رادە بەدگومان، چونکە ئەمە رێ و رێبازی رەوانە ترسەنۆکەکانە.

هەروەتر ئەو ئامادە بە خزمەتە سەگ خدانەی کە زوو وەردەکەون پێی پەستترە، یانی خۆ بە کەم دانەران؛ ئادی فرەزانییەکیش هەیە کە خۆ بە کەم دانەر و سەگ خدە و لە خودا ترس و ئامادە بە خزمەتە.

لای ئەو بە تەواوەتی جێی بێز و دڵ دەخێڵەوە هێنەرە ئەو کەسەی کە قەت بەرگری لە خۆ ناکا، کەسێک کە تفە ژاراوییەکان و چاوە پیسەکان قووت دەدا، ئەو پتر لە رادە لەسەرخۆیە، کە دەگەڵ هەموو شت هەڵدەکا و لە هەموو شتێک رازییە: چونکە ئەمە داب و نەرێتی کۆیلەتییە.

ئەگەر کەسێک لە ئاست خوداکان و شەپەکانی خودایی بەندەیی بکا، یا لە ئاست مرۆڤ و رایەکانی گەوجانەی مرۆڤانە: ئەم خۆخوازییە پیرۆزە تف لە هەر چەشنە بەندەییەک دەکا!

خراپ: ئەو وەهای ناو دەبا ئەوەی کە پشت شکاو و بەندەی تێکشکاوە، چاوە ترووکێنەرە ئەسیرەکان و دڵە ژاکاوەکان و ئەو داب و نەرێتە دووڕوویانەی لێبوردوویی کە بە زاری ئاوەڵەی ترساوەوە رادەمووسن.

شێوە فرەزانی: ناوێکە کە ئەو دەیدا بە گشت گاڵتەجاڕی بەردەکان، پیرەمێردەکان و ماندووکان؛ بە تایبەت بە تەواوەتی شێتایەتی بەدخوازانەی نەفام و پتر لە رادە زیرەکی قەشە!

بەڵام، شێوە فرەزانەکان، گشتیان قەشەن و لە دونیا ماندوو بوان و ئەو رەوانانەی کە لە رەگەزی ژن و بەردەن.

ئاخ کە لە کایە کردن دەگەڵ خۆخوازیی دا چها گزیکارییەک کە نەیانکردوە!



دروست هەر ئەم گزیکارییە دەگەڵ خۆخوازییە کە دەبا ئاکارباشی با و بە ئاکارباشی ناوی ببردرێ!

«لەخۆ بوردوو» ـ هەر ئەو شتەیە کە ترسەنۆکەکانی لە دونیا ماندوو و جاڵجاڵۆکەکانی خاچ نشین بە هەق ئاواتیانە کە بن.

بەڵام نووکە هەموویان بە سەر دادێ، رۆژ، ئاڵوگۆڕ، شەمشیری داد، نیوەڕۆی مەزن: ئەودەم گەلێک شت ئاشکرا دەکرێ!

ئەو کەسەی کە «من» و خۆخوازیی بە پیرۆز دانا، بە راستی ئەو، ئەو پێشگۆیە، ئەوەی کە دەیزانێ دەریدەبڕێ: **«بڕوانە، دادێ، نزیکە، نیوەڕۆی مەزن!»**

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە گیانقورسی

### ١

زمان تیژییم ـ زمان تیژیی خەڵکە: دەگەڵ کەرۆیشکە هەوریشمینەکان زۆر توند و دۆستانە دەدوێم. بەڵام زایەڵەی قسەکەم بۆ گوێی گشت ماسی مەرەکەبەکان و نووسەرە خراپەکان بێگانەترە.

دەستم ـ دەستی شێتێکە: هاوار بە حاڵی مێزەکان و دیوارەکان و ئەوەی کە جێگەیەکی بۆ رازاندنەوە و شێواندنی شێتانە هەبێ!

پێم ـ پێی ئەسپێکە: کە لە سەر کەند و لەند، چەپ و راست، لە سەر دەشت و مێرگ پێیدەگەڕێم و داژوێم و لە غارغارێن چێژێکی شەیتانی وەردەگرم.

گەدەم ـ مەگەر گەدەی هەڵۆ نیە؟ چونکە گۆشت بەرخی لە هەموان پێخۆشترە. بەبێ شک ئەمە گەدەی باڵندەیەکە.

منێک کە فێری چێژی شتە بێگوناهەکان و کەمم، ئامادە و بێقەرار بۆ فڕین، فڕین بۆ دوور ـ چلۆن دەکرێ کە شتێک لە رەگەزی مەل لە من دا نەبێ؟

هەروەتر سەرووتر لە گشت، دوژمنایەتیم دەگەڵ «گیانقورسی» نیشاندەری مەیلی مەلانەمە: بە راستی دوژمنی خوێنی، دوژمنی سەرەکی، دوژمنی زگماکی ئەوم! ئاخ کە دوژمنایەتیم هەتا ئێستا تا کوێ نەفڕیوە و هەتڵە نەبوە!

لەم بارەوە دەمتوانی هەتا ئێستا گۆرانییەک بڵێم ـ و دەمەوێ بیڵێم: هەرچەند کە لەماڵێکی چۆل دا تەنیام و دەبێ بۆ گوێچکەکانی خۆمی بڵێم.

بێشک، گۆرانیبێژی دیکەش هەن کە تەنیا خانووی پڕی گەروویان نەرم، دەستەکانیان وێژەر، چاوەکانیان زماندار دەکەن و دڵیان وەئاگا دێنن. من لەوان ناچم.

## ٢

ئەوەی کە رۆژێک، مرۆڤ فێرە فڕین دەکا، گشت بەردەڕێژی مەرزەکان هەڵدەوەژێرێ؛ بەردەڕێژەکان خۆیان لە ئاست ئەو دەردەپەڕن و ئەو زەوی بە ناوی «سووک» سەر لە نوێ ناودێر دەکاتەوە.

وشترمر لە هەر ئەسپێک توندتر غار دەدا، بەڵام ئەویش سەری خۆی بە قورسی دە زەوی قورس دەنێ: مرۆڤێکیش کە هێشتا ناتوانێ بفڕێ وەهایە.

زەوی و ژیان بۆ ئەو قورسن! گیانقورسی ئەوی هەر ئاوا دەوێ! بەڵام ئەوەی کە دەیەوێ سووک وەک باڵندە بێ، دەبێ خۆی خۆش بوێ ـ من وەها فێر دەکەم.

بەڵام بێشک، نەک بە ئەوینی نەخۆشەکان و دەردەدارەکان: چونکە لای ئەوان خۆخۆشەویستیش بۆگەنیوی لێدێ.

دەبێ خۆ خۆش ویستن فێر بن ـ من وەها فێر دەکەم ـ بە ئەوینێکی ساغ و دروست، وەها کە بتوانێ لای خۆی بمێنێتەوە و سەرگەردان نەبێ.

وەها سەرگەردانییەک خۆی بە «هاوساخۆشەویستی» ناودێر دەکا: بە وەها وشەگەلێک هەتا ئێستا پتر لە هەموان درۆیان کردوە و دووڕووییان نواندوە، بە تایبەت ئەوانەی کە لە سەر تەواوەتی دونیا قورسایی دەکەن.

بە راستی، فێر بوونی خۆخۆشەویستی فەرمانێک بۆ ئیمڕۆ و سبەی نیە، بەڵکە ئەمە هونەرێکە لە گشت هونەرەکان ناسکتر و زیرەکانەتر و دواییتر و لەسەرخۆتر.



چونکە گشت سامانەکانی ئەو لە خاوەنەکەی شاردراونەوە و گەنجی خۆی لە گشت گەنجێک درەنگتر دەهێندرێتە دەر ـ گیانقورسی وەهای داڕشتوە.

هەر لە سەر لانکەوە وشەکان و بایەخە قورسەکان بە ئێمە دەبەخشن: ئەم خەڵاتەی خۆیان بە «چاکە» و «خراپە» ناو دەبەن. لەبەر ئەوەیە کە گوناهی ژینمان پێدەبەخشن.

لەبەر ئەوە ئیزنی نزیک بوونەوە لە خۆیان بە منداڵەکان دەدەن هەتا لە کاتی خۆی دا ئەوان لە خۆخۆشەویستی دوور بخەنەوە: گیانقورسی وەهای داڕشتوە.

وە ئێمە ـ ئێمەش ئەوەی بە خەڵات بماندەنێ، ئەمەگدارانە لە سەر شانە سەختەکان بەرەو کوێستانی بەردەڵانی دەکێشین! و کاتێک ئارەقە بڕێژین، بە ئێمە دەڵێن: «ئادی، تاقەتی باری ژیان هێنان دژوارە!»

بەڵام، لە راستی دا، ئەوەی دژوارە تاقەت هێنانی مرۆڤە! چونکە گەلێک شتی نامۆی لە سەر شانەکانی داناوە ـ ئەو وەک وشتر ییخ دەخوا و لێدەگەڕێ کە چاک باری بکەن.

بە تایبەت مرۆڤی بە هێزی سێبوور کە رێز لەو دا ماڵی چێ کردوە: ئەو گەلێک پەیڤ و بایەخە نامۆکان لە خۆ بار دەکا ـ دەڵێی ژیان لە چاوی دا هەر وەک بیاوانێکە.

بە راستی، گەلێک شت هی ئێمەیە و تاقەت هێنانیان دژوار! گەلێک شت لە دەروونی مرۆڤ دایە کە هەروەک نێوەکی سەدەف بێزاویی و لیچقە.

وەها کە توێکڵێکی شایانە، بە نەخش و نیگارێکی شایانە لە لایەن ئەوەوە داوای لێبووردن دەکا. بەڵام، هەبوونی توێکڵ و رواڵەتی رازاوە و کوێریی زیرەکانەش هونەرێکە کە دەبێ فێری بی.

بەڵام گەلێک شت لە مرۆڤ دا هەڵخەڵەتێنەرە، چونکە گەلێک توێکڵی بێنرخ و بەبێز هەن کە پتر لە رادە توێکڵن. گەلێک چاکە و هێزی شاراوە هەن کە قەت کەس پەیان پێنابا. بە تامترین بابۆڵەکان چێژکەرێک نادۆزنەوە!

ژنەکان ئەمە دەزانن، بە تامترین شتەکان: هەندێک قەڵەوتر، هەندێک لاوازتر ـ ئاخ، چها چارەنووس لەم هەندێکە دا شاراوەیە!

دۆزینەوەی مرۆڤ دژوارە و لە هەموان دژوارتر دۆزینەوەی خۆ. گەلێک جاران

گیان سەبارەت بە رووح درۆ دەکا. گیانقورسی وەهای دارِشتوە.

بەڵام ئەو کەسەی کە خۆی دۆزیبێتەوە، دەڵێ: «ئەوەیە چاکە و خراپەی من». و بەمە زاری جرجەمشک و گورِنی دەبەستێ کە دەڵێن: «چاکەی گشت کەس، خراپەی گشت کەس.»

بە راستی، ئەوانەی کە گشت شتێک بە باش دەزانن و ئەم دونیایە بە باشترین دونیا ناو دەبەن، خۆشم ناوێن. من ئەوانە بە «رازی بە گشت شت» ناو دەبەم.

باشترین تام هی رازی بە گشت شتێک نیە کە دەتوانێ گشت شتێک بچێژێ! من رێز لەو زمان و گەدە لاسار و هەڵبژێنەرە دەگرم کە «من» و «ئا» و «نا» گوتن فێر بوون.

هەر شتێک جووتن و قووت دان ـ خدەی بەرازانەیە! هەمیشە «ئا.. ئا..» گوتن تەنیا ئیشی کەر و ئیشی ئەو کەسەیە کە گیانێکی کەرانەی هەیە!

مەیلی من زەردی تۆخ و سووری داغی لا پەسەندە: مەیلم خوێن دەگەڵ گشت رەنگێک تێکەڵ دەکا. هەر کەس کە گێچاو لەماڵەکەی هەڵسوێ، رەوانی گێچاو خواردووی خۆی بە من دەنوێنێ.

یەک ئەوینداری موومیاییەکانە، ئەوی دی ئەوینداری تاپۆکان و هەر دوو دوژمنی گۆشت و خوێنن ـ ئاخ کە ئەم دوانە چەندە پێچەوانەی مەیلی منن! چونکە من ئەوینداری خوێنم.

پێم خۆش نیە لە شوێنێک ماڵ و حاڵ ساز کەم کە هەر کەسێک پف و تفی لێدەکا: مەیلی من وەهایە. پێم خۆشترە لە نێو دز و درۆزنەکان دا بژیم. کەس زێرِ لە زاری دا ناشارێتەوە.

بەڵام لەوان نابەدڵتر لای من کاسەلێسەکانن؛ نابەدڵترین گیانداری مرۆڤایەتی کە دۆزیمەوە بە ناوی «مفتەخۆر» ناودێرم کرد: ئەو نایەوێ ئەویندار بێ و سەرەرِای ئەوە دەیەوێ بە ئەوینی خەڵکی دی بژی.

من ئەو کەسەی کە لە رێگایەکی پتر نیە بە بەخت وەرگەرِاو دادەنێم: یا دەبێ ببنە گیاندارە درِەکان یا دەستەمۆکەری گیاندارە درِەکان. من لە پەنا ئەوان ماڵێک بۆ خۆم ساز ناکەم.



هەروەتر بە بەخت وەرگەرِاویان ناو دەبەم ئەوانەی کە دەبێ هەمیشە چاوەرِێ بن ـ وەها کەسانێک پێچەوانەی مەیلی منن: یانی تەواوی باج ئەستێنەکان و کاسبکارەکان و پاشایان و زەوی دیکە ـ و دوکاندارەکان.

بە راستی، منیش فێرە چاوەرِێ بوون بووم و لە بنج و بناوانی خۆشمەوە ـ بەڵام تەنیا چاوەرِێی خۆ بوون و لە هەموان سەرتر، وەستان و رۆیشتن و هەڵاتن و بازدان و وەسەرکەوتن و سەما کردن.

بەڵام، ئەمەیە ئامۆتەی من: ئەوەی کە دەیەوێ رۆژێک فرِین فێر بێ، دەبێ لە پێشدا وەستان و رۆیشتن و هەڵاتن و وەسەر کەوتن و سەما کردن فێر بێ: فرِین بە فرِین دەست پێناکەن!

بە پەیژە گوریسینەکان لە گەلێک پەنجەرە وە سەر کەوتن فێر بووم، بە پێ چوستەکان لە بورجە بەرزەکان وە سەر کەوتم: دانیشتن لە سەر بورجە بەرزەکانی زانایی شادییەکی چووکە نەبوو.

ـ وەک بڵێسەیەکی چووک لە سەر بورجە بەرزەکان ئایسان: بە راستی، شۆقێکی چووک بوون، بەڵام دڵگەرمییەکی گەورە بۆ دەریاگەرِە رێ لێشێواوەکان و کەشتی لێشکاوەکان.

من بە گەلێک رێگا و رێباز دا گەیشتوومە راستەقینەی خۆم: من تەنیا بە پەیژەیەک هەتا بەرزایی نەچووم کە لەوێ چاوەکانم لە دوورەدەستەکانم دەگەرِێن.

هەمیشە بە بێمەیلیەوە رێگام لە خەڵک پرسیوە: چونکە ئەم کارە هەمیشە بە پێچەوانەی مەیلی منە! پێم خۆشتر بوە کە رێگاکان لە خۆم بپرسم و لێی بگەرِێم.

رۆیشتنم هەمووی پرسیار و لێگەرِان بوە: و بەراستی، بۆ وەها پرسیارگەلێک دەبێ وڵامیش فێر بێ! بەڵام ـ ئەمە مەیلی منە.

مەیلێک کە نە باشە و نە خراپ، بەڵکە مەیلی منە، مەیلێک کە ئیدی نە شەرمم لێی هەیە و نە دەیشارمەوە.

بەوانەی کە «رێگا»یان لە من پرسیوە، وەهام وڵام داوەتەوە: «ئەمە ـ نووکە رێگای منە. رێگای ئێوە کامەیە؟» چونکە رێگای موتڵەق هەر نیە.

وەهای گوت زەردەشت.

## سەبارەت بە دەپە نوێ و کۆنەکان

### ١

من لێرە دادەنیشم و چاوەڕێم، دەپە شکاو و کۆنەکان لە دەوروبەرمن و هەروەتر دەپە نیوە نووسراوە نوێیەکان. کەی کاتی من دادێ؟

ـ کاتی چوونە خوار و ئاوا بوونم: چونکە دەمەوێ جارێکی دی بۆ لای مرۆڤ بچمەوە.

لەبەر ئەوە نووکە چاوەڕێم چونکە پێشتر دەبێ نیشانەکانی داهاتنی کاتی من دابێن: یانی، شێری دەم بە پێکەنین دەگەڵ پۆلی کۆتران.

لەم بەینە دا وەک کەسێک کە ماوەی هەیە دەگەڵ خۆم قسە دەکەم. کەس شتێکی تازەم بۆ ناگێڕێتەوە: کەوایە خۆم بۆ خۆمی دەگێڕمەوە.

### ٢

کاتێک گەیشتمە مرۆڤ، ئەوانم لە سەر گومانێکی کۆنە دیت کە پاڵیان دابۆوە: هەموویان لە کۆنەوە پێیانوابوو کە دەزانن چ بۆ مرۆڤ باشە و چ خراپ.

بە بڕوایان هەر قسەیەک لەمەڕ ئاکارباشی قسەیەکی کۆنی ئاسایی بوو؛ ئەوەی کە دەیەویست باش بخەوێ، بەر لە چوونە نێو جێ لەمەڕ «چاکە» و «خراپە» دەدوا.

بەڵام من ئەو شێوەخەوەم بەم ئامۆژەیە شێواند: چ کەس نازانێ چاکە و خراپە چیە، جگە لە ئافرێنەر!

ـ ئەو، ئەو کەسەیە کە بۆ مرۆڤ ئامانج دەئافرێنێ و بە زەوی مانای خۆی و



داهاتووی پێدبەخشێ: وەها کەسێک بەر لە هەموو شتێک ئافرێنەری ئەوەیە کە شتێک خراپە یا چاکە.

من ئەمرم پێکردن کە کورسیە کۆنەکانی فێر کردن و هەر تەختێکی کە ئەو گومانە کۆنە لە سەری پاڵی داوەتەوە وەرگێڕن. من پێم گوتوون کە بە مامۆستا گەورەکانی ئاکارباشی و قەدیسەکان و شاعیرەکان و «رزگاریدەرانی جیهانی» خۆیان پێبکەنن.

ئەمرم کردوە کە بە فرەزانە غەمبارەکەیان و هەر کەسێک کە وەک داوەڵی رەش، بە ترس و لەرزەوە، لە سەر داری ژیان هەڵنیشتوە، پێبکەنن.

لە شاڕێی گۆڕستانەکەیان و لە پەنا مردارەکان و مردارەخۆرەکانیان دانیشتم ـ و بە تەواوی رابوردوو و مەزنایەتی بەرەو پوان و فەوتانیان پێکەنیم.

بە راستی، وەک موعیزەکەرانی تۆبە و شێتەکان بە سەر گشت شتە چووک و گەورەکانیان دا هاواری تووڕەیی و رقم دەربڕی ـ کە بۆچی باشترین شتیان وەها بچووکە! کە بۆچی خرابترین شتیان وەها بچووکە ـ من وەها پێکەنیم.

تاسەی فرەزانیم لە دەروونمەوە وەها هاواری دەربڕی و پێکەنی، تاسەم کە بە راستی فرەزانێکی کێویی کێوزایە ـ تاسە مەزنە تیژباڵەکەی من.

زۆر جار لە جەنگەی پێکەنین دا منی بۆ خوار و سەر و دوور کێشا: ئەوسا بە لەرزەلەرز، وەک تیرێک، بە نێوان خۆشییەکی سەرمەست لە هەتاو فڕیم ـ

فڕیو هەتا ئەو داهاتوە دوورانەی کە چ کەس هێشتا بە خەونیش نەیدیوە، هەتا ئەو باشووره هەره گەرمانەی کە وێنەکێشەکان خەونی پێوە دەبینن: هەتا ئەو شوێنەی کە لەوێ خودا سەماکەرەکان شەرم لە هەر جلێک دەکەن ـ

بە راستی شەرم لە خۆم دەکەم کە بۆچ دەبێ شاعیر بم و بە مەجاز قسە بکەم و هەروەک شاعیرەکان زمانێکی لەنگ و لۆرم هەبێ! ـ

هەتا ئەو جێیە کە تەواوەتی «بوون» لەبەر چاوم بوو بە سەمای خوداکان و بەدخوازیی خوداکان و دونیای ئازاد لە خۆشیان و لە خەنیان بۆ لای خۆ لە فڕین دا بوو ـ

هەروەک ئەبەدییەت لە یەک راکردن و دیسان یەکدی دیتنەوەی گەلێک خودا، هەروەک بە شادخوازییەوە دەگەڵ یەک تێکەڵاو بوون، لێک هەڵبڕان و دیسان

دەگەڵ یەک تێکەڵاو بوونەوەی گەلێک خودا.

لەوێ کە زەمان گشتی لەبەر چاوم گاڵتەیەکی شادخوازانە دەگەڵ ساتەکان بوو، لەوێ کە جەبر بە تەواوەتی ئیختیار بوو و بە نەقیزەیەک کە ئیختیار تێیدەکوتا بە شادییەوە کایەی دەکرد.

لەوێ کە کۆنە شەیتانەکەم و سەرووی دوژمنەکانم دیسان دیتەوە، ئەو گیانقورسییە، و ئەوەی کە ئەم ئافراندوویەتی: زۆریی، دەستوور، پێویستی، ئاکام، ئامانج، ویست و چاکە و خراپە.

مەگەر ئەوە نیە کە شتێک دەبێ ببێ کە لە سەری سەما بکەن و بە سەما بە سەری دا بڕۆن؟ مەگەر ئەوە نیە کە جرجەمشکەکان و گوڕنی گیانقورسەکان دەبێ لەبری بارسووک و بارسووکترەکان لە ئارا دا بن؟

### ٣

هەر لەوێ بوو کە من وشەی «بەرزەمرۆڤ»م لە سەر ڕێگا کۆ کردەوە و هەروەتر ئەمە کە مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی ـ

کە مرۆڤ پردێکە نە ئامانجێک، کە خۆی لەبەر نیوەڕۆ و شەوەکانی خۆی کە هەر وەک ڕێیەک بۆ لای بەرەبەیانە نوێیەکان لە بەرە، بە پیرۆز دادەنێ ـ

لەبەر پەیڤی زەردەشت لەمەڕ نیوەڕۆی مەزن و هەر شتێکی دیکە کە من هەروەک دوایین شەبەقی ئەرخەوانی لە بان سەری مرۆڤ هەڵمواسیوە.

بە ڕاستی، وێڕای شەوە تازەکانیان هەسێرە تازەکانم پێداون؛ و لە سەر هەور و ڕۆژ و شەو، پێکەنینم وەک تاوڵێکی ڕەنگین هەڵداوە.

گشت هەوڵ و تێکۆشانی خۆم فێرە ئەوان کردوە: یەک کردن و لێک کۆ کردنەوەی ئەوەی کە لە مرۆڤ دا کوت کوت و پەردەک و کارەساتی بە سامە ـ

بە ناوی کۆکەرەوە و پەردەک هەڵدەر و ڕزگاریدەری کارەسات، ئەوانم فێر کردوە کە بۆ داهاتوو تێبکۆشن و بە ئافرێنەرییەوە تەواوەتی ڕابوردوو ڕزگار بکەن.



ڕزگار کردنی ڕابوردووی مرۆڤایەتی و هەر «وەها بوو»یەک ئافراندنەوە، وەها کە ویست بڵێ: «بەڵام، من ئەوم وەها دەویست! من ئەوم وەها دەوێ» ـ

من ئەمەم بە ڕزگاری ئەوان ناو نا و فێرم کردن کە تەنیا ئەمە بە ڕزگاری ناو بەرن.

نووکە من چاوەڕوانی ڕزگارییەکم کە هی **منە** ـ هەتا بۆ دوایین جار بۆ لای ئەوان بچمەوە.

کەوایە جارێکی دیکەش دەمەوێ بۆ لای مرۆڤ بچمەوە و لە نێو ئەوان دا ئاوا بم و لە ئاویلکە دان دا بە بایەخترین دیاری خۆمیان پێبدەم!

من ئەوە لە هەتاوی ئەنگراو فێر بووم کە کاتی ئاوا بوون لە خەزێنەی بێبنی دەوڵەتی خۆی زێڕ لە دەریا دەکا.

وەها کە دەستکورتترین تۆڕەوانیش بە سەوڵە زێڕنەکانی سەوڵ دەکوتێ! ڕۆژێک ئەمەم دیت و بارانی فرمێسکم لەم ڕوانینە دا نەدەبڕاوە.

ڕۆژێک زەردەشتیش دەیەوێ وەک هەتاو ئاوا بێ: نووکە لێرە دادەنیشێ و چاوەڕێیە، دەپە شکاوە کۆنەکانی لە دەوروبەرە و هەروەتر دەپە نیوە نووسراوە نوێیەکان.

### ٤

ئەوەتا دەپێکی نوێ: بەڵام براکانم لە کوێن هەتا یارمەتیم بدەن ئەو بەرەو دۆڵەکان و دڵەگۆشتن و خوێنەکان بەرین؟

ئەوینی مەزنم بە دوورترینەکان، وەها داوا دەکا: ڕێز لە هاوساکەت مەگرە! مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بی.

بۆ زاڵ بوون گەلێک ڕێگا و چارە هەیە: بە شوێن ڕێگا و چارەی خۆتەوە بە! تەنیا ویشکەڕنێک پێیوایە کە «دەتوانێ بە سەر مرۆڤیش دا باز بدا.»

لە هاوساکەشت دا بە سەر خۆت دا زاڵ بە: مافێک کە دەتوانی بۆ خۆتی بڕفێنی نابێ ئیزن بدەی کە پێتی بدەن.

ئەوەی کە تۆ خۆت دەتوانی بە خۆتی بکەی هیچکەسی دیکە نایتوانێ. بزانە

کە پاداشێک لە ئارا دا نیە.

ئەوەی کە ناتوانێ فەرمان بە سەر خۆی دا بدا، دەبێ فەرمانبەری بکا. گەلێک کەس دەتوانن فەرمان بە سەر خۆیان دا بدەن، بەڵام هێشتا گەلێک شت بۆ ئەو پێویستە هەتا ئەوەکە لە خۆی فەرمان بەرێ!

## ٥

ئەوانەی کە لە ڕەوانە نەجیبەکانن هیچ شتێکیان بە خۆڕایی ناوێ، بە تایبەت ژیان.

بەڵام ئەوەی کە لە ریزی عەوام دایە، دەیەوێ بە خۆڕایی بژی: بەڵام خۆ ئێمە لە ریزی ئەوان دا نین، لە ئاست ئەوە دا کە ژیان خۆی بە ئێمە بەخشیوە هەمیشە لە بیری ئەوە داین کە لە بەرابەر دا دەتوانین چ شتێکی پتر لە هەموان بدەینێ.

بە راستی ئەوە قسەیەکی گەورەیە کە گوتوویانە: «ئێمە هەر ئەو بەڵێنەی کە ژیان بە ئێمەی داوە، هەر ئەو بەڵێنە دەگەڵ ژیان بە جێ دێنین!»

لەو شوێنەی کە پیاو ناتوانێ لەزەت بدا نابێ داوای لەزەت بکا و ـ نابێ لەزەتی بوێ!

چونکە لەزەت و بێگوناهی شەرمنترین شتن: نایەوێ کەس لێیان بگەڕێ. دەبێ ئەوانت هەبێ ـ بەڵام وا باشترە کە لە گوناه و دەرد بگەڕێن.

## ٦

برایان، بەرەزا هەمیشە قوربانی دەکرێ. ئادی، نووکە ئێمە بەرەزاین.

خوێنی ئێمە لە هەموو قوربانخانە نهێنییەکان دا دەرێژرێ. ئێمە گشتمان لەبەر شانازی بوتە کۆنەکان دەسووتێن و دەبرژێن.

باشترین شتەکانمان هێشتا لاون و مەیلە پیرەکان دەبزوێن. گوشتمان ناسکە و پێستمان هەروەک کەوڵە بەرخە: ئێمە چۆن دەتوانین مەیلی کاهنە پیرەکان نەبزوێنین.

ئەو کاهنە پیرە هێشتا هەر لە ئێمە دایە و باشترین شتمان بۆ جەژنی خۆی



قوربانی دەکا. ئاخ، برایان، بەرەزاکان چلۆن دەتوانن قوربانی نەبن؟

بەڵام ئەمە ویستی رەگەزی ئێمەیە: من لاگری ئەوانەم کە خۆ نادۆزنەوە. من بە تەواوەتی ئەوینمەوە لاگری ئاوا بوانم: چونکە ئەوان بەرەو نەمانن.

## ٧

راستوێژیی ـ کارێکە کە کەم کەس پێیدەکرێ! و ئەو کەسەش کە پێیدەکرێ نایەوێ! بەڵام، چاکان لە گشت کەس کەمتریان پێدەکرێ.

هاوار لەم چاکانە! پیاوچاکان قەت راست نابێژن. وەها چاک بوونێک نەخۆشی گیانە.

ئەم چاکانە لاگری تەسلیمن، لاگری پێسپاردنن، دڵیان لاساکەرەوەیە، بنج و بناوانیان گوێ رایەڵە: بەڵام، کەسێک کە گوێ رایەڵ بێ، گوێ لە خۆی ناگرێ!

ئەوەی کە چاکان بە خراپی دادەنێن هەموویان دەبێ لێک کۆ بنەوە هەتا راستەقینەیەک بژێ: برایان: ئایا ئێوەش بۆ وەها راستەقینەیەک ئەوەند کە پێویستە بەدخوازن؟

لە مەترسی خستنی دلێری، بەدگومانی درێژخایەن، «نا»ی دڵرەق، دڵ شێوان، پەی بردن بە بوونەوەری زیندوو ـ ئەوانە چەندە کەم یەکجێ پێکەوە کۆ دەبنەوە. بەڵام لە وەها تۆمێکە کە راستەقینە پێدەگا!

زانایی هەتاکوو ئێستا لە پەنا ویژدانی بەدخواز رسکاوە! بیشکێنن، بیشکێنن، ئەی هەڵسەنگێنەران، دەپە کۆنەکان.

## ٨

ئەودەم کە ئاو هەڵدەستێ، ئەودەم کە پرد و لەمپەرەکان بە سەر رووبار دا باز دەدەن: بە راستی، کەس باوەڕ بە قسەی ئەو کەسە ناکا کە دەڵێ: «هەموو شت تێدەپەڕێ.»

تەنانەت ساویلکەکانیش دەگەڵی بە کێشە دێن. ساویلکەکان دەڵێن: «چلۆن؟ هەموو شت تێدەپەڕێ؟ ئیدی ئەو پرد و لەمپەرانەی سەر رووبار چن؟»

«لە سەر رووبار هەموو شت لە سەر جێی خۆیەتی، گشت بایەخی شتەکان، پردەکان، ماناکان، تەواوەتی «چاکە» و «خراپە»: هەموو لە سەر جێی خۆیانن!»

بەڵام کاتێک زستانی ویشکەبەند، ئەم دەستەمۆکەری گیانلەبەری رووبار بگاتێ، ئەوسا هەرە ژیرەکەیان شک هەڵیدەگرێ؛ بە راستی، ئەوسا تەنیا ساویلکەکان نین کە دەڵێن: «ئایا بەڵێن نەبوو کە هەموو شتێک ـ لە سەر جێی خۆی بوەستێ؟»

«لە بنەڕەت دا هەموو شت دەوەستێ» ـ ئەمە ئامۆتەیەکی دروستی زستانییە، شتێکی شیاوی رۆژگاری ئەستێوری، ئارامکەرەوەیەکی شیاو بۆ بوونەوەرانی زستان خەوتوو و خانەنشینەکان ـ

«لە بنەڕەت دا هەموو شت دەوەستێ» ـ بەڵام بای شەماڵ بە دژی ئەمە موعیزە دەکا!

بای شەماڵ گایەکی بۆغەیە، بەڵام نە گایەکی گاجووت، گایەکی تووڕەیە، وێرانکەرێکە کە سەهۆڵ بە شاخی تووڕەی دەشکێنێ و سەهۆڵیش ـ پردەکان!

برایان، ئایا نووکە هەموو شت تێناپەڕێ؟ ئایا پردەکان و لەمپەرەکان گشتیان نەکەوتوونە نێو ئاو؟ ئیدی کێ دەتوانێ خۆی بە «چاکە» و «خراپە» هەڵواسێ؟

«هاوار بۆ ئێمە! ئافەرین بۆ ئێمە! بای شەماڵ هەڵیکردۆتێ!» ـ برایان، لە هەموو رێگاکان وەها موعیزە بکەن!

## ٩

گومانێکی کۆنە هەیە کە بە «چاکە» و «خراپە» ناوی دەبەن. هەتا ئێستا چەرخی ئەم گومانە بە دەوری پێشگۆ و ئەستێرەبینەکان دا گەڕاوە.

سەردەمایەک مرۆڤ ئیمانی بە پێشگۆ و ئەستێرەبینەکان هەبوو: و لەبەر ئەوە ئیمانی هەبوو کە «هەموو شت چارەنووسە: تۆ دەبێ چونکە تۆ ناچاری.

لە دوایی مرۆڤ لە پێشگۆ و ئەستێرەبینەکان بەدگومان بوو: و لەبەر ئەوە



ئیمانی هێنا کە: «هەموو شت ئازادە: تۆ دەتوانی، چونکە تۆ دەتەوێ!»

برایان، لەمەڕ ئەستێرەکان و داهاتوو هەتا ئێستا تەنیا گومان لە ئارا دا بوە نە زانست: و لەبەر ئەوە سەبارەت بە چاکە و خراپە هەتا ئێستا گومان لە ئارا دابوە نە زانست!

## ١٠

«تۆ نابێ بدزی، تۆ نابێ بکوژی!» ـ سەردەمایەک وەها پەیڤێکیان بە پیرۆز ناو دەبرد و لە ئاستی دا چۆکیان دادەدا و سەریان دادەنواند و پێڵاویان دادەکەند.

بەڵام لە ئێوە دەپرسم: لە کوێ دز و پیاوکوژانێکی باشتر لەم پەیڤانە لە دونیا دا هەبوون؟

ئایا لە تەواوەتی ژیان دا هیچ ـ دزی و پیاوکوژییەک نیە؟ و بە، بە پیرۆز دانانی وەها پەیڤگەلێک ئایا راستەقینەیان ـ نەکوشتوە؟

یا ئەمەی کە بە پیرۆزیان دانا موعیزەی مەرگ بوو کە دەگەڵ تەواوەتی ژیان کێشە و دژایەتی هەبوو؟ برایان بیشکێنن، بیشکێنن، دەپە کۆنەکان!

## ١١

بەزەییم بە سەر تەواوەتی رابوردوو دا لەوەیە کە ئەو بە لەیستۆک دەبینم.

لەیستۆکی لێبوردوویی، ئەقڵ و شێتایەتی هەر بەرەیەک کە دێ و هەرچییەک کە بوە بە پردێک بۆ خۆی دادەنێ!

زۆردارێکی گەورە، شەیتانێکی گزیکار دەتوانێ بێ، کە بە لێبوردوویی و نالێبوردوویی خۆی تەواوەتی رابوردوو رێک بکوشێ هەتا ببێتە پردی ئەو و نیشانەی سەرهەڵدان و بانگەشە و خوێندنی کەڵەبابی ئەو.

بەڵام ئەمەیە مەترسی دیکە و بەزەیی دیکەم: ئەوەی کە لە عەوامە پتر لە باپیرەکانی خۆی وەبیر نایەتەوە ـ دەگەڵ باپیری ئەو زەمان دەوەستێ.

بەمجۆرە تەواوی داهاتوو دەبێتە لەیستۆک: چونکە دەتوانێ رۆژێک دابێ کە

عەوام ببنە خونکار و زەمان بە تەواوەتی لە تەنکاوەکان دا نوقم بێ.

لەبەر ئەوە، برایان، پێویست بە چینێکی نەجیبی نوێ هەیە کە دەگەڵ تەواوی عەوام و گشت زۆرییەک، بە شەڕ بێ و لە سەر دەپە نوێیەکان وشەی «نەجیب» سەر لە نوێ بنووسێتەوە.

بەڵام بۆ ئەوە کە چینێکی نەجیب لە ئارا دابێ، دەبێ نەجیبێکی زۆر و نەجیبی جۆراوجۆر هەبن! یا هەر ئەوە کە من رۆژێک بە کینایە گوتوومە: «خودایەتی هەر ئەوەیە کە خوداکان هەبن نەک خودا!»

## ١٢

برایان، من ئێوە بەرەو چینێکی نەجیبی نوێ هان دەدەم و رێنوێنی دەکەم: ئێوە زاوزێکەران و بارهێنەران و تۆم پرژێنەرانی داهاتوو دەبن.

بە راستی، نە بەرەو چینێکی نەجیب کە بتوانن وەک دوکانداران و زێڕی دوکانداران بیکڕن: چونکە هەرچییەک نرخێکی هەبێ، بایەخێکی وەهای نابێ.

لەمە بەدواوە نەک لەو جێیەی کە دێن، بەڵکە بۆ ئەو جێیەی کە دەچن شەرەفی ئێوە دەبێ! ویستی ئێوە و پێی ئێوە کە دەیەوێ لە ئێوە سەرتر و دوورتر بڕوا - شەرەفی نوێی ئێوە دەبێ!

بە راستی، شەرەفی ئێوە ئەمە نابێ کە لە خزمەت ئەمیرێک دابوون - ئیدی ئەمیرەکان چ رێزێکیان هەیە! - یا ئەوە کە پاڵ و پشتێک بۆ شتێکی لە سەر پێ وەستاو بوون هەتا ئەمیر راوەستاوتر بێ!

نە ئەوەکە بنەچەکەتان لە بارەگاکان دا دابی بارەگا فێر بوە و ئێوەش فێر بوون کە ماوەیەکی دوور و درێژ، رەنگین وەک قورینگ، لە دەراوە تەنکەکان دا بوەستن:

- چونکە **توانایی وەستان** لە شازەکانی بارەگاییەکانە و ئەوان گشتیان لە سەر ئەم باوەڕەن کە یەکێک لە بەختەوەرییەکانی دوای مەرگ ئەمەیە کە **- ئیزنی دانیشتن -** هەبێ!

نەک ئەوە کە رووحێک، کە ئەویان بە پیرۆز دادەنا، پێشینەکانی ئێوەی بەرەو وڵاتانی دیاریکراو کێشا کە من پێیەهەڵنالێم: چونکە لەو وڵاتانەی کە خرابترین



دار، یانی خاچ دەڕوێ، شتێکی شیاوی پێهەڵکوتن نیە.

- بە راستی، لە هەر کوێیەک کە ئەم «رووحە پیرۆزە» شۆڕەسوارانی خۆی رێنوێنی کردوە، لە پێشەنگی وەها رەوەیەک دا هەمیشە بزن و قاز و نارازییەکان ئاژواون -

برایان، چینی نەجیبی ئێوە نابێ بەرەو دوا، دەبێ بەرەو پێش بڕوانن! دەبێ ئێوەیان لە گشت وڵاتانی باو و باپیران دەرکردبێ!

ئێوە دەبێ ئەویندار ی وڵاتی منداڵەکانتان بن - بلا ئەم ئەوینە، چینی نەجیبی نوێی ئێوە بێ! ئەو وڵاتە نەدۆزراوەیە لە دوورترین دەریاکان دا. فەرمان دەدەمە باسپێرەکان کە هەروا بگەڕێن و بگەڕێن!

لە منداڵەکانتان دا دەبێ قەرەبووی ئەوە بکەنەوە کە منداڵی باوکەکانتان بوون. ئاوا دەبێ تەواوەتی ئەوەی کە تێپەڕیوە رزگار بکەن! من ئەم دەپە نوێیە لە بان سەری ئێوە هەڵداوەسم.

## ١٣

«ژیان بۆچی؟ هەموو شت پووچە! ژیان - کا شەن کردنە، ژیان - یانی خۆ سووتاندن و گەرم نەبوونەوە.»

وەها چەنەوەرییەکی کۆنینە هێشتا بە «زانایی» ناو دەبەن؛ و لەبەر ئەمە کە کۆنە و بۆ خاوی لێدێ، پتر رێزی لێدەگرن. برش هەڵێنانیش شەرەف پێکدێنێ.

منداڵ، دەتوانن بڵێن کە: لە ئاگر دەترسن، چونکە ئەوانی سوتاندوە! لە کتێبە کۆنەکانی زانایی دا، منداڵێتی زۆرە.

ئەوەی کە هێشتاش «کا شەن دەکا چلۆن دەبێ بوێرێ بە خراپ لە شەن کردن بدوێ» لمبۆزی وەها شێتگەلێک دەبێ ببەستن!

ئەوانە لە سەر سفرە دادەنیشن و چ دەگەڵ خۆیان ناهێنن، تەنانەت تامەزرۆییەکی باش: نووکە جوێن دەدەن کە «هەموو شت پووچە!»

بەڵام، برایان، باش خواردن و خواردنەوە، بە راستی، هونەرێکی پووچ نیە!

بیشکێنن، بیشکێنن، ئەو دەپە هەمیشە ـ ناشادانە!

## ١٤

خەڵک دەڵێن: «بۆ مرۆڤی پاک هەموو شت پاکە.» بەڵام من بە ئێوە دەڵێم کە: بۆ بەرازەکان هەموو شت بەرازانە دەبێ!

لەبەر ئەوە ویشکە مەزهەبییەکان و مل کەچانێک کە دڵیشیان مل کەچە، موعیزە دەکەن کە دونیا «درنجێکی گواوی»یە.

چونکە ئەوانە هەموویان گیانێکی ناپاکیان هەیە؛ بە تایبەت ئەوانەی کە نە حەجمینیان هەیە و نە حەسانەوە، یانی ئەو کەسانەی کە دونیا لە پاشەوە چاو لێدەکەن ـ یانی ئەهلی ئاخیرەت!

من ئەوە بەرەورووی ئەوان دەڵێم، هەر چەند لە دڵەکانیش گران بێ: دونیاش هەروەک مرۆڤ پاشێکی هەیە: هەتا ئێرە راستە!

لە دونیا دا چەپەڵی زۆرە: هەتا ئێرە راستە! بەڵام بەم بۆنەوە دونیا خۆی درنجێکی گڵاو نیە!

زانستێک لەوەدا هەیە کە گەلێک شت لە دونیا دا بۆگەنن: بێز خۆی باڵ و توانایی خۆ بە ئاو دادان، دەئافرێنێ!

لە باشترین شتیش دا دیسان شتێکی بە بێز هەیە؛ تەنانەت باشترین شتیش شتێکە کە دەبێ دیسان لێی تێپەڕێ.

برایان، زانستێکی زۆر لەوەدا هەیە کە گوو لە دونیا دا زۆرە!

## ١٥

بیستوومە کە دیندارانی ئەهلی ئاخیرەت دەگەڵ ویژدانی خۆیان بە وەها قسەگەلێک پەند دەدەن و بە راستی بەبێ درۆ و دەلەسە ـ هەر چەند کە بە درۆ و دەلەسەتر لەمە لە دونیا دا چی دیکە نیە:

«بێڵە کە دونیا، دونیا بمێنێتەوە! قامکێکیش بە دژی هەڵمەهێنەوە!»

«بێڵە هەر کەس کە دەیەوێ ئەوکی خەڵک رێک بکوشێ و لەت و پەتیان بکا: بە



دژی ئەویش قامکێک هەڵمەهێنەوە! بەمجۆرە ئەوان تەرکی دونیا فێر دەبن.»

«تۆ دەبێ ئەوکی ئەقڵی خۆشت رێک بکوشی و بیخنکێنی؛ چونکە ئەمە ئەقڵێکی ئەم دونیایەیە ـ بەمجۆرە، تۆ خۆت تەرکی دونیا فێر دەبی.»

بیشکێنن، بیشکێنن، برایان، ئەم دەپە کۆنەی دیندارەکان. بیشکێنن قسە و پەندی بەدویژدانی دونیا!

## ١٦

«هەر کەس کە زۆر فێر بێ، خواستە بە تینەکانی لە بیر دەکا» ـ ئەمڕۆ لە گشت کۆڵانە تاریکەکان دا وەها دەچرپێنن.

«فرەزانی هۆی ماندوویەتییە؛ هیچ شتێک ـ بایەخی نیە؛ تۆ نابێ خواستێکت هەبێ!» ئەم دەپە نوێیەم لە سەر بازاڕەکان بە هەڵواسراوی دیت.

برایان، بیشکێنن، بیشکێنن، ئەم دەپە نوێیەش کە لە دونیای ماندووکان و موعیزەکەرانی مەرگ و هەروەتر زیندانەوانەکان هەڵیانواسیوە: بزانن کە ئەمەش هەروەتر موعیزەیە بۆ بەندە بوون:

ئەوان لەبەر ئەوە کە خراپ فێر بوون، باشترین شتەکان فێر نەبوون و هەموو شتێک زۆر زوو و زۆر بە لەز فێر بوون: ئەوان لەبەر ئەوە کە خراپیان خواردوە، گەدەیان تێکچوە.

چونکە گیانیان گەدەیەکی تێکچوویە کە مەرگ پەند دەدا! چونکە بە راستی، برایان، گیانیش گەدەیەکە!

ژیان کانی لەزەتە: بەڵام بۆ ئەو کەسەی کە لە دەروونیەوە، گەدە تێکچوویەکەی ـ ئەم باوکەی رەنج ـ دەدوێ، چاڵاوەکان گشتیان ژاراوین.

هەڵسەنگێنەریی هۆی لەزەتی شێر ـ ویستانە! بەڵام ئەوەی کە ماندوو بوە بە ویستی خەڵکە و لەیستۆکی هەر شەپۆلێک.

زاتی خەڵکی بێهێز هەمیشە وەهایە کە لە رێی خۆیان دا ون دەبن و لە ئاکام ماندوویەتیەکەیان دەپرسێ: «بۆچی دەبێ رێگایەک بگرینە بەر؟ هەموو شت وەک یەکن!»

وەها موعیزەیەک لە گوێی ئەوان دا خۆشە: «هیچ شتێک بایەخی نیە! تۆ نابێ بتەوێ!» بەڵام ئەمە موعیزەیە بۆ بەندە بوون.

برایان، زەردەشت وەک باکوتێکی تازە هەڵدەکاتە سەر هەموو ماندوانی ڕێگا و گەڵێک لووتان وە پشمە دەخا!

هەناسەی ئازادیشم بە کەلێن دیوارەکان دا بۆ نێو زیندانەکان و گیانە زیندانیەکان دەچێ!

ویستن ڕزگاریدەرە: چونکە ویستن هەمان ئافراندنە: من وەها فێر دەکەم. ئێوە تەنیا بۆ ئافراندن دەبێ فێر بن!

لە پێشدا دەبێ فێر بوون لە من فێر بن، باش فێر ـ بوون! ئەوەی کە گوێچکەیەکی هەیە، بیبیسێ!

## ۱۷

گەمێ لەوێ وەستاوە ـ لەوبەر لەوانەیە ڕێگایەک هەبێ بۆ «هیچ»ی مەزن! بەڵام کێیە کە بیەوێ سواری ئەم «لەوانەیە» بێ؟

هیچکام لە ئێوە نایەوێ سواری گەمێی مەرگ بێ! کەوایە بۆچ دەتانەوێ هی ـ دونیای ماندوو بن؟

لە دونیا ماندوون و سەرەڕای ئەمە پشتتان لە زەوی نەکردوە! ئێوەم هەمیشە لە پێوەندی دەگەڵ زەوی بە هەوەسەوە بینیوە، تەنانەت ئەویندارى لە ـ زەوی ماندوویەتی خۆتان.

لیچ داچۆڕانتان لەخۆڕا نیە: هەوەسێکی چووکی زەوینی هێشتا لە سەرە! لە چاوەکانتان دا ـ ئایا پەڵە هەورێکی چووکە لە لەزەتێکی لە بیر نەکراوی زەوینی دا مەلەی ناکا؟

لە سەر زەوی داهێنانی نوێی باش زۆرن، هەندێک بە کەلک، هەندێک دڵگر: دەبێ لەبەر ئەوانە زەویت خۆش بوێ.

لە سەر ئەمە ئەوەند داهێنانی نوێی باش زۆرن کە وەک مەمکی ژن دەچن: هەم بەکەلک، هەم دڵگر.



بەڵام ئێوە لە دونیا ماندوان! ئێوە تەوەزلەکانی زەوی! دەبێ شووڵتان لێڕاکێشن! بە شووڵ لێڕاکێشان دەبێ دیسان گیان وەبەر پێیەکانتان بنێنەوە!

چونکە ئێوە ئەگەر گردەنشین و داماوانێکی چارەڕەش نین کە زەوی لێیان وەڕەزە، تەوەزەلانێکی سەگ خدە یاکوو پشیلەی بە تەماحی گزیکاری لەزەتپەرست و ئەگەر ناتانەوێ جارێکی دی بە خۆشییەوە راکەن، دەبێ لێرە ـ بڕۆن!

پیاو نابێ بژیشکی چارە نەبوان بێ: زەردەشت وەها فێر دەکا ـ کەوایە ئێوە دەبێ لێرە بڕۆن!

بەڵام، تەواو کردن پتر بوێری دەوێ هەتا دەست پێکردنی بەیتێکی تازە: ئەمە گشت بژیشکەکان و شاعیرەکان دەیزانن.

## ۱۸

برایان، هەندێک دەپ هەن کە ماندوویەتی ئەوانی ئافراندوە و هەندێکی دی تەوەزەلی، تەوەزەلی گنخاو: ئەم دوانە سەرەڕای ئەوە کە وەک یەک دەدوێن، بەڵام نایانەوێ قسەکانیان وەک یەک ببیسرێ.

بڕواننە ئەم لەپێکەوتوویە! لە ئامانجی خۆی هەنگاوێک پتر دوور نیە، بەڵام لەبەر ماندوویەتی، کەللەڕەقانە خۆی بە زەوی داداوە، ئەم پیاوە بوێرە!

لە بەر ماندوویەتی باوێشکی بە ڕێگا و بە زەوی و بە ئامانج و بە خۆی دێ: ئیدی نایەوێ هەنگاوێکیش بۆ پێشتر هەڵێنێتەوە، ئەم پیاوە بوێرە!

نووکە هەتاو دەیبرژێنێ و سەگەکان ئارەقەکەی دەلێسنەوە: بەڵام ئەو بە کەللەڕەقی دەیەوێ هەر لەوێ بکەوێ و لە پێ بکەوێ.

ـ لە پێ کەوتوو، لە یەک هەنگاویی ئامانجی خۆی! بە راستی، ئەم پاڵەوانە دەبێ بە پرچ ـ هەڵکێشان بەرەو ئاسمان هەڵکێشن!

وا باشترە لەو گەڕێن، هەر لەو شوێنە کە خۆی خستوە بڵا خەوی ئارامدەری دەگەڵ ترپەی بارانی فێنک کەرەوە لە سەری داکا.

لێگەڕێن هەتا خۆی وەئاگا بێتەوە ـ هەتا خۆی گشت ماندوویەتی و ئەوەی کە

ماندوویەتی لە دەروونی ئەوەوە موعیزە دەکا، لە خۆی بتارێنێ!

برایان، تەنیا سەگەکان لە دەوروبەری ئەو دوور بخەنەوە، ئەم تەوەزەلە گزیکارانە و تەواوی ئەو مێش و مەگەزە بە زیانە پۆل ـ فڕانە.

ـ تەواوی مێش و مەگەزی بە زیانی پۆل ـ فڕی «پێشکەوتوو» کە لە ئارەقەی لەشی هەر قارەمانێک شاد دەبن!

## ۱۹

لە دەوری خۆم جەغز و مەرزە پیرۆزەکان دەکێشم: هەمیشە رادەیەکی هەرە کەمتر دەگەڵ من بەرەو کێوە هەرە بەرزەکان هەڵدەکشێن: من لە کێوە هەرە پیرۆزەکان دا کوێستانێک دادەمەزرێنم.

بەڵام، برایان، بۆ هەر کوێ کە ئێوەش دەتانەوێ دەگەڵ من سەرکەون، وریا بن کە مفتەخۆرێکیش دەگەڵ ئێوە سەر نەکەوێ!

مفتەخۆر: یانی کرمی خزۆک و نەرم ئاکار، کە دەیەوێ بە خواردن لە سووچ و گۆشەکانی نەخۆش و برینداری ئێوە قەڵەو بێ.

هونەرەکەی ئەمەیە کە دەزانێ رەوانی بەرزەڕەوەکان لە کوێ ماندوو دەبن: ئەو لانەی چەپەڵی خۆی لە سەر رەنج و ناهومێدی و لە سەر شەرمی ناسکی ئێوە ساز کردوە.

ئەو لانەی چەپەڵی خۆی لەو شوێنە ساز دەکا کە توانا ناتوانایە و نەجیب پتر لە رادەی پێویست نەرم: مفتەخۆر لەو جێیە دەژی کە گەورەپیاو سووچی چووک و برینداری هەیە.

بەرزترین چەشنی بوونەوەرەکان کامەیە و نزمترینیان کامە؟ نزمترین چەشن مفتەخۆرە؛ بەڵام ئەوەی کە بەرزترین چەشنە زۆرترین ژماری مفتەخۆرەکان بە خێو دەکا.

چونکە رەوانێک کە درێژترین پەیژەی هەیە و لە هەموان قووڵتر دەتوانێ رۆبچێ، چلۆن دەکرێ کە پترین رادەی مفتەخۆرەکانی لە سەر نەبێ؟

ئەو رەوانە هەرە هەراوە، کە دەتوانێ دوورەدەستتر لە هەر جێیەک بەرێتە نێو



رەوانی خۆی و بگەڕێ و بخولێتەوە؛ ئەو رەوانە هەرە شیاوە، کە بۆ خاتری لەزەت خۆی لە نێرینەی کارەسات داوێ ـ

ـ رەوانێکی شیاو کە لە «بوون» دا نوقم دەبێ: رەوانێکی دارا، کە دەیەوێ خواست و تاسەی هەبێ:

ـ رەوانێکی لە خۆ راکەر، کە لە هەراوترین جەغز دا خۆی دەگیرسێنێتەوە؛ زاناترینی رەوانەکان، کە شێتایەتی شیرینترین قسەکانی پێدەڵێ:

ـ رەوانێک کە خۆی لە هەموان پتر خۆش دەوێ، رەوانێک کە مەندی و خوڕێنی و جەزر و مەدی هەمووو شت لەو دایە: ئاخ، بەرزترین رەوان چلۆن دەتوانێ کە مفتەخۆرە هەرە نزمەکانی تێدا نەبێ؟

## ۲۰

برایان، ئایا من دڵڕەقم؟ من دەڵێم: هەر شتێک کە دادەکەوێ دەبێ دیسان پاڵی پێوەنێن!

تەواوەتی ئەوەی ئیمڕۆییە ـ دەکەوێ و دادەکەوێ: کێ دەیەوێ ئەو راگرێ؟ بەڵام من ـ من دەمەوێ کە دیسان پاڵی پێوەنێم!

ئەو هەوەسەی کە بەردەکان بەرەو قووڵاییە لێژدارەکان تل دەدا، دەناسن؟

ـ بڕواننە ئەو مرۆڤە ئیمڕۆییانە کە چلۆن بەرەو قووڵایی من دادەکەون! برایان من پێشەنگی دەورگێڕانێکی چاکترم، سەرمەشقێک! سەرمەشقی من رەچاو بکەن!

بەو کەسەی کە فێری فڕین نابێ، زووتر داکەوتن فێر بکەن!

## ۲۱

من دۆستی بوێرەکانم: بەڵام شیر وەشاندن بەس نیە ـ دەبێ بزانی کە لە کێی دەدەی!

زۆر جار لە خۆ پاراستن و وەلانان و تێپەڕین دا، بوێرییەکی پتر هەیە: بەم چەشنە دەکرێ خۆ بۆ دوژمنێکی شیاوتر راگری!

بلا ئێوە تەنیا ئەو دوژمنانەتان هەبێ کە لێیان بێزارن، نەک ئەو دوژمنانەی کە بە سووکیان دادەنێن: ئێوە دەبێ شانازی بە دوژمنەکانتان بکەن: رۆژێک من وەهام فێر کردوون.

هاوڕێیان، ئێوە دەبێ خۆتان بۆ دوژمنێکی شیاوتر راگرن. لەبەر ئەوە دەبێ گەلێکان وەلانێن و بە لایان دا تێپەڕن ـ

ـ بە تایبەت بە لای گەلێک بوودەڵە کە لە گوێتان دا سەبارەت بە گەل و گەلەکان هات و هەرای ساز دەکەن.

چاوەکانتان لە لاگری و دژایەتی ئەوان پاک راگرن! لەوێ هەق زۆرە و ناهەق زۆر، و هەرکەس تێیان بڕوانێ دەرهەڵدەبێ.

دیتن هەمان و شیر هەڵکێشان هەمان: کەوایە بڕۆ لێڕەوارەکان و شیرەکەت بخەوێنە!

ڕێی خۆت بگرە و بێڵە گەل و گەلەکان بە ڕێی خۆیان دا بڕۆن، کە بە راستی ڕێگاگەلێکی تاریکە کە چ هیوایەک ترووسکەیان لێناکا!

بێڵە لەو شوێنەی کە شتی درەوشاوە، زێڕی دوکاندارەکانە دوکاندارەکان سەرۆکایەتی بکەن! ئیمڕۆ ئیدی سەردەمی پاشاکان نیە: ئەوەی ئیمڕۆ خۆی بە گەل ناو دەبا شیاوی چ پاشایەک نیە.

بڕوانن کە ئەم گەلانە نووکە چلۆن وەک دوکاندارەکان دەجووڵێنەوە: ئەوان لە چووکترین قازانجی هیچ زبڵێک خۆ ناپارێزن!

ئەوان لە بۆسەی یەکدی دان و یەکدی فریو دەدەن ـ و ئەوە بە «هاوسا دۆستی» دادەنێن. یادی بەخێر ئەو رۆژگارە دوورەدەستە پیرۆزەی کە گەلێک بە خۆی دەگوت: «من دەمەوێ سەرۆکی گەلەکان بم!»

چونکە، برایان، هەرە باش شیاوی سەرۆکایەتییە و هەرەباشە کە سەرۆکایەتی دەوێ! لەو شوێنەی کە ئامۆتەیەکی جگە لەوە لە ئارا دا بێ، ئەوەی کە لە ئارا دا نیە ـ هەرەباشە.

## ٢٢



هاوار، ئەگەر نانەکەیان بە خۆڕایی گەیبا، ئیدی بۆچی هاواریان بەرز دەکردەوە؟ وەچنگ خستنی بژیو، خۆشی راستەقینەی ئەوانە و دەبێ ئەو بە دژواری وەچنگ بخەن!

ئەوان لە کار کردنیشیان دا دڕندەن ـ لە دەسکەوتیان دا دزی هەیە، گزی هەیە! لەبەر ئەوە دەبێ ئەو بە دژواری وەچنگ بخەن!

کەوایە دەبێ دڕندەیەکی چێتر، زیرەکتر، گزیتر و مرۆڤانەتر بن: چونکە مرۆڤ باشترین دڕندەیە.

مرۆڤ ئاکارباشی گشت گیاندارەکانی رفاندوە: لەبەر ئەوە کاری ژیان بۆ مرۆڤ لە گشت گیاندارێک دژوارترە.

تەنیا باڵندەکان هێشتا لە سەرەوەی ئەوەن. ئەگەر مرۆڤ فڕینیش فێر بووبا، هەوەسی رفێنەری ئەو ـ هەتا کامە بەرزایی باڵی نەدەگرت!

## ٢٣

پیاو و ژنم وەها دەوێ: یەکێک لێوەشاوە بۆ جەنگ، ئەوی دی لێوەشاوە بۆ زان؛ و هەر دوو لێوەشاوە بۆ سەما بە سەر و بە پێ.

بلا ئەو رۆژەی کە جارێک سەمای تێدا ساز نەبوە، نەمێنێ! بلا با بۆ ئێمە درۆ بێ هەر راستەقینەیەک کە پێکەنینێکی دەگەڵ نەبوە.

## ٢٤

وریا بن کە پەیوەندی ژن و مێردایەتی ئێوە خراپ نەبەسترێ! چونکە ئەگەر بەلەز پەیوەند بگرن، ئاکامی ئەو ـ زیناکارییە.

و زینا باشترە لە چەمینەوە لە ژێر باری ژن و مێردایەتی و درۆی ژن و مێردایەتی!

رۆژێک ژنێک وەهای پێگوتم: «راستە کە من بە زینا بەڵێنی ژن و مێردایەتیم شکاند، بەڵام ئەمە ژن و مێردایەتی بوو کە لە پێشدا ـ منی شکاند!»

جووتە ناجوورەکانم هەمیشە بە خراپترین تۆڵەستێن دیون: ئەوان لە تەواوی

دونیا، تاوانی ئەوەیان دەوێتەوە کە ئیدی تەنیا نین.

لەبەر ئەوە، دەمەوێ کە بە شەرەفەکان بە یەکدی بڵێن: «ئێمە ئەویندارى یەکدین، وەرە بزانین دەتوانین ئەوینەکەمان راگرین، یا ئەوە کە پەیوەندەکەمان هەڵەیە؟»

ـ دەرفەتێک بۆ ژن و مێردایەتییەکی چووکە بە ئێمە بدەن هەتا بزانین ئایا بۆ ژن و مێردایەتییەکی گەورە شیاوین یا نا! هەمیشە دوو کەس بوون، کارێکی گەورەیە!»

گشت خەڵکی بە شەرەف وەها پەند دەدەم؛ ئەگەر جگە لەوە پەندم دابا و گوتبام؛ ئەوینی گەورەم بە بەرزەمرۆڤ و هەرچییەک کە دادێ، چی لێدەهات؟

نە تەنیا مینا خۆیی بەڵکە سەرووتر لە خۆیی بار بێنن؛ برایان، بلا باغی ژن و مێردایەتی لەم کارە دا یاریدەدەرتان بێ!

## ٢٥

ئەوەی کە لە ناسینی سەرچاوە کۆنەکان دا شارەزا بوە، بروانە، لە ئاکام بۆ دیتنەوەی کانیاوەکانی داهاتوو و سەرچاوە نوێیەکان وەخۆ دەکەوێ.

برایان هێندە ناخایەنێ کە گەلە نوێیەکان و کانیاوە نوێیەکان سەر هەڵدەدەن و بە خورِ دەرژێنە نێو قووڵاییە نوێیەکانەوە.

چونکە هەر ئەوجۆرەی کە بوولەرزە گەلێک چاڵاو کوێر دەکاتەوە و تینوایەتییەکی زۆر پێک دێنێ: هێزە شاراوەکان و رازەکان وەدیار دەخا.

بوولەرزە کانیاوە تازەکان وەدیار دەخا. لە بوولەرزەی گەلە کۆنەکان کانیاوە تازەکان خۆ دەردەخەن.

ئەوەی کە دەنگ هەڵدەبرێ: «بروانن، ئەوەتا چالاوێک بۆ گەلێک تینوو، دڵێک بۆ گەلێک تاسەبار، ویستێک بۆ گەلێک ئامێر،»: لە دەوری ئەو گەلێک کۆ دەبنەوە، یانی: گەلێک تاقیکەرەوە.

لەوێ ئەوە بە تاقی دەکەنەوە کە چ کەسێک دەتوانێ فەرمان بدا و چ کەسێک دەبێ فەرمانی بە سەر دا بدرێ! ئاخ، کە ئەم ئەزموونە دەگەڵ چ گەران و گومان



کردن و تێشکان و فێر بوون و سەر لە نوێ تاقی کردنەوەیەکی دوور و درێژ بەرەوڕوویە!

کۆمەڵی مرۆڤ ئەزموونێکە: من وەها فێر دەکەم ـ گەرانێکی دوور و درێژ؛ بەڵام، ئەو لە فەرماندەرەکان دەگەرێ!

برایان، ئەزموونە، نەک بریارنامە! بیشکێنن، بیشکێنن، ئەم پەیڤەی دڵنەرمەکان و نیوە و نیوەچڵەکان!

## ٢٦

برایان گەورەترین مەترسی بۆ تەواوەتی داهاتووی مرۆڤ لە نێو چ کەسانێک دایە؟ مەگەر لە نێو چاکان و دادخوازان دا نیە؟

ـ لە نێو ئەوانەی کە وەها دەبێژن و لە دڵ دا وەها هەست دەکەن: «ئێمە هەنووکە دەزانین کە چاک کامەیە و دادخواز کامە، ئێمە هەروەتر ئەم شتانەمان هەیە؛ ئامان لەو کەسانەی کە هێشتا هەر لێرە دەگەرێن!»

زیانی چاکان بە زیانترە لە هەر زیانێکی دیکە کە بەدخوازان دەتوانن بیگەیەنن!

زیانی چاکان بە زیانترە لە هەر زیانێکی دیکە کە بەدوێژانی دونیا دەتوانن بیگەیەنن.

برایان، رۆژێک کەسێک روانیە نێو دڵی چاکان و دادخوازان و گوتی: «ئەمانە فەریسین» بەڵام کەس لێی تێنەگەیشت.

چاکان و دادخوازانیش نەدەبا تێگەیشتبان، چونکە گیانی ئەوان لە زیندانی ویژدانی چاکیان دا لە بەند دایە. گەوجایەتی چاکان گەلێک ژیرانەیە.

بەڵام، راستی ئەمەیە کە چاکان دەبێ فەریسی بن ـ چارەیەکیان جگە لەمە نیە!

چاکان دەبێ ئەوانەی کە بناغەدانەری ئاکارباشی خۆیانن لە خاچ بدەن! ئەمەیە راستەقینە!

بەڵام دووهەم کەس کە وڵاتەکەی ئەوانی دۆزیوە ـ وڵات و دڵ و مەڵبەندی

چاکان و دادخوازان ـ هەر ئەو بوو کە پرسی: «ئەوان لە کێ پتر لە هەموو کەس بێزارن؟»

ئەوان پتر، لە هەموو ئافرێنەران بێزارن، لەوەی کە دەپ و بایەخە کۆنەکان دەشکێنێ، لە شکێنەر ـ لەو کەسە کە یاساشکێنی پێدەڵێن.

چونکە چاکان ـ ناتوانن بافرێنن: ئەوانە هەمیشە سەرەتای کۆتایین.

ئەوان هەر کەسێک کە بایەخە نوێیەکان لە سەر دەپە نوێیەکان بنووسێ لە خاچی دەدەن، ئەوان داهاتوو قوربانی خۆیان دەکەن ـ ئەوان تەواوی داهاتووی مرۆڤ لە خاچ دەدەن!

چاکان ـ هەمیشە سەرەتای کۆتایی بوون.

## ٢٧

برایان، لەم قسەیەش گەیشتن؟ ئەوەی کە من رۆژێک سەبارەت بە «دوا مرۆڤ» گوتبووم؟

گەورەترین مەترسی بۆ تەواوەتی داهاتووی مرۆڤ لە نێو چ کەسانێک دایە؟ ئایا لە نێو چاکان و دادخوازان دا نیە؟

بیشکێنن، بیشکێنن، چاکان و دادخوازەکان! ـ برایان لەم قسەیەش گەیشتن؟

## ٢٨

لە من رادەکەن؟ ئایا ترساون؟ لەم قسەیە لەرزتان تێکەوتوە؟

برایان، ئەودەم کە ئەمرم بە ئێوە کرد: بیشکێنن چاکان و دەپی چاکەکان، ئەودەم بوو کە کەشتی مرۆڤم بۆ دەریا ئازادەکان ئاژوا.

نووکەیە کە سامی گەورە، لە دەوروبەری ـ خۆ روانینی گەورە، نەخۆشی گەورە، بێزی گەورە، دڵشێوانی گەورە لە دەریا، ئەو دادەگەرێ.

چاکان بەستێنە درۆیینەکان و پەناگا درۆیینەکانیان فێرە ئێوە کردوە، ئێوە لە نێو درۆکانی چاکان دا لە دایک بوون و پێگەیشتوون. بە دەست چاکان هەموو شت لە بنەڕەتەوە درۆیین و ئایین ـ کەچ بوە.



بەڵام ئەوەی کە خاکی مرۆڤی دۆزیوە، خاکی «داهاتووی مرۆڤ»یشی دۆزیوەتەوە. نووکە ئێوە دەبێ دەریاوانانی بوێر و سێبوور بن!

برایان، لە کاتی خۆ قیت بە رێگا دا برۆن! قیت بە رێگا دا رۆیشتن فێر بن! دەریا فەرتەنەیە: گەلێک دەیانەوێ کە بە یارمەتی ئێوە جارێکی دی خۆ هەڵکێشنەوە.

دەریا فەرتەنەیە: هەموو شت لە دەریا دایە. ئاهای! راپەڕن! دڵی دەریاوانە کۆنەکارەکان!

نیشتمانی باوک لە کوێیە؟ سوکانەکەی ئێمە رووی لە نیشتمانی منداڵەکانمانە! بەرەو تاسە گەورەکەمان، بە فەرتەنەتر لە دەریا شالاو دەبا!

## ٢٩

«بۆچ وەها سەخت؟» ـ رەژی بەردینە رۆژێک وەهای بە ئەڵماس گوت ـ «مەگەر ئێمە خزمی نزیکی یەک نین؟»

بۆچ وەها نەرم؟ برایان من لە ئێوە وەها دەپرسم: مەگەر ئێوە برایانی من نین؟

بۆچ وەها نەرم؟ وەها سست و لێبوردوو؟ بۆچ حاشا و نەسەلماندن لە دڵەکانی ئێوە دا وەها زۆرە؟ بۆچ چارەنووس لە چاوەکانتان دا وەها کەمە؟

ئەگەر نەخوازن چارەنووس بن و سەرسەخت، چلۆن دەتوانن هاورێ دەگەڵ من ـ سەرکەوتن دەست بخەن؟

ئەگەر سەختی ئێوە نەیەوێ بترووسکێ و بدڕێ و ببڕێ، چلۆن دەتوانن جارێک هاورێ دەگەڵ من ـ بافرێنن؟

چونکە ئافرێنەران سەختن. بەختەوەری لە روانگەی ئێوە دەبێ وەها بێ کە هەزارەکان وەها لە دەست دا رێک بکوشن هەر وەک مێو.

ـ بەختەوەری، نووسینی ویستی هەزارەکانە، نووسینێک هەروەک نووسین لە سەر مس ـ لە سەر سەختتر لە مس، نەجیبتر لە مس ـ تەنیا هەرە نەجیبەکان بە تەواوەتی سەختن.

برایان، من ئەم دەپە نوێیە لە بان سەری ئێوە هەڵداوەسم: سەخت بن!

## ٣٠

تۆ ئەی ویستی من! ئەی جێگری هەر نیازێک، تۆ ئەی پێداویستی من! من لە گشت سەرکەوتنە بچووکەکان بپارێزە!

تۆ ئەی چارەنووسی رووحەکەم: کە من ناوی چارەنووسم لێناوە! ئەی لە ـ من دا! ئەی لە سەر ـ من دا! من بۆ چارەنووسێکی گەورە بپارێزە و رابگرە!

دوایین ـ مەزنایەتیت، ئەی ویستی من، بۆ دوایین ـ دەرفەتت راگرە ـ بۆ ئەو دەمەی کە لە سەرکەوتنی خۆت دا شێلگیری! ئاخ، کێ لە بەر سەرکەوتنی خۆی نەبەزیوە؟

ئاخ، چاوەکانی چ کەسێک لەم زەردەپەڕە مەستانەیە دا لێڵ نەبوە؟ ئاخ، پێیەکانی چ کەسێک شل نەبونەوە و وەستانیان لە سەرکەوتن دا لە بیر نەکردوە! ـ

ـ هەتا ئەوە کە من رۆژێک لە نیوەڕۆی مەزن دا ئامادە بم و گەیشتبێم: ئامادە و گەیشتوو هەروەک بەرداسنی تیندراو، هەروەک هەوری ئاوسی برووسک، هەروەکی گوانی پڕ لە شیر.

ـ ئامادە بۆ خۆ و بۆ شاراوەترین ویستی خۆ: مینا کەوانێکی بێئۆقرە بۆ خەدەنگەکەی، خەدەنگێکی بێئۆقرە بۆ هەسێرەکەی،

ـ هەسێرەیەکی ئامادە و گەیشتوو لە نیوەڕۆکەی دا، گڕگرتوو و کوناودیوکراو و شاد لە خەدەنگە فەوتێنەرەکانی هەتاوەکەی!

تۆ ئەی ویستی من! ئەی جێگری هەر نیازێک، تۆ ئەی پێداویستی من! من بۆ سەرکەوتنێکی مەزن بپارێزە! ـ

وەهای گوت زەردەشت.



# چاک بۆوە

## ١

ماوەیەکی نە هێندە زۆر دوای گەڕانەوە بۆ ئەشکەوتەکەی، بەیانییەک، زەردەشت وەک شێتێک لە جێ راپەڕی و بە هاوارێکی ترسناک قێژاندی و وەهای دەنواند کە دەتگوت کەسێکی دیکەش لە سەر جێگاکەی خەوتوە و نایەوێ کە لێی هەستێ. هاواری زەردەشت وەهای دەنگ داوە کە گیاندارەکان هەراسان بۆ لای داورووکان و لە تەواوی ئەشکەوتەکان و لانەکانی نزیک ئەشکەوتی زەردەشت، گیاندارەکان بە پێی، پا و پەڕیان، بە فڕین و هەڵبەز و باڵەفڕکە و خزان و بازدان، رایان کرد. بە هەر حاڵ، زەردەشت ئەم قسانەی کرد:

راپەڕە، ئەی بیر و باوەڕی هەڵدێریی، لە قووڵایی من سەر دەرکە! من کەڵەباب و بەرەبەیانی تۆم، ئەی کرمی خەواڵوو. راپەڕە! راپەڕە! قووقەی کەڵەبابی دەنگم نووکە تۆ لە خەو رادەپەڕێنێ!

بەندی گوێچکەکانت بکەوە: گوێ بگرە! چونکە من دەمەوێ گوێ لە تۆ بگرم! راپەڕە! راپەڕە! لێرە گرمەی برووسک بە رادەیەکە کە گۆڕەکانیش ناچار بە گوێ راگرتن دەکا!

لە چاوەکانت خەو و گێژی و کوێری بسترە! بە چاوەکانیشت گوێ لە من بگرە! دەنگی من بۆ کوێرە زگماکەکانیش دەرمانە.

کاتێک وە خەبەر بێی، دەبێ نارەحەت بم چونکە هەتا ئەبەد بە خەبەر دەمێنیەوە. ئەوە دابی من نیە کە دایەگەورەکان لە خەو هەستێنم، بەڵکە لێیاندەگەڕێم کە هەروا بخەون!

جینگڵ دەدەی، خۆ لەبەر یەک دەکێشیەوە، پرخەت دێ؟ راپەڕە! راپەڕە نابێ پرخەت بێ ـ دەبێ دەگەڵ من بدوێی! زەردەشت بانگت دەکا، ئەو پیاوە بێخودایە!

من زەردەشت، لاگری ژیان، لاگری رەنج، لاگری دوور ـ تۆ بانگ دەکەم، ئەی هەڵدێرترین بیر و باوەڕی من!

بژی بۆ خۆم! تۆ دەگەیەی ـ دەنگت دەبیسم! هەڵدێرەکەم قسە دەکا، دوایین قووڵایی خۆم بۆ نێو رووناکی هێناوەتە سەر.

بژی بۆ خۆم! وەرە پێش! دەستت بدە بە من ـ هاوار! نا! هاوار، هاوار! بێز، بێز، بێز ـ ـ ـ هاوار بۆ من!

## ٢

هێشتا زەردەشت ئەم قسەی تەواو نەکردبوو کە وەک مردوو کەوتە سەر زەوی و درێژماوەیەک مینا مردوویەک لەوێ ماوە. بەڵام دیسان کاتێک هاتەوە سەرخۆ، رەنگی بزرکابوو و هەڵدەلەرزی و هەروا کە کەوتبوو، درێژ بوو و تا ماوەیەک مەیلی خواردن و خواردنەوەی نەبوو. ئەم حاڵە حەوت رۆژی کێشا و گیاندارەکانی رۆژ و شەو لێی دوور نەکەوتنەوە، مەگەر ئەودەمەی کە هەڵۆ بۆ دەست خستنی خواردەمەنی بۆ دەرەوە دەفڕی. هەڵۆ هەرچییەکی کە وەچنگ دەخست و دەیگرت لە سەر جێی زەردەشتی دادەنا. وەها کە لە ئاکام زەردەشت لە نێوان کۆگایەک تووی زەرد و سوور، ترێ، سێوە سوورەکان، پنچکە بە عەتر و بۆیەکان و دەنکە کاژەکان کەوتبوو. بەڵام، لە بەر پێی دوو بەرخ کەوتبوون کە هەڵۆ بە زەحمەت لە چنگ شوانەکانی رفاندبوو.

وردە وردە، دوای حەوت رۆژ، زەردەشت هەستاوە و لە سەر نوێنەکەی دانیشت و سێوێکی سووری بە دەستەوە گرت و بۆنی پێوە کرد و بۆنەکەی پێخۆش بوو. ئەوسا گیاندارەکانی پێیان وابوو کە دەمی قسە کردن دەگەڵ ئەو داهاتوە.

ئەوان گوتیان: «زەردەشت، نووکە حەوت رۆژە کە تۆ لێرە بە چاوە قورسەکانت لێی کەوتووی: ناتەوێ دیسان لە سەر پێی خۆت بوەستی؟

لە ئەشکەوتی خۆت دەرکەوە: دونیا مینا باغێک چاوەڕوانی تۆیە. با دەگەڵ ئەو عەترە قورسانەی کە دەیانەوێ بۆ لای تۆ بێن، یاری دەکا و جۆبارەکان گشتیان دەیانەوێ بە دوای تۆ دا وەڕێ کەون.

شتەکان گشتیان تاسەباری دیداری تۆن، چونکە تۆ حەوت رۆژ بە تەنیا مایەوە ـ لە ئەشکەوتی خۆت دەرکەوە! شتەکان هەموو دەیانەوێ ببنە بژیشکی



تۆ.

مەگەر زانستێکی تازەی تاڵ و گورچووبڕ بۆ لات هاتبوو؟ چونکە تۆ وەک هەویرترش کەوتبووی و رەوانت هەڵاتبوو و لە تەواوی لێوارەکانی خۆی داچۆڕابوو.»

زەردەشت وڵامی داوە: «گیاندارەکانی من، دیسان زۆربڵێییم دەگەڵ بکەن و بێڵن من ببیسم. زۆربڵێیی ئێوە من تازە دەکاتەوە: لەو شوێنەی کە زۆربڵێیی دەکەن، دونیا بۆ من مینا باغێکە.

چەندە خۆشە کە وشەکان و دەنگەکان هەن. مەگەر وشەکان و دەنگەکان پەلکەزێڕینە و پردە رواڵەتیەکانی نێوان شتە هەرمانە لێک جیاکان نین؟ هەر رەوانێک دونیایەکی دیکەی هەیە؛ بۆ هەر رەوانێک، رەوانێکی دیکە «دونیای دیکە»یە.

رواڵەت لە نێوان شتە وەک یەکچوویەکان دا، لە هەموان جوانتر درۆ دەکا، چونکە چووکترین کەنداڵ، دژوارترین شوێنە بۆ پرد لێدان.

بۆ من ـ چلۆن دەکرێ لە ـ من ـ بە ـ دەرێک هەبێ؟ دەرێک لە ئارا دا نیە. بەڵام لەو شوێنەی کە دەنگەکان هەبن ئەمە لە یاد دەکەین، و چەند خۆشە کە لە یادی دەکەین!

مەگەر ناوەکان و دەنگەکانیان لەبەر ئەوە بە دیاری نەداوە بە شتەکان، کە مرۆڤ خۆ بە شتەکان بحەسێنێتەوە؟ ئەوە شێتایەتییەکی جوانە، وتار: مرۆڤ بەو لە سەر گشت شت سەما دەکا.

چەندە خۆشە گشت قسەکان و گشت درۆی دەنگەکان! بە دەنگەکان ئەوینی ئێمە لە سەر پەلکەزێڕینە رەنگاورەنگەکان سەما دەکا.»

گیاندارەکانی لەم بارەوە گوتیان: «زەردەشت، بۆ ئەوانەی کە وەک ئێمە بیر دەکەنەوە؛ هەموو شت سەماکەرە: ئەو دێ و دەست لە نێو دەست دەنێ و پێدەکەنێ و را دەکا ـ و دیسان دەگەڕێتەوە.

هەموو دەڕۆن، هەموو دەگەڕێنەوە: چەرخی بوون بە هەرمانی دەگەڕێ. هەموو دەمرن، هەموو دیسان دەپشکوێنەوە؛ «ساڵی بوون» بە هەرمانی تێدەپەڕێ.

هەموو تێک دەشکێن، هەموو سەر لەنوێ یەک دەگرنەوە، ماڵی بوونی

هەرمانی خۆی هەر ئەوجۆرە کە بوو ساز دەکاتەوە. هەموو ماڵاوایی دەکەن و دیسان سڵاو لە خۆیان دەکەنەوە؛ ئاڵقەی بوون بە هەرمانەتی خۆی ئەمەگدار دەمێنێتەوە.

بوون هەردەم دەست پێدەکا؛ لە دەوری هەر «لێرە»یەک گۆی «ئەوێ» دەگەڕێ. نێوان گشت جێگایەکە. ڕێگای ئەبەدیەت خواروخێچە.»

زەردەشت جارێکی دیکە بزەی هاتێ و گوتی: ئای، ویشکەڕنەکان و سندووقی دەنگەکان! ئێوە چەندە باش ئەو شتەی دەزانن کە دەبێ لە حەوت ڕۆژ دا ئەنجام بدرێ:

و چلۆن ئەو حەزیایە خزییە نێو ئەوکم و پشووبڕی کردم! بەڵام من قەپم لە سەری داگرت و بۆ دوور تفم کردەوە.

بەڵام ئێوە ـ ئێوە کردووتانە بنێشتەخۆشکە. بەڵام نووکە ماندوو لەبەر قەپ داگرتن و تف کردنەوە، و هێشتا نەخۆش لەبەر ئەم رزگارییە لێرە درێژ بووم.

ئێوە شاهیدی گشت ئەمانە بوون؟ گیاندارەکانم، ئایا ئێوەش دڵڕەقن؟ ئێوەش دەتانەوێ، وەک مرۆڤ، شاهیدی دەردی گەورە و گرانم بن؟

چونکە مرۆڤ دڵڕەقترین گیاندارە و تاکوو ئێستا بە تراژیدەکان و شەڕەگایەکان و لە خاچ دانەکان لە هەموان پتر سەرخۆش بوە: کاتێک دۆزەخی بۆ خۆی ئیختراع کرد، بڕوانە کە دۆزەخی ئەو هەر ئەو ئاسمانەی بان زەوی بوو.

کاتێک مرۆڤی گەورە هاوار بکا، مرۆڤی بچووک بە غار بۆ لای دەچێ و زمانی لەبەر هەوەسبازیی گەزێک دەرکێشاوە. بەڵام ئەو ئەوە بە «بەزەیی» خۆی دادەنێ.

مرۆڤی بچووک، بە تایبەت شاعیر ـ چەندە بە سۆزەوە بە وشەکان لە دەست ژیان دەناڵێنێ! گوێ لەو بگرە، بەڵام گوێ دان بە لەزەتێک کە لە هەر ناڵەیەک دایە، لە یاد مەکەن!

بەڵام ژیان ـ بە نیگایەک بە سەر ئەو ناڵەکەرانە دا زاڵ دەبێ. ئەو چاوکەژاڵە دەڵێ: «منت خۆش دەوێ؟ کەوایە هەندێک سەبر بگرە، چونکە من هێشتا وەختم بۆ تۆ نیە.»

مرۆڤ دڵرەقترین گیاندارە دژی خۆی؛ و هەر کات کە خۆی بە



«تاوانکار» و «خاچ کێش» و» تۆبەکار» ناو دەبا؛ گوێ گرتن لە هەوەسێک کە لەم ئاه و ناڵەیە دایە، لە یاد مەکەن!

من خۆم ـ ئایا دەمەوێ بەم قسەیە لە دەست مرۆڤ بناڵم؟ ئاخ گیاندارەکانم؛ ئەوەی کە من تا ئێستا فێری بووم ئەمەیە کە مرۆڤ بۆ باشترین شتی خۆی پێویستی بە بەدخوازترین شتی خۆی هەیە ـ

ـ کە بەدخوازترین شتی ئەو باشترین هێزی ئەوە و ڕەقترین بەرد بۆ بەرزترین ئافرێنەر؛ هەروەها مرۆڤ دەبێ باشتر و بەدخوازتر بێ.

ئەوەی کە منی لە داری ئەشکەنجە شەتەک دەدا ئەمە نەبوو کە مرۆڤ بەدخوازە ـ بەڵکە من وەها هاوارێکم کرد کە تا ئێستا کەس نەیکردوە: «مخابن کە بەدخوازترین شتی ئەو وەها بچووکە! مخابن کە باشترین شتی ئەو وەها بچووکە!»

ئەوەی کە لە ئەوکم خزیبوو و بەری هەناسەی گرتبووم بێزاری گەورە لە مرۆڤ بوو: هەروەها ئەوەی کە پێشگۆ پێشگۆیی کردبوو: «هەموو شت وەک یەکە، هیچ شتێک بایەخی نیە، زانایی پشووبڕە.»

ئێوارەیەکی درێژ بە لۆژەلۆژ بە پێشم دا دەرۆیشت، غەمێکی زۆر ماندوو هەتا دەمی مەرگ و مەستی مەرگ، کە بە باوێشکەوە قسەی دەکرد.

«ئەو بە هەرمانەتی دەگەڕێتەوە، مرۆڤێک کە تۆ لێی وەڕەزی، مرۆڤی بچووک» غەمم وەهای باوێشک دا و لینگی درێژ کرد و نەیدەتوانی بخەوێ.

زەوی مرۆڤ لەبەر چاوم وەک ئەشکەوتێکی لێهات و سینگی تێکقووپا و ئەوەی کە زیندووییە وەک جەندەکەکان و ئێسک و پرووسکەکانی مرۆڤ و ڕابوردوو پواوەکانی لێهات.

ئاخەکەم لە سەر گشت گۆڕەکانی مرۆڤ دانیشت و ئیدی نەیتوانی هەستێتەوە؛ ئاخ و پرسیارەکەم شەو و ڕۆژ قیڕاندی و پشووی بڕا و دەمی جووڵاوە و ناڵاندی کە ـ

«مخابن، مرۆڤ هەرمان دەگەڕێتەوە! مرۆڤی بچووک هەرمان دەگەڕێتەوە!»

ڕۆژێک هەر دووکیانم بە رووتی دیوە، گەورەترین و بچووکترین مرۆڤ: ئەوان زۆر وەک یەک دەچن ـ هەرە گەورەکەیان هێشتا گەلێک شێوەی مرۆڤ دەدا!»

هەرە گەورەکەیانم زۆر بچووک دیوە! ئەمە بوو بێزاری گەورەم لە مرۆڤ! هەروەتر گەڕانەوەی هەرمانی هەرە بچووکەکەیان هۆی بێزاریم لە تەواوەتی بوون بوو!

هاوار، بێز! بێز! بێز! ـ وەهای گوت زەردەشت و ئاخێکی هەڵکێشا و بێزی هەستا؛ چونکە نەخۆشییەکەی وەبیر هاتەوە. بەڵام گیاندارەکانی لەوە پتر دەرفەتی قسە کردنیان پێنەدا.

گیاندارەکانی وەها وڵامی ئەویان داوە: «ئەی چاک بۆوە! ئیدی قسە مەکە، بەڵکە دەرکەوە هەتا ببینی کە دونیا مینا باغێک چاوەڕوانی تۆیە.

بەرەو گوڵە سوورەکان و هەنگەکان و پۆلە کۆترەکان دەرکەوە! بە تایبەت بەرەو مەلە چریکەبێژەکان تاکوو لەوان چریکە فێر بی!

چریکاندن ئیشی چاک بۆوانە، قسە کردن بۆ لەشساغەکان دابنێ و کاتێک لەشساغ مەیلی گۆرانی بکا، گورانییەکی دیکەی جگە لە چاک بۆوان دەوێ.»

زەردەشت بە گیاندارەکانی پێکەنی و وڵامی دانەوە: «بێدەنگ، ویشکەڕنەکان و چەنەوەڕەکان! ئێوە باش دەزانن کە من لە حەوت ڕۆژ دا چ حەسانەوەیەکم بۆ خۆ بنیات ناوە!

من لەبەر ئەوە کە دەبێ گۆرانی بڵێم، ئەم حەسانەوە و ئەم چاک بوونەوەیەم بۆ خۆ بنیات ناوە: ئێوە دەتانەوێ ئەمەش بکەنە بنێشتەخۆشکە؟»

جارێکی دی گیاندارەکانی وڵامیان داوە: «ئەی چاک بۆوە، ئیدی قسە مەکە، وا باشترە کە بۆ خۆت چەنگێک ساز بکەی، چەنگێکی نوێ!

چونکە، بزانە، ئەی زەردەشت، کە گۆرانیە نوێیەکانی تۆ، چەنگێکی نوێیان پێویستە.

زەردەشت، بێژە و بهاژێنە و ڕەوانی خۆت بە گۆرانی نوێیەکان چاک کەوە تا بتوانی تاقەتی چارەنووسی گەورەی خۆت بێنی، چارەنووسێک کە تاکوو ئێستا چارەنووسی کەس نەبوە!

چونکە گیاندارەکانت باش دەزانن، ئەی زەردەشت، کە تۆ کێی و دەبێ ببی بە کێ: بڕوانە **تۆ مامۆستای گەڕانەوەی هەرمانەتی** ـ نووکە ئەمەیە چارەنووسی **تۆ!**

لەبەر ئەوە کە تۆ هەروەک یەکەم کەس دەبێ ئەم ئامۆتەیە فێر بکەی ـ چلۆن



دەکرێ کە ئەم چارەنووسە گەورەیە هەروەک گەورەترین مەترسی و نەخۆشی تۆ نەبێ!

بزانە کە ئێمە دەزانین کە تۆ چ فێر دەکەی: تۆ فێر دەکەی کە گشت شتێک هەرمان دەگەڕێتەوە و ئێمەش دەگەڵ ئەوان، ئێمە هەتا ئێستا بێنەهایەت جار بووین و هەموو شتێکیشمان دەگەڵ بوە.

تۆ فێر دەکەی کە ساڵێکی گەورەی بوون هەیە، ساڵێکی یەکجار گەورە، کە دەبێ هەروەک سەعاتی لمی هەمیشە سەرلەنوێ خۆی وەرسووڕێنێتەوە، هەتا سەرلەنوێ برژێتەوە و بەتاڵ بێتەوە.

هەر ئەوجۆرەی کە گەورەترین و بچووکترین شتەکانی ئەم ساڵە کە وەک یەک بوون، ئێمەش لە گەورەترین و بچووکترین شتەکانمان دا لە هەر ساڵێکی گەورە دا هەر ئەوەین کە بووین.

ئەی زەردەشت ئەگەر نووکە تۆ داواکاری مردن بی، بزانە کە ئێمە دەزانین کە تۆ ئەودەم چ بە خۆت دەڵێی ـ بەڵام گیاندارەکانت داوات لێت دەکەن کە جارێ نەمری!

تۆ قسە دەکەی، بەڵام نە بە لەرزینەوە بەڵکە بە هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ لە خۆشیەوە، چونکە سەختی و قورسایی گەورە لە شانی تۆ هەڵگیراوە، ئەی سێبوورترین.

تۆ دەڵێی: نووکە دەمرم و دەفەوتێم و لە دەمێک دا نامێنم. ڕەوانەکان شیاوی مردنن هەر ئەوجۆرەی کە لەشەکان دەمرن.

بەڵام ماشەری ئەو هۆیانەی کە لە من هاڵاوە دەگەڕێتەوە ـ و من دیسان دەئافرێنێتەوە. من خۆم هۆ گەڕاوەکانی هەرمانم.

من دەگەڕێمەوە، بەم هەتاوە، بەم زەوییە، بەم هەڵۆیە، بەم مارەوە ـ بەڵام نەک بۆ ژیانێکی نوێ یا ژیانێکی باشتر یا ژیانێکی هاوتا:

ـ من هەرمان بۆ ئەمە و هەر ئەم ژیانە، بە گەورەترین و چووکترین شتەکانیەوە، دەگەڕێمەوە، هەتا جارێکی دی گەڕانەوەی هەرمانی گشت شتێک فێر بکەم.

هەتا جارێکی دی پەیڤی نیوەڕۆی مەزنی زەوی و مرۆڤ بێنمە سەر زار، هەتا

جارێکی دی مزگێنی بەرزەمرۆڤ بە مرۆڤ بدەم.

من پەیڤی خۆم گوت و لە سەر پەیڤی خۆم تێک دەشکێم: چارەنووسی هەرمانم وەهای دەوێ؛ من لە پلەی مزگێنی دان دا دەفەوتێم!

نووکە ئەو سەعاتە داهاتوە کە ئاوابوو دوعا بۆ خۆی بکا. وەها ـ تەواو دەبێ ئاوا بوونی زەردەشت.» ـ

کاتێک گیاندارەکانی ئەم قسانەیان کرد، بێدەنگ بوون و چاوەڕوان مانەوە هەتا زەردەشت شتێکیان پێبلێ؛ بەڵام زەردەشت بێدەنگی ئەوانی نەبیست. بەڵکە بە چاوی قووچاو، هەروەک خەوتوویەک، بێجووڵە ماوە، سەرەڕای ئەوە کە خەوی لێنەکەوتبوو: چونکە دەگەڵ ڕەوانی خۆی وتوێژی هەبوو. بە هەر حاڵ، هەڵۆ و مار کە ئەویان وەها بێدەنگ دیت، ڕێزی بێدەنگیی مەزنی دەوروبەری ئەویان گرت و بە ئەسپایی دوور بوونەوە.

## سەبارەت بە تاسەی مەزن

ئەی ڕەوانی من، تۆم فێر کردوە کە وەها بێژی «ئەمڕۆ» وەک بێژی «ڕۆژێک» و «ڕۆژگارێک»، و بە سەر تەواوەتی ئێر و ئەوێ و ئەولا دا، بە خولانەوە سەما بکەی و تێپەڕی.

ئەی ڕەوانی من، من تۆم لە گشت گۆشەکان ڕزگار کرد و تۆز و تەونۆکەکان و بوولێڵەکانم لە تۆ سڕیوە.

ئەی ڕەوانی من، من شەرمی بچووک و ئاکارباشی گۆشە ـ نشینانەی تۆم شوشتەوە و تۆم وا لێکرد کە بە رووتی لە ئاست چاوەکانی هەتاو دا بوەستی.

بە تۆفانێک کە ناوی «گیان» ە، هەڵمکردە سەر دەریای بە شەپۆلت و گشت هەورەکانم لە سەر ڕەواند؛ من خۆم هەناسەی ئەو هەناسەبڕەم بڕی کە ناوی «گوناه»ە.

ئەی ڕەوانی من، من ئەم مافەم دا بە تۆ کە هەر وەک تۆفان بێژی «نا»، و هەر وەک ئاسمانی ساو بێژی «ئادی»: تۆ نووکە وەک نوور، ئارام دەوەستی و بە نێوان تۆفانە فەوتێنەرەکان دا تێدەپەڕی.

ئەی ڕەوانی من، من لە سەر ئافراوەکان و نەئافراوەکان ئازادییم دایەوە و کێ



وەک تۆ سەرخۆشیی داهاتوان دەناسێ.

ئەی ڕەوانی من، من بەچووک دانانێکم فێر کردی کە هەروەک کرمێ بوون سەر هەڵنادا، بەڵکە بەچووک دانانێکی گەورە و ئەویندار، کە لەو جێیەی کە لە گشت کەس پتر بەچووک دادەنێن، پتر لە گشت کەس ئەویندار دەبێ.

ئەی ڕەوانی من، بۆ لای خۆ ڕاکێشانم وەها فێری تۆ کرد کە تۆ هەروەک هەتاو کە دەریا بەرەو بەرزایی خۆی ڕادەکێشێ، بنج و بناوانەکان بۆ لای خۆت ڕادەکێشی.

ئەی ڕەوانی من، من گشت فەرمانبەریی و چۆک دادان و سەرۆک گوتنێکم لە تۆ ستاندەوە: من خودی تۆم بە «ئاڵوگۆڕی نیاز» و «چارەنووس» ناودێر کرد.

ئەی ڕەوانی من، من ناوە نوێیەکان و لەیستۆکە ڕەنگینەکانم پێدای؛ من تۆم بە «چارەنووس» و «مەداری مەدارەکان» و «بەندی نێوکی زەمان» و «زەنگی شین» ناودێر کرد.

ئەی ڕەوانی من، من گشت فرەزانییەکانم دەرخواردی خاکەکەت دا، گشت شەڕابە تازەکان و هەروەتر گشت شەڕابە خەستەکانی زۆر کۆنی فرەزانی.

ئەی ڕەوانی من، من هەر هەتاو و هەر شەو و هەر خامۆشی و هەر تاسەیەکم دە نێو تۆ کرد: ئەوسا تۆ مینا دارەمێو ڕسکای.

ئەی ڕەوانی من، تۆ نووکە توانا و پتەو لەوێ وەستاوی، چەشنی دارمێوێک بە گوانە پڕ و خڕە هەڵدراوەکانی ترێ زێڕنە ڕەنگ تارەکان.

ـ پڕ و ڕێک کوشراو لە بەختیاری خۆ، لێوڕێژ لە چاوەڕوانی و سەرەڕای ئەمانە شەرمەزار لە چاوەڕوانی خۆ.

ئەی ڕەوانی من، نووکە ڕەوانێکی ئەویندارانەتر و وەخۆگرتر و بە نێوەرۆکتر لە تۆ نییە! لە کوێ داهاتوو و ڕابوردوو وەها لێک نزیک بوون وەک لە لای تۆ لێک نزیکن؟

ئەی ڕەوانی من، من هەموو شتێکم داوە بە تۆ و دەستەکانم لە تۆ دا بەتاڵ بوون ـ و نووکە! نووکە تۆ بە بزەوە و لێوڕێژ لە پەژارە بە من دەڵێی: «کامەمان دەبێ شوکرانەبژێر بێ؟

مەگەر بەخشێنەر نابێ شوکرانەبژێری ئەوە بێ کە ستێنەر دەستێنێ؟ مەگەر بەخشینەوە نیاز نیە؟ مەگەر ستاندن ـ بەزەیی نیە؟

ئەی ڕەوانی من، من لە بزەی پەژارەت دەگەم: نووکە پڕایی زێدەی تۆیە کە دەستە تاسەبارەکانی درێژ کردوە!

پڕایی تۆیە کە چاوی لە دەریا بە فەرتەنەکان بڕیوە و دەگەڕێ و چاوەڕێیە. پڕایی زۆری تاسەت لە ئاسمانی چاوە بە بزەکانت بۆ سەر دەڕوانێ!

بە ڕاستی، ئەی ڕەوانی من! کێیە کە بزەت ببینێ و لە ئەسرینت دا نوقم نەبێ؟ فریشتەکانیش خۆیان لەبەر دڵاویی بزەت لە ئەسرین دا نوقم دەبن.

ئەوە دڵاویی و دڵاویی زێدەی تۆ نیە کە داخوازی گازندە کردن و گریانە؛ سەرەڕای ئەمە، ئەی ڕەوانی من، بزەت تاسەباری گریانە و دەمی لەرزۆکت تاسەباری هەنیسک دان.

«مەگەر هەر گریانێک گازندەیەک نیە؟ و هەر گازندەیەکیش شکایەتێک؟» ـ تۆ وەها بە خۆ دەڵێی و لەبەر ئەوە، ئەی ڕەوانی من، لەبری هەڵڕشتنی غەمەکانت بزەت دێتێ ـ

ـ لەبری ئەوە کە گشت ڕەنجی پڕایی خۆت و بێئۆقرەیی دارەمێو بۆ ترێچن و کێردی ترێ برین لە بارانی ئەسرین دا داباڕێنێ!

بەڵام، ئەگەر نەتەوێ بگری و پەژارەی ئەرخەوانیت بە ئەسرین هەڵڕێژی، دەبێ ستران بێژی، ئەی ڕەوانی من! ـ بڕوانە کە من، یانی هەر ئەوەی کە لە ئاستت وەها دەڵێ، خۆم بزەم دێتێ:

ـ ستران بێژە، بە دەنگێکی بەقەو، تاکوو دەریاکان گشتیان بێدەنگ بن، هەتا گوێ لە تاسەت بگرن،

ـ هەتا لە سەر دەریا ئارام و تاسەبارەکان ئەو گەمێیە باژوێ، هەر ئەو موعجزە زێڕنە کە لە دەوروبەری زێڕەکەی شتگەلی چاک و خراپی سەیر لە هەڵبەز و دابەز دان.

ـ هەروەتر گەلێک گیانداری ورد و درشتی سەیر و ئەوەی کە پێی سووک و سەیری بۆ ڕاکردن بە سەر کوێرەڕێ کەو ڕەنگەکان دا هەیە ـ

ـ بۆ لای ئەو موعجزە زێڕنە، یانی گەمێی ورە ـ ئازاد و خێوەکەی ئەو: ئەو



هەر ئەو ترێچنەیە کە بە کێردی ترێ بڕی ئەڵماس چاوەڕێیە ـ

ـ هەر ئەو ڕزگاریدەرە مەزنەت، ئەی ڕەوانی من، ئەو بێناوە ـ کە گۆرانیەکانی داهاتوو ناوێکی بۆ دەدۆزنەوە! و بە ڕاست، هەنووکە لە هەناسەت سروەی نەرمی گۆرانیەکانی داهاتوو دێ.

هەنووکە تۆ سوور هەڵگەڕاوی و خەون دەبینی، هەنووکە لێو تینوو لە گشت چاڵاوە قووڵ و زایەڵەدەرەکانی ئەهوەنیی، دەخۆیەوە؛ هەنووکە غەمەکانت لە شادی گۆرانیەکانی داهاتوو دا دەحەسێنەوە.

ئەی ڕەوانی من، من نووکە گشت شتێکم دایەی، هەروەتر دوایین شتم و دەستەکانم لە تۆ دا بەتاڵ بوون: تێبگە کە دوایین شتم ئەمە بوو کە داوای گۆرانیت لێبکەم!

بەم فەرمانە بۆ گۆرانی کوتن، نووکە پێم بڵێ، بڵێ کام یەک لە ئێمە ـ دەبێ شوکرانەبژێر بێ؟ بەڵام واباشترە کە گۆرانی بڵێی، بیڵێ ئەی ڕەوانی من، بڵا کە من شوکرانەبژێر بم!

وەهای گوت زەردەشت.

## سترانی سەمایەکی دی

### ١

ئەی ژیان، بەم زوانە ڕوانیمە چاوەکانت و لە چاوە شەوڕەنگەکانت دا ورشەی زێڕم دیت ـ و دڵم لە خۆشیان وەستا.

دیتم کە لۆتکەیەکی زێڕن لە سەر ئاوە شەوڕەنگەکان ورشەی دێ، لۆتکەیەکی زێڕن کە لە سەر ئاو ڕادەژا و سەری دادەنواند و ئاوی دەخواردەوە و دیسان لە سەر ئاو ورشەی دەداوە!

نیگایەکت لە پێیەکانم کە شێتی سەمان، کرد، نیگایەکی پڕ لە پێکەنین و پڕ لە

پرسیار و تاوێنەرانە:

تەنیا دوو کەڕەت زەنگۆڵەکانت بە دەستە بچووکەکانت لێک دا ـ ئەودەم پێیەکانم لە خۆشییان بۆ سەما وەجووڵە کەوتن.

پاژنەکانم راست بوونەوە، پەنجەکانم گوێیان قوت کردەوە: مەگەر گوێچکەکانی سەماکەر لە پەنجەکانی دا نین؟

بۆ لات فڕیم، بەڵام لەبەر بازم بەرەو دوا رات کرد؛ بڵێسەکانی راکەر و بازدەری پرچەکانت بۆ لام کڵپەیان دا.

من لە ئاست تۆ و مارەکانت بەرەو پاش بازم دا: ئەوسا بە چاوە پڕ لە تکاکانت لابەلا وەستای.

تۆ بە نیگا خواروخێچەکانت، رێگا خواروخێچەکانم فێر دەکەی و پێیەکانم لە رێگا خواروخێچەکان فێرە گزی دەبن!

لە نزیکەوە لێت دەترسم و لە دوورەوە ئەوینداری تۆم: راکردنت من بە دوات دا دەکێشێ و چاوەڕوانیت من لە سەر جێی خۆم رادەگرێ: من رەنج دەکێشم، بەڵام کامە رەنجە کە بۆ خاتری تۆ نەمکێشاوە؟

ـ بە خاتری تۆیەک کە ساردییت بەرەو ئاگر دەمکێشێ و بێزارییت بە دوای خۆت دا دەمبا و باڵ گرتنت باڵم دەبەستێ و بزەی تەوساوییت ـ تێکم دەدا.

کێیە کە لە تۆ بێزار نەبێ، لە تۆ، بانووی دیلکەر، تێکەوەپێچەر، فریودەر، پشکێنەر، دۆزێنەر! کێیە کە ئەوینداری تۆ نەبێ، تۆ گوناهکاری بێتاوانی بێئۆقرە و شیرەخۆرەی خۆشبەز!

نووکە بەرەو کوێم دەکێشی، ئەی نوێنەر و ئەی منداڵی بە هات و هەرا؟ نووکە دیسان لێم رادەکەی، ئەی شیرین ـ بەدفەڕی سپڵە!

من بە سەما بە شوێن تۆ دا دێم، من وەدوای چووکترین شوێن پێشت دەکەوم. لە کوێی؟ دەستت بدە بە من! یا تەنیا ئەنگوستێکت!

ئێرە پڕ لە ئەشکەوت و مێشەیە! ئێمە بزر دەبین! ـ راوەستە! راوەستە! نابینی کە کوند و چەکچەکیەکان بە قیژەقیژەوە دەفڕن؟

ئەی کوند، ئەی چەکچەکی؟ دەتەوێ گاڵتەم پێبکەی؟ ئێمە لە کوێین؟ ئەم



وەڕین و لوورەیە لە سەگەکان فێر بووی؟

بە ددانە چووکە سپیەکانت چەندە جوان ددانم لێ تیژ دەکەی. لە ژێر یاڵی کورتی لوولت زیتەی چاوە بەدخوازەکانت بۆ لای من دێن!

ئەمە سەمایەکە لە سەر کەند و لەند: من راوچیم ـ تۆ دەخوازی سەگی من بی یان مامزەکەم.

نووکە وەرە لام! نووکە، ئەی بازدەری بەدزات! نووکە هەستە! وەرە پێشەوە! ئامان، کە من خۆم کاتی باز دان کەوتم!

ئەی قۆشمە، بڕوانە کە کەوتووم و داوای یارمەتی دەکەم! چەندە باش دەبوو ئەگەر دەگەڵ تۆ بە رێگاگەلێکی دڵخوازتر دا رۆیشتبام!

ـ بە رێگای ئەوین دا، بە نێوان چرپیە رەنگینە بێدەنگەکان دا! یا لە پەنا ئەو دەریاچەیەی کە ماسیە زێڕنەکان تێیدا مەلە و سەما دەکەن!

ئێستا ماندووی؟ لەو دوورەدەستانە مەڕی لێیە و شەوە: ئایا کاتێک شوانەکان بلوێر دەژەنن خەوتن خۆش نیە؟

ئایا زۆر شەکەتی؟ دەستەکانت شل بەردەوە هەتا تۆ بۆ وێندەرێ بەرم! ئەگەر تینووت بێ شتێکم بۆ خواردنەوە پێیە، بەڵام زارت نایەوێ ئەو بخواتەوە.

هاوار لەم مارە لەش ـ نەرمە تیژڕەوە بەدزاتە، ئەم جادووگەرە نەرم ـ خزە! چوویە کوێ؟ هەست دەکەم کە پەنجەت دوو شوێنی روومی داڕووشاندوە و برینێکی سووری لە سەر جێهێشتوە!

بە راستی، لەوە کە دەبێ هەمیشە شوانی مەڕ ـ شێوەت بم وەگیان هاتووم! ئەی جادووگەر، تاکوو ئێستا من گۆرانیم بۆ تۆ گوتوە، نووکە تۆ دەبێ ـ هاوارم بۆ بکەی!

دەبێ بە زەبری قەمچی سەما بکەی و بقیژێنی! قەمچیم لە بیر نەکردوە؟ ـ نا!

## ٢

ئەودەم ژیان گوێچکە ناسکەکانی گرت و وەهای وەڵام دامەوە:

«زەردەشت، قەمچیت وەها توند مەوەشێنە! تۆ باش دەزانی کە هات و هەرا

قاتڵی بیرە ـ و نووکە بیرە ناسکەکان بۆم دادێن.

ئێمە هەردووکمان، بە راستی، نە بۆ شتێک باشین و نە بۆ شتێک خراپ. ئێمە دوڕگە و مێرگی زەنوێری خۆمان لەوپەڕی چاکە و خراپە دا دیوەتەوە، تەنیا ئێمە دوو کەس! لەبەر ئەوە دەبێ دەگەڵ یەک باش بین!

هەر چەند بە دڵ و بەگیان یەکدیمان خۆش ناوێ ـ مەگەر ئەوانەی کە یەکدییان بە دڵ و بەگیان خۆش ناوێ دەبێ دەگەڵ یەک خراپ بن؟

ئەگەر من دەگەڵ تۆ باشم و بگرە زۆرزۆر باش، تۆ دەزانی کە هۆی ئەوە، ئێرەیی من بە فرەزانی تۆیە. ئاخ لە دەست ئەم شێتە پیرە، ئەم خاتوونە فرەزانە شێتە!

بەڵام ئەگەر رۆژێک فرەزانیت لێت رابکا، ئەوینی منیش دەستبەجێ لێت رادەکا!»

ئەودەم ژیان بە دەم بیر کردنەوەوە روانیە دەور و پشتی خۆی و ئارام گوتی: «زەردەشت، تۆ ئەوەندەش بە من وەفادار نی!

تۆ ئەوەند کە بە زمان دەریدەبڕی، منت خۆش ناوێ؛ دەزانم کە تۆ لە بیری ئەوە دای کە بەم زوانە جێم بێڵی.

کۆنە زەنگێکی قورس و دەنگ ـ قورس هەیە کە شەوانە زایەڵەی دەگاتە ئەشکەوتەکەی تۆ.

کاتێک نیوەشەوانە دەنگی ئەم زەنگە دەبیسی کە سەعات رادەگەیەنێ، تۆ لە نێوان یەک هەتا دوازدە بیر لەوە دەکەیەوە ـ «ـ من دەزانم، ئەی زەردەشت، تۆ بیر لەوە دەکەیەوە کە بەم زوانە جێم دێڵی!»

من بە دوودڵییەوە وڵامم داوە: «ئادی ـ بەڵام تۆش دەزانی کە...» و بە نێوان ئەگریجەی زیڕن هەودای شێتانەی شەمزاوی شتێکم بە گوێی دا چرپاند.

«تۆ ئەوە دەزانی، زەردەشت؟ هیچ کەس ئەمە نازانێ.»

ئێمە روانیمانە یەک و سەیری مێرغوزارێکی زەنوێرمان کرد کە شەوێکی سارد بە سەری دا تێپەڕی و پێکەوە گریاین. بەڵام، لەو دەمە دا ژیان لای من لە تەواوی فرەزانییەکەم بەرێزتر بوو.



وەهای گوت زەردەشت.

## ٣

یەک!

ئەی مرۆڤ! سەرنج بدە!

دوو!

نیوەشەوی قووڵ چ دەبێژێ؟

سێ!

خەوتبووم، خەوتبووم ـ

چوار!

لە خەوی قورس راپەڕیوم.

پێنج!

دونیا قووڵە،

شەش!

قووڵتر لەوەی کە رۆژ بیری لێکردۆتەوە!

حەوت!

دەردی ئەو قووڵە،

هەشت!

لەزەت ـ قووڵتر لە مەینەت:

نۆ!

دەرد دەڵێ: بەسە!

دە!

بەڵام هەر لەزەتێک هەرمانەتی دەوێ

یازدە!

هەرمانەتییەکی قووڵی قووڵ!

دوازده!

## حەوت مۆر
## (یا: سروودی ئا و ئامین)

### ١

من ئەگەر پێشگۆم و تژی لەو گیانە پێشگۆیانە کە لە سەر گردە بەرزەکانی نێوان دوو دەریا دەخولێتەوە ـ

خولانەوە لە نێوان رابوردوو و داهاتوو دا، وەک هەورێکی قورس کە دوژمنی زەوی شێدارە نزمەکانە و دوژمنی ئەوەی کە ماندووییە و نە توانای ژیانی هەیە و نە مەرگ:

لە سینگی تاری دا بزاوی برووسکە و گرشەی رزگاریدەری نوور، ئاوسی برووسکانەی «ئا»بێژ و «ئا»کەنین، ئاوسی گرشەی پێشگۆیانەی برووسک ـ

خۆزگەم بە وەها ئاوسییەک! بە راستی، ئەوەی کە رۆژێک دەبێ شۆقی داهاتوو پێبکا، دەبێ درێژماوەیەک چەشنی تۆفانێکی قورس لە سەر کێوەکان هەڵواسرابێ!

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەوینداری ئەوم: چونکە من ئەوینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

**چونکە من ئەوینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!**

### ٢

ئەگەر تووڕەییم گۆڕەکانی هەڵتەکاندوە و بەردەڕێژەکانی وەرگێڕاوەتەوە و



دەپە کۆنەکانی بە تێشکاوی، بەرەو قووڵاییە لێژەکان تل داوە:

ئەگەر بزەی گاڵتەجاڕم پەیڤە پواوەکانی بە با داوە و ئەگەر هەر وەک کەسێک چوومە زگ جاڵجاڵۆکە خاچ نشینەکان و هەروەک بای رەپێچەکدەر هەڵمکردۆتە سەر دەخمە کۆنە شێدارەکان:

ئەگەر بە شادیەوە لە جێگەیەک دانیشتووم کە خودا کۆنەکان چوونە نێو گۆڕەوە، ئەگەر ئافەرین وێژی دونیا و ئەوینداری ئەو، لە پەنا یادمانە کۆنە ـ بەدوێژەکانی دونیا دانیشتووم ـ

چونکە من خودی کلیساکان و گۆڕەکانی خوداکانیشم خۆش دەوێن، ئەگەر چاوە پاکەکانی ئاسمان بە نێوان میچە وێرانەکان دا بڕوانێتە ژوورەوە؛ و شادخوازانە هەروەک شیناوەرد و خاشخاشکی سوور لە سەر کلیسا کاولەکان دادەنیشم ـ

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەوینداری ئەوم: چونکە من ئەوینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

**چونکە من ئەوینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!**

### ٣

ئەگەر پشوویەک لە پشووکانی ئافرێنەری وە من کەوتوە و لەو جەبرەی ئاسمانی کە کارەساتەکانیش ناچار دەکا کە هەروەک هەسێرەکان بە گەڕ سەما بکەن:

ئەگەر من بە پێکەنینی برووسکی ئافرێنەر پێکەنیوم، کە گرمەی درێژ دەنگی، بە گرمەگرم بەڵام بە فەرمانەوە بە دوای دا دێ:

ئەگەر من لە سەر تەختەنەردی خودایی زەوی، دەگەڵ خوداکان وەهام دۆڕاندوە کە زەوی هەژیاوە و لێک قەڵەشاوە و لێمشتی بە تینی ئاگری لێهەڵقوڵیوە ـ

ـ چونکە زەوی تەختەنەردێکی خوداییە و لە پەیڤەکانی ئافرێنەرانەی نوێ و تاس هەڵخستنی خوداکان دەهەژێ ـ

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەویینداری ئەوم: چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

**چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!**

## ٤

ئەگەر من قومێکی تەواوم لە جامی بەهاراتی کەفدار و ئاوێتە خواردۆتەوە، کە گشت شتەکان بە باشی لێکدراون:

ئەگەر دەستم هەرە دووری دە هەرە نزیک کردوە و ئاگری دە گیان و لەزەتی دە رەنج و هەرە خراپی دە هەرە باش:

ئەگەر من خۆم دەنکێک لەو خوێ رزگاریدەرەم، کە گشت شتێک لە جامی لێک دراو دا لێک دەدا:

ـ چونکە خوێیەکە کە چاک لە خراپ دەبەستێ و هەروەتر هەرە خراپیش شایەنی بەهارات لێدان و دوایین کوڵان و هەڵچوونە.

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەویینداری ئەوم: چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

**چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!**

## ٥

ئەگەر من خۆشەویستی دەریام و ئەوەی کە مینا دەریایە، و ئەوسا کە بە هەڵگەڕاوی دەگەڵ من بە کێشە دێ، پتر لە هەر دەمێک خۆشم دەوێ:



ئەگەر ئەو مەیلی پشکنینە لە من دایە کە باسپێرەکانی بەرەو نەدۆزراوەکان هەڵداوە، ئەگەر مەیلی دەریاگەڕەکان لە مەیلی من دایە:

ئەگەر شادیی من هاوار دەکا: «بەستێن نەدیو بوە ـ نووکە دوایین زنجیرم لێدادەکەوێ ـ

ئەو بێمەرزە لە ئاقارم دەگرمێنێ، لە دوورەدەستان زەمان و مەکان دەدرەوشێنەوە، بڕوانە راپەڕە، دڵی پیر!»

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەویینداری ئەوم: چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

**چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!**

## ٦

ئەگەر ئاکارباشیم سەماکەرێکە و گەلێک جاران خۆم بە دوو پێیان لە نێو شادی زێڕنی زمووردین هاویشتوە:

ئەگەر بەدخوازیم بەدخوازییەکی دەم بە پێکەنینە و نێو شیلان و سوێسنەکان بە ماڵی خۆی دادەنێ

ـ چونکە لە پێکەنین دا بەدخوازییەکان گشتیان لێک کۆ دەبنەوە، بەڵام پیرۆزیی پێکەنین ئەو بە پیرۆز دادەنێ.

ئەگەر سەر و بنی قسەکانم ئەوەیە کە ئەوەی کە قورسە، سووک دەبێ و لەشەکان گشتیان سەماکەر و گیانەکان گشتیان مەل: بە راستی، ئەمەیە سەر و بنی قسەکانم!

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەویینداری ئەوم: چونکە من ئەویینداری تۆم، ئەی هەرمانەتی!

## ٧

ئەگەر من ئاسمانێکی ئارامم لە بان سەری خۆ هەڵداوە و بە باڵی خۆم لە ئاسمانی خۆم فڕیوم:

ئەگەر من بە کایە کردن بەرەو دوورەدەستەکانی قووڵ و بە گرشە مەلەم کردوە و مەلی ئازادییم کە ناوی فرەزانییە بەرز بۆتەوە:

ـ ئادی، مەلی فرەزانی وەها دەڵێ: «بڕوانە، نە سەرێک لە ئارا دایە و نە خوارێک! خۆت بۆ ئاقار و دەر و پشت باوێ، ئەی سووک! گۆرانی بڵێ! ئیدی قسە مەکە!

مەگەر گشت وشەکانیان بۆ قورسەکان ساز نەکردوون؟ مەگەر گشت وشەکان درۆ دەگەڵ سووکەکان ناکەن؟ گۆرانی بڵێ! ئیدی قسە مەکە!»

ئاخ چلۆن دەتوانم بۆ هەرمانەتی و بۆ ئاڵقەی ئاڵقەکانی زەماوەند ـ ئاڵقەی گەڕانەوە حەشەڕی نەبم؟

هێشتا ئەو ژنەم نەدیتۆتەوە کە داخوازی منداڵێک لەو بم، مەگەر ئەو ژنەی کە ئەویندارى ئەوم: چونکە من ئەویندارى تۆم، ئەى هەرمانەتى!

**چونکە من ئەویندارى تۆم، ئەى هەرمانەتى!**

# وەهای گوت زەردەشت

## چوارەمین و دوایین بەش

ئاخ لە دونیا دا کەی گەوجایەتییەکی پتر لە گەوجایەتی بەزەییداران هەبوە؟ و چ شتێک لە دونیا دا پتر لە گەوجایەتی بەزەییداران رەنجی پێک هێناوە؟

هاوار لەو ئەویندارانەی کە سەرتر لە بەزەییان پێگەیەکیان نیە!

شەیتان جارێک وەهای پێگوتم: «خوداش دۆزەخی خۆی هەیە: دۆزەخی ئەو ئەوین بە مرۆڤە.»

بەم زوانە بیستم کە گوتی: «خودا مردوە! بەزەیی خودا بە مرۆڤ ئەوی کوشت.»

**زەردەشت، بەشی دووهەم، سەبارەت بە بەزەییدارەکان**

## بەخت کردنی هەنگوین

دیسان گەلێک مانگ و ساڵ بە سەر رووحی زەردەشت دا تێپەڕی و ئەو سەرنجی نەدایە، بەڵام مووی سپی ببوو. رۆژێک، هەروا کە لەبەر زارکی ئەشکەوتەکەی لە سەر بەردێک دانیشتبوو و بێدەنگ دەیڕوانی ـ چونکە لەوێوە لەپەنا کەنداڵە باگرەکان، دەریا دەدیترا ـ گیاندارەکانی بە فکرەوە دەورەیان دا و لە ئاکام لە بەرابەری دانیشتن.

ئەوان گوتیان: «زەردەشت! ئایا بە شوێن بەختیاری خۆتەوە دەڕوانی؟» ئەو وڵامی داوە: «بەختیاری چیە! دەمێکە بە شوێن بەختیارییەوە نەبووم. من بە شوێن کاری خۆمەوەم.» گیاندارەکان جارێکی دی پرسیان: «تۆ ئەم قسەیەت وەک کەسێک دەربڕی کە پتر لە رادە شتی باشی هەیە. ئایا تۆ لە دەریاچەیەکی شین لە بەختیاری دا مەلە ناکەی؟» زەردەشت بزەیەکی هاتێ و گوتی: «فێڵەزانینە! وێچواندنێکی باشتان هەڵبژارد! بەڵام ئێوە هەروەتر دەزانن کە بەختیاری من قورسە و وەک کانیاوێکی رەوان نیە. ئەو من رێک دەکوشێ و لێم ناگەڕێ و وەک قیری تواوە وایە.

ئەودەم گیاندارەکان بە فکرەوە بە دەوری دا گەڕان و جارێکی دی لە بەرابەری وەستان و گوتیان: «زەردەشت! ئایا لەبەر ئەوە نیە کە تۆ هەر دێ و روو زەردتر و تارتر دەبی، کەچی مووییەکانت بەرەو سپیایەتی و روونی دەچن؟ بڕوانە، تۆ لە قیرەکەت دا گیرت کردوە!» زەردەشت بە پێکەنینەوە گوتی: «بە راستی کفرم کرد کە وەها لە قیر دوام، ئەوەی کە بە سەر من دا تێدەپەڕێ، هەر ئەوەیە کە بە سەر گشت بەرێکی گەیو دا تێدەپەڕێ. هەنگوینێک لە رەگەکانی من دایە کە خوێنم خەستتر و رووحم ئارامتر دەکا.» گیاندارەکان وەهایان وڵام داوە و خۆیان لەو هەڵسوو: «بڵا وابێ، زەردەشت! بەڵام ناتەوێ ئیمرۆ بە کێوێکی بەرز هەڵگەڕێی؟ هەوا پاکە و ئیمرۆ دەکرێ پتر لە جاران دونیا ببینی.» ـ ئەو وڵامی داوە: «ئا، گیاندارەکانم، قسەکەتان بە جێیە و هەر ئەوەیە کە دڵی من دەیەوێ: ئیمرۆ



دەمەوێ بە کێوێکی بەرز هەڵگەڕێم! بەڵام وریا بن کە لەوێ هەنگوین لەبەر دەستم بێ، زەرد، سپی، باش، شانەی زێڕنی وەک سەهۆڵ تازە. چونکە بزانن، من دەمەوێ لەو بەرزاییە هەنگوین بەخت بکەم.»

بەڵام کاتێک زەردەشت گەیشتە ترۆپک، ئەو گیاندارانەی کە رەگەڵی کەوتبوون، ناردیەوە ماڵ و خۆی بە تەنیا دیتەوە: ئەوسا لە قووڵایی دڵیەوە پێکەنی و روانیە دەوروبەری خۆی و وەهای گوت:

باس کردنم لە بەخت کردن و بەخت کردنی هەنگوین تەنیا فێڵێک بوو و بە راستی، گەوجایەتییەکی بە کەلک بوو! لەم بەرزاییە باشتر دەتوانم قسە بکەم هەتا لە ئاست ئەشکەوتی خەڵوەنشینەکان و گیاندارە دەستەمۆکانیان.

بەخت کردن چیە! من ئەوەی کە پێیان بەخشیوم، بە بای دەدەم، من ئەو بە بادەرە هەزار دەستە، چلۆن دەتوانم ئەو بە بەخت کردن ناو بەرم!

ئەودەم کە خوازیاری هەنگوین بووم، خوازیاری وەها چێشکەی داوێک و شیرین شیلەیەک بووم کە ورچە درەکان و مەلە غەریب و تووڕە و بەدخوازەکانیش زمانیان بۆ درێژ دەکرد:

ـ باشترین چێشکەی راوێک کە راوکەر و ماسیگرەکان پێویستیان پێیەتی، چونکە ئەگەر دونیا هەروەک لێڕەوارێکی تاریک و پڕ لە گیاندارە درەکانە و بۆ راوکەرەکان باغی تاسەیە، لای من لەوە زیادترە و پتر وەک دەریایەکی خەنی و بێبن دەچێ.

ـ دەریایەکی پڕ لە ماسی و قرژانگە رەنگاورەنگەکان، کە لەوانەیە خوداکانیش هان بدا لەبەر ئەوان ببنە راوکەر و تۆڕەوان: دونیا وەها تژی لە شتگەلی سەیر و سەمەرەی چووک و گەورەیە!

بە تایبەت دونیای مرۆڤایەتی، دەریای مرۆڤایەتی: هەنووکە قولاپە زێڕنەکەی ماسی گرتنمی تێداوێم و دەڵێم: خۆت بکەوە، ئەی هەڵدێری مرۆڤایەتی!

خۆت بکەوە و ماسی و قرژانگە رەنگینەکانت بۆ من باوێژە! من ئیمرۆ بە باشترین چێشکەکانی راو، سەیرترین ماسیەکانی مرۆڤایەتی لە داو دەخەم!

من لە نێوان بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە دا، بەختیاری خۆم هەتا دووردوور

داوێژم هەتا گەلێک ماسی مرۆڤایەتی، بەرەنگاری دەگەڵ بەختیارییم لە یاد بکەن ـهەتاکوو بە قولاپە تیژە شاراوەکانم کە بە دەمیانەوەیە، هەتا بەرزایی من هەڵکشێن ـ ئەو ماسیە هەرە رەنگینانەی بن بنەوە هەتا [بەرزایی] بەدخوازترین ماسیگری مرۆڤایەتی.

چونکە من لە بنج و بناوانەوە، کێشەرم، راکێشەرم، هەڵکێشەرم، بۆ سەر هێنەرم، پەروەردەکەرم، رێک و پێک کەرم، من هەر ئەوەم کە رۆژێک بە خۆم گوت: «هەر ئەوە بە کە هەی!» و بێجێم نەگوت.

کەوایە با مرۆڤ بۆ لای من هەڵکشێن: چونکە من هێشتا چاوەڕێی داهاتنی نیشانەی دەمی ئاوابوونی خۆمم؛ من خۆم هێشتا، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە سەر منە؛ بەرەو خوار، بۆ لای مرۆڤ ناچم.

لەبەر ئەوە، لە سەر چیا بەرزەکان، چاوەڕێی دەمێنمەوە، گزیکار و گاڵتەکەر، نە بێتاقەت، نە لەسەرەخۆ، بەڵکە پتر وەک کەسێک کە لەسەرەخۆیی لە یاد سڕیوەتەوە ـ چونکە ئیدی «تاقەتی» نیە.

چونکە چارەنووسم ئەمانم دەداتێ. نەکا لە یادی کردبێم؟ یا لەوانەیە لە پشت رەوەزێک لە ژێر سێبەر دانیشتوە و خەریکی مێش گرتنە؟

بە راستی، دەگەڵ ئەو باشم، دەگەڵ چارەنووسی هەرمانی خۆم، کە دەگەڵ من پەلەی نیە و زەختم بۆ ناهێنێ و دەرفەتی گاڵتە و جەفەنگم پێدەدا، هەتا ئەو رادەیە کە ئیمرۆ بۆ ماسی گرتن هاتوومە سەر ئەم چیا بەرزە.

ئایا تا ئێستا کەسێک لە سەر چیای بەرز ماسی گرتوە؟ ئەگەر ئەوەی کە من لەو سەرە دەمەوێ و دەیکەم لە شێتایەتی بە دەر نیە، باشتر لەوەیە کە لەو خوارە لەبەر چاوەڕوانی سەنگین و سەوز و زەرد بووبام.

ـ لە چاوەڕوانیان هەڵمساو و بە پرتە و بۆڵە، باهێزێکی پیرۆزی کوێستان، بێتاقەتێک کە بەرەو دۆڵەکان هاوار دەکا : «گوێ بگرن دەنا بە قەمچی خودا لێتان رادەکێشم!»

نە لەبەر ئەوە کە دەگەڵ ئەم رق ئەستوورانە دوژمن بم: ئەوان لە بزەیەکی گاڵتەجاڕ پتر ناهێنن! دەبێ چەندە بێتاقەت بن، ئەم دەهۆڵە گەورە و بە گرمانە، کە یا دەبێ ئیمرۆ قسە بکەن یا قەت!



بەڵام من و چارەنووسم ـ ئێمە دەگەڵ ئیمرۆ قسە ناکەین، دەگەڵ قەتیش قسە ناکەین: ئێمە بۆ قسە کردن کاتمان هەیە و ئارام و پتر لە رادە کات. چونکە ئەویش دەبێ رۆژێک دابێ و ئیدی نەڕوا.

ئەوە چیە کە دەبێ رۆژێک دابێ و ئیدی نەڕوا؟ هەزارەی مەزنی ئێمەیە، پاشایەتی مەزنی دوورەدەستی مرۆڤ، پاشایەتی هەزار ساڵەی زەردەشت ـ

ئەم «دوورەدەستە» چ رادە دوور دەبێ؟ من چ ئیشم بەوەیە؟ بەڵام ئەمە لە دڵنیایی من چ کەم ناکاتەوە ـ من لە سەر دوو پێی خۆم قایم لە سەر ئەم پێگەیە دەوەستم ـ

لە سەر پێگەیەکی هەرمان، لە سەر رەوەزێکی پتەو و ئەزەلی، لە سەر ئەم هەرەباشە، چیای هەرە پتەوی ئەزەلی، کە گشت بایەکان دەیگەنێ، هەر ئەوجۆرەی کە دەگەنە بائەنگێو و دەپرسن: بۆ کوێ؟ لە کوێ؟ بۆ کام لا؟

لێرە پێبکەنە، پێبکەنە، ئەی بەدخوازیی بە ورشەی لەش ساغیم! قاقای درەوشاوەی بە ئەفسوونی خۆت لە چیای بەرزەوە بەردەوە! بە درەوشانەوەی خۆت جوانترین ماسی مرۆڤایەتیم بۆ لە داو بخە!

ئەوەی کە لە گشت دەریاکان دا هی منە، ئەوەی کە لە گشت شت دا هەیە و هی منە ـ ئەو ماسییە بۆ من هەڵکێشە، ئەو بۆ لای من بێنە: کە من، بەدخوازترینی گشت ماسیگرەکان، چاوەڕێی ئەوم.

بۆ دوور، دوورتر، قولاپەکەم! بۆ خوار، خوارتر، چێشکەی بەختیاریم! شیرینترین ئاونگی خۆت داتەکێنە، هەنگوینی دڵم! ئەی قولاپەکەم، لە زگی گشت پەژارە رەشەکان هەڵچەقە!

دوور، دوورتر، قولاپەکەم! ئاخ، چ دەریاگەلێک لە ئاقاری منن، چ هەڵکێشەرێکی داهاتووکانی مرۆڤ! لە بان سەرم ـ چ ئەهوەنییەکی رەنگ سوور! چ بێدەنگییەکی بێهەور!

## هاواری هانا

رۆژی داوایی زەردەشت دیسان لە سەر بەردەکەی خۆی لە بەر زارکی

ئەشکەوت دانیشتبوو و لەو حاڵە دا گیاندارەکانی لە دونیای دەرەوە دەگەڕان هەتا خواردەمەنی تازە و هەنگوینی تازە بۆ ماڵ بهێننەوە؛ چونکە زەردەشت هەنگوینی کۆنی هەتا دوایین دڵۆپ دەکار کردبوو و بە بای دابوو. بەڵام زەردەشت، هەروا کە دانیشتبوو و بە وەکازێک کە بە دەستییەوە بوو خەتی بە دەوری سێبەری خۆی دا دەکێشا کە کەوتبوو سەر زەوی و بیری دەکردەوە ـ لەپڕ راچەنی، بە راستی، نەک لەبەر خۆی و سێبەرەکەی ـ چونکە لە پەنا سێبەری خۆی سێبەرێکی دیکەی دیت. کاتێک بە پەلە هەستا و دەوروبەری چاو لێکرد، بڕوانە! پێشگۆ لە پەنای وەستابوو، هەر ئەوەی کە رۆژێک لە سەر خوانەکەی خواردبووی و خواردبوویەوە، ئەو راگەیەنەری ماندوویەتی مەزن کە فێری دەکرد: «هەموو شت وەک یەکە، هیچ شتێک بایەخی نیە، دونیا مانایەکی نیە، زانست پشووبڕە.» بەڵام لەم ماوەیە دا سیمای گۆڕابوو و کاتێک زەردەشت چاوی دە چاوی بڕی، دیسان دڵی هەراسی تێکەوت: چ مزگێنی گەلێکی شووم و برووسک گەلێکی بۆر کە لەم سیمایە دا دەگەڕان!

پێشگۆ کە بۆی دەرکەوتبوو چ لە رەوانی زەردەشت دا دەگوزەرێ، دەستێکی بە سیمای دا هێنا، وەها کە دەتگوت دەیەوێ ئەو بسڕێتەوە؛ زەردەشتیش وەهای کرد. کاتێک هەر دوو ئاوا لە بێدەنگی دا خۆیان ئارام کردەوە و ورەیان دا بە خۆیان، بە نیشانەی ئەوە کە دەیانەوێ یەکدی بناسنەوە، دەستیان دە دەستی یەک نا.

زەردەشت گوتی: «بە خێر هاتی، پەیامبەری ماندوویەتی مەزن. تۆ لەخۆوە ئاواڵ خوان و میوانی من نەبووی. ئیمڕۆش دەگەڵ من بخۆ و بخۆوە و ببوورە کە پیرەمێردێکی شاد دەگەڵ تۆ لە سەر خوان دادەنیشێ!» پێشگۆ سەرێکی لەقاندەوە و وڵامی داوە: «پیرەمێردێکی شاد؟ بەڵام زەردەشت، تۆ هەر کەسێک کە هەی، یا هەر کەسێک کە دەتەوێ ببی، بزانە کە ماوەیەکی زۆر لەم سەرە نامێنیەوە ـ گەمێیەکەت نابێ پتر لەوە لە سەر ویشکایی بمێنێتەوە.»

زەردەشت بە پێکەنینەوە پرسی: «مەگەر من لە سەر ویشکانی ماومەوە؟» پێشگۆ وڵامی داوە: «شەپۆلەکان لە دەوری کێوەکەت سەردەکەون و سەردەکەون. شەپۆلەکانی هانا و مەینەتی مەزن؛ بەم زوانە گەمێیەکەشت هەڵدەگرن و تۆ دەگەڵ خۆیان دەبەن.» زەردەشت لەم قسەیە بێدەنگ بوو و حەیران ماوە. پێشگۆ



درێژەی بە قسەکەی دا و گوتی: «هێشتاش چ دەنگێک نابیسی؟ ئایا شتێک لە قووڵاییەوە بەرەو سەر ناگوڕێ و هەڵناقوڵێ؟» زەردەشت هەروا بێدەنگ گوێی دابووە؛ ئەوسا هاوارێکی بیست بڵند، بڵند، وەها هاوارێکی دەنگ ناخۆش کە هەڵدێرەکان ئەویان بۆ لای یەکدی هەڵداشت و دەست بە دەست گێڕایان، چونکە چ کەس نەیدەویست ئەو راگرێ.

لە ئاکام زەردەشت گوتی، «ئەی مزگێنیدەری شووم، ئەوە هاوارێکی هانا و هاواری مرۆڤێکە؛ لەوانەیە لە دەریایەکی رەشەوە هەستێ. بەڵام هاواری مرۆڤ لای من چیە! لەوانەیە، تۆ بزانی کە دوایین گوناهێک کە بۆم ماوەتەوە، ناوی چیە؟»

پێشگۆ هەر دوو دەستی بەرز کردەوە و بە دڵێکی پڕ لە شادییەوە وڵامی داوە: «بەزە! زەردەشت، من هاتووم کە تۆ بەرەو دوایین گوناهت وەسوەسە بکەم!»

هێشتا ئەو قسانە تەواو نەببوون کە دەنگەکە جارێکی دی زایەڵەی داوە ـ بەڵام درێژتر و بێدەرەتانتر و گەلێک نزیکتر. پێشگۆ هاوارێکی کرد: «دەبیسی ـ دەبیسی زەردەشت؟ هاوار بۆ تۆیە، هاواری تۆ دەکا: وەرە، وەرە، وەرە، کاتە! کات!»

زەردەشت کە لەم بەینە دا شێواو و داماو، بێدەنگ وەستابوو، لە ئاکام، وەک کەسێک کە لە دەروونی خۆی رابمێنێ، پرسی: «ئەوە کێیە کە بانگم دەکا؟»

پێشگۆ دەستبەجێ وڵامی داوە: «بەڵام تۆ دەزانی کە ئەو کێیە. بۆ لە خۆتی دەشارییەوە؟ **مرۆڤی باڵاترە** کە هاواری تۆ دەکا!»

زەردەشت، هەراسان هاوارێکی کرد: «مرۆڤی باڵاتر؟ **ئەو** چی دەوێ؟ **ئەو** چی دەوێ؟ مرۆڤی باڵاتر؟ ئەو لێرە چی دەوێ؟» و پێستی شەڵاڵی ئارەقە ببوو.

پێشگۆ، بە هەر حاڵ، سەرنجی نەدا دڵەکوتەی زەردەشت، بەڵکە هەروا گوێی گرت و گوێی دایە قووڵایی. بەڵام کاتێک درێژ ماوەیەک بە بێدەنگی تێپەڕی، رووی بەرەو زەردەشت وەرگەڕاندەوە و ئەوی دیت کە وەستاوە و هەڵدەلەرزێ.

بە دەنگێکی غەمین زاری بۆ قسە کردەوە: «زەردەشت! تۆ لەوێ وەک کەسێک نەوەستاوی کە لە خۆشیان حەجمینی نیە. تۆ دەبێ سەما بکەی هەتا نەکەوی!»

بەڵام تەنانەت ئەگەر لە بەرابەرم دا سەماشت کردبا و تەواوی فروفێڵی هەڵبەز دابەزی خۆشت دە کار هێنابا، کەس نەیدەتوانی من رازی بکا کە: بڕوانە، لێرە دوایین مرۆڤی شاد سەما دەکا!

هەر کەسێک کە بۆ دیتنەوەی **وەها** پیاوێک بێتە سەر ئەم بەرزاییە، بە خوڕایی هاتوە: ئەو بەبێ شک ئەشکەوتەکان و رەهەندەکان و سێپەی سێپچیان دەبینێتەوە، بەڵام کانگاکان و گەنجەکان و رەگە تازەکانی زێری بەختیاری هیچ نادۆزێتەوە.

بەختیاری! کەی کەسێک بەختیاری لای ئەم نێژراوانە و خەڵوەنشینانە دەدۆزێتەوە! ئایا هێشتاش دەبێ دوایین بەختیاری لە دوڕگەکانی بەختەوەری و دوورتر لەو، لە نێو دەریا لەبیر کراوەکان بدۆزمەوە؟

بەڵام هەموو شت وەک یەکە، هیچ شتێک بایەخی نیە. گەڕان بێهوێیە، ئیدی هیچ دوڕگەیەکی بەختەوەری لە ئارا دا نیە.»

پێشگۆ وەها ئاخی حەسرەتی هەڵکێشا. بەڵام دوای دوایین ئاخی ئەو، زەردەشت وەک کەسێک کە بە دالانێکی قوول دا تێپەڕیبێ و گەیشتبێتە رووناکایی، جارێکی دی رووناک و ئەرخەیان بۆوە و بە دەنگێکی بەقەو هاواری کرد: «نا! نا! دیسانیش نا!» و دەستێکی بە ردێنی دا هێنا. «من ئەوە باشتر دەزانم! دوڕگەکانی بەختەوەری هێشتا هەر هەن. تۆ لەوان مەدوێ، ئەی هەنبانەی غەمینی ئاخ هەڵکێش!

بەسە هێندە دڵۆپەی مەکە، ئەی هەوری بە بارانی بەیانی! نابینی کە من نووکە خوساو لەبەر مەینەتی تۆ، وەک سەگێکی ئاو پێداکراو لێرە وەستاوم؟

ئێستا خۆ رادەتڵەکێنم و لە بەرت رادەکەم هەتا دیسان ویشک بمەوە؛ تۆ نابێ ئەم کارەت پێ سەیر بێ! ئایا بێئەدەبم دەبینی؟ بەڵام ئەمە ئەدەبی منە.

بەڵام سەبارەت بەو مرۆڤە باڵاترەی تۆ: باشە! من دەستبەجێ لەو لێڕەوارانە دا بە دوای دا دەگەڕێم: لەوێوە بوو کە هاواری ئەو هات. لەوانەیە دڕندەیەک لەوێ شاڵاوی بۆ هێنابێ.

ئەو لە هەرێمی من دایە: لێرە نابێ زیانێک بەو بگا! بەڵام بە راستی، گەلێک دڕندەم لە دەورەن.»



زەردەشت دەگەڵ ئەم قسانە تەمای رۆیشتنی گرت. ئەوسا پێشگۆ گوتی: «تۆ چەندە دەغەڵی، زەردەشت!

من دەزانم: تۆ دەتەوێ خۆت لە کۆڵ من کەیەوە! وا باشترە راکەیە لێڕەواو و وە شوێن دڕندەکان کەوی.

بەڵام کەلکی ئەوە بۆ تۆ چیە! تۆ ئێواریێ دیسان دەگەڵ من بەرەوڕوو دەبیەوە. من سێبوور و قورس هەروەک کۆلکەدارێک لە ئەشکەوتەکەت دا چاوەڕێی تۆ دادەنیشم !»

زەردەشت هەروا کە دوور دەبۆوە بەرەو دواوە هاواری کرد: «بلا وابێ! ئەوەی کە لە ئەشکەوتەکەم دا هی منە، هی تۆشە، میوانی من.

لەوێ دەکرێ هەنگونیش بدۆزیەوە. ئادی، ئەگەر دۆزیتەوە، بیلێسەوە، ئەی ورچی پرخن، و رەوانی خۆتی پێ شیرین بکە! چونکە ئێواریێ هەر دووکمان دەبێ سەرخۆش بین.

سەرخۆش و شاد لە کۆتایی هاتنی ئەم رۆژە. و تۆ هەروەک ورچێکی سەماکەری من، بە سترانەکانم وە سەما دەکەوی.

باوەڕ ناکەی؟ سەر دەلەقێنی؟ زۆر باشە! زۆر باشە! ورچی پیر! بەڵام منیش پێشگۆم.»

وەهای گوت زەردەشت.

## گوتوبێژ دەگەڵ پاشاکان

### ١

زەردەشت هێشتا سەعاتێک لە کێو و لێڕەکانی خۆی دا رێی نەبڕیبوو کە لە نەکاو تووشی قافڵەیەکی سەیر هات. رێک بەو رێگایە دا کە ئەو دەیەویست پێیدا بچێتە خوار، دوو پاشا دەهاتن، بە تاج و پشتبەندی ئەرخەوانی، رازاوە و رەنگین

هەروەک قورینگ؛ ئەوان گوێدرێژێکی بارکراویان وەپێش خۆیان دابوو. زەردەشت بە سەرسوڕماوییەوە دە دڵی خۆی دا گوتی: «ئەم پاشایانە لە هەرێمی من دا چیان دەوێ؟» و گورج لە پشت چرپییەک خۆی شاردەوە. بەڵام کاتێک پاشاکان گەیشتنە نزیک ئەو، بە دەنگێکی نیوە بەرز، هەروەک بڵێی دەگەڵ خۆی قسە بکا، گوتی: «سەیرە! سەیرە! ئەوانە چ هاوسەنگییەکیان دەگەڵ یەک هەیە؟ دوو پاشا دەبینم ـ و تەنیا یەک گوێدرێژ!»

دوو پاشاکە وەستان و بزەیان هاتێ و روانییانە لایەک کە دەنگەکەی لێوە هاتبوو و لە دوایی روانییانە یەک. پاشای دەستی راست گوتی: «لەوانەیە یەکێک لە ئێمەش لەم بیرە دابێ، بەڵام دەرینابڕێ.»

بەڵام پاشای دەستی چەپ شانەکانی هەڵتەکاند و وڵامی داوە: «لەوانەیە بزنەوانێک یا دوورەپەرێزێک بێ کە درێژماوەیەک لە نێو رەوەز و دارەکان دا ژیاوە. چونکە بێهاودەمیش ئەخلاق خراپ دەکا.»

پاشاکەی دیکە قەڵس و تووڕە وڵامی داوە: «ئەخلاق؟ ئێمە لە چی رادەکەین؟ مەگەر لە «ئەخلاق» و لە «هاودەمە باشەکان»ی خۆمان نیە؟

بە راستی ژیان دە نێو دوورەپەرێزەکان و بزنەوانەکان دا خۆشترە لە ژیان دەگەڵ عەوامە زێڕکفتە درۆزنە رەنگینەکان ـ هەر چەند خۆ بە «خەڵکی باشتر»یش دابنێن.

هەر چەند خۆ بە «ئەشراف» ناو بەرن. لەوێ گشت شت درۆیین و گنخاوە، و لە هەموان پتر خوێن، لە بەرەکەتی ئاهۆ و درمە خراپەکان و حەکیمە خراپترەکان.

ئیمڕۆ باشترین و خۆشەویسترین کەس لای من گوندییەکی ساغی قەبەی گزیکاری کەللەڕەقی سێبوورە: ئیمڕۆ ئەم رەسەنترین رەگەزە.

ئیمڕۆ گوندیی باشترین رەگەزە و رەگەزی گوندیی دەبێ ببێتە ئەرباب! بەڵام لە هەرێمی حکوومەت دا عەوامن. من ئیدی فریو ناخۆم: مانای عەوام، بە هەر حاڵ، ئاژاوەیە.

لە ئاژاوەی عەوام دا هەموو شت دەگەڵ یەک تێکەڵاوە: پیرۆز و رەزیل، نەجیب و جوو، و هەر چەشنە چوارواییەکی کەشتی نووح.



ئەخلاق! لە نێو ئێمە دا گشت شت ناڕاست و گنخاوە. هیچ کەس ئیدی نازانێ چۆن دەبێ رێز دانێ. لەوەیە کە ئێمە رادکەین. ئەوان سەگەلی بە کلکەسووتەی خۆ رێکخەرن، ئەوان دەغەڵن.

ئەم بێزە ئەوکم دەگرێ کە ئێمە پاشاکانیش خۆمان ناڕاست بووین، لە جلی بە شکۆ و رازاوەی رەنگ پەڕیوی کۆنەی باب و باپیرەکانمان دا، رازاوە بە نیشانەگەلی بیرەوەری گەورەترین گەوجایەتی و گەورەترین دووڕوویی، خۆمان شاردۆتەوە و بۆ دەستەڵات بە دەستەوە گرتن خۆ لە هەر فێڵ و تەڵەکەیەک دەدەین.

ئێمە یەکەم نین ـ بەڵام دەبێ وەها بنوێنین؛ لەم فێڵ و تەڵەکانە وەڕەز بووین و بێزمان لێیان هەڵدەستێ.

ئێمە لە چنگ بوودەڵەکان رامانکردوە، لە دەست تەواوی ئەم هەتڵەبێژانە، ئەم مۆزە هەتڵەنووسانە، لە بۆگەنیوی کاسبکارەکان و لە هات و هەرای پلەخوازەکان، لە هەناسەی بۆگەن: هاوار لە ژیانی نێو بوودەڵەکان!

هاوار لە بە یەکەم نواندن لە نێو بوودەڵەکان دا! هاوار، بێز! بێز! بێز! نووکە ئێمە پاشاکان چ بایەخێکمان هەیە؟»

لێرە پاشای دەستی چەپ گوتی: «برای بەستەزمانی من، نەخۆشی کۆنەکەت دیسان شاڵاوی بۆ هێناویەوە، هێڵنجت دێتێ. بەڵام دەزانم کە کەسێک خەریکە گوێمان دەداتێ.»

زەردەشت، کە چاو و گوێی لەم قسەیە کردبۆوە، دەستبەجێ لە پەناگاکەی هەستا و بۆ لای پاشاکان چوو و دەستی پێکرد:

«ئەی پاشایان، ئەوەی کە گوێی لە ئێوە گرتوە، ئەوەی کە پێیخۆشە گوێتان بداتێ، ناوی زەردەشتە!

من زەردەشتم، هەر ئەوەی کە رۆژێک گوتی: نووکە ئیدی پاشاکان چ بایەخێکیان هەیە؟ لێم ببوورن. من شاد بووم لەوە کە ئێوە بە یەکدیتان گوت: نووکە ئێمە پاشایان چ بایەخێکمان هەیە؟

ئێرە، بە هەر حاڵ، هەرێمی من و پاشایەتی منە. ئێوە لە هەرێمی من دەتوانن

بە شوێن چیەوە بن؟ لەوانەیە ئێوە لە ڕێگای خۆتان دا ئەوەی کە **من** لێیدەگەڕێم، دیتبێتانەوە: مەبەستم مرۆڤی باڵاترە.»

پاشاکان بە بیستنی ئەم قسەیە لە سینگی خۆیان کوتا و یەکڕا گوتیان: ئێمە ناسراینەوە.

تۆ بە تیغی ئەم وشانە خەستترین تاریکایی دڵەکانمانت دادڕێ. تۆ لە نیازی ئێمە گەیشتی، چونکە بڕوانە! ئێمە بە شوێن دیتنەوەی مرۆڤی باڵاترەوەین ـ

مرۆڤێک کە لە ئێمە باڵاترە، هەر چەند ئێمە پاشاشین. ئێمە ئەم گوێدرێژەی بۆ لای ئەو لێدەخورین. چونکە مرۆڤی باڵاتر سەرۆکی زەوی دەبێ.

لە تەواوەتی چارەنووسی مرۆڤ دا چارەڕەشی لەو دەمە پتر نابێ کە دەستەڵاتدارەکانی زەوی ئیدی یەکەم نەبن. ئەودەم گشت شت ناڕاست و خوار و نائاسایی دەبێ.

تەنانەت ئەودەم کە ئەوان دەبنە دوایین کەسەکان و لە چوارووا نزیکترن هەتا لە مرۆڤ، نرخی عەوام دەچێتە سەر و سەرتر هەتا ئەو ڕادەیە کە ئاکارباشی دەبێتە عەوام: بڕوانە! تەنیا من ئاکارباشیم!»

زەردەشت وڵامی داوە: «چ دەبیسم! چ فرەزانیییەک لە پاشاکان دایە! شوێنی لە سەر دانام و بە ڕاستی، هەر ئێستا مەیلی دانانی شێعرێکم لەم بارەوە هەیە ـ

هەرچەند ئەم شێعرە شیاوی هەموو گوێیەک نەبێ. بەڵام من دەمێکە کە ئیدی لە بیرم کردوە سەرنج بدەمە گوێ درێژەکانم! زۆر باشە! دەست پێبکەین!

(بەڵام لێرە وا ڕێکەوت کە گوێدرێژیش وە قسە هات و ئاشکرا و بەدخوازانە گوتی: «ئا ـ ئا )

جارێک ـ پێموایە، لە یەکەم ساڵی ڕەحمەت

ژنی فاڵگر، مەست، بەڵام نە بە هۆی بادە، گوتی:

«هاوار، ئێستا تێکدەچێ!

ڕمان! ڕمان! دونیا قەت وەها نوقم نەبووو!

ڕۆم لە جندەیەتی و جندەخانە دا نوقم بوو.



قەیسەری ڕۆم بوو بە چوارووا و جوولەکە بوو بە سەرۆک!»

## ٢

پاشاکان لەم بەیتانەی زەردەشت چێژیان وەرگرت؛ بەڵام پاشای دەستی ڕاست گوتی: «ئەی زەردەشت، چ کارێکی باشمان کرد کە وەدەر کەوتین هەتا تۆ ببینین!

چونکە دوژمنەکانت وێنەی تۆیان لە ئاوێنەی خۆیان دا نیشانی ئێمە دابوو؛ لەو ئاوێنەیە دا تۆ بە بیچم و بزەی شەیتانێک دەدیترای، وەها کە ئێمە لێت دەترساین.

بەڵام چ کەلکی هەیە! تۆ هەر جارەی بە وتە هەڵبژادەکانت ڕێت دەبردە نێو گوێ و دڵمان. وەها کە لە ئاکام گوتمان: چ قەیدی هەیە کە سیمای ئەو چۆنە؟

ئێمە دەبێ گوێی لێڕابگرین، لەوەی کە فێر دەکا: «دەبێ ئاشتیت هەروەک کەرەسەی جەنگە تازەکان خۆش بوێ و ئاشتی کورت لە ئاشتی درێژخایەن پتر!»

هیچ کەس هەتا ئێستا وشەگەلێکی وەها شەڕکەرانەی نەگوتوە: «چاکە چیە؟ بوێر بوون چاکەیە. شەڕی چاکەیە کە هەر ئامانجێک پیرۆز دەکا.»

ئەی زەردەشت، بەم قسانە خوێنی باب و باپیرانمان لە لەشمان دا وەگەڕ دەکەوت؛ ئەوە وەک قسە کردنی بەهار دەگەڵ کوپە شەڕابە کۆنەکان دەچوو.

ئەودەم کە شمشیرەکان هەروەک مارە سوورە خاڵدارەکان تێک دەبەزین، باوکەکانمان گیرۆدەی ژیان دەبوون. هەتاوی ئاشتی بە گشتی لە چاوەکانیان دا نیوە گەرم و بێتین دیاری دەدا و هەر ئاشتییەکی درێژخایەن هۆی سەرشۆڕی بوو.

باوکەکانمان چ ئاخێکیان هەڵدەکێشا ئەودەم کە شمشیرە درەشاوە ویشکەنیان لە سەر دیوار دەدیت! ئەوانیش، هەر وەک ئەوان، تینووی جەنگ بوون. چونکە شمشێر خوێن خواردنەوەی دەوێ و لە تاسەی ئەو دا دەدرەوشێتەوە.»

کاتێک پاشاکان وەها بە تاسەوە لە بەختیاری باب و باپیرەکانیان دوان و

رستیان، زەردەشت مەیلی گاڵتە پێکردنی ئەوانی لەخۆ دا نەدیت: چونکە وا دیار بوو کە خۆی لە ئاست پاشاگەلێکی لەسەرەخۆ دا دەبینێ و بە سیماگەلێکی پیر و نەجیب. بەمجۆرە بەری خۆی گرت و گوتی:

«باشـە! رێ بەم لایە دایە؛ ئەشکەوتی زەردەشت لەوێیە؛ ئەم رۆژە شەوێکی درێژی بە دواوە دەبێ! بەڵام نووکە هاوارێکی هانا من ناچار دەکا بە پەلە لە لای ئێوە بڕۆم.

بۆ ئەشکەوتەکەم جێی شانازی دەبێ ئەگەر پاشاکان تێیدا دانیشن و چاوەڕێ بمێننەوە. بەڵام، بێشک دەبێ درێژماوەیەک چاوەڕێ بمێننەوە!

بەڵام بە راستی، چ گرینگایەتییەکی هەیە؟ ئیمڕۆ لە دەربارەکان باشتر لە کوێ دەکرێ فێرە چاوەڕوانی بی؟ مەگەر تەواوەتی ئاکارباشییەک کە ئیمڕۆ بۆ پاشاکان ماوەتەوە **تاقەتی چاوەڕوانی** پێناڵێن؟»

وەهای گوت زەردەشت.

## زەروو

زەردەشت، نوقمی خەیاڵ، دوورتر و قووڵتر بە نێو لێڕەوارەکان و بە پەنا زەلکاوەکان دا رۆیی؛ بەڵام هەر ئەوجۆرەی کە بۆ کەسێک کە چۆتە نێو بیری شتە دژوارەکانەوە روو دەدا، بێخەیاڵ پێی لە مرۆڤێک نا. بڕوانە! لەپڕ قیژەیەکی ژان و دوو لەعنەت و بیست جوێنی کرێت لە رووی کوتران. ئەو وەها حەپەسابوو کە وەکازەکەی هەڵێنا و لە پیاوی پێشێلکراوی راکێشا. بەڵام هەر ئەودەمە هاتەوە سەر خۆ و دە دڵ دا بە گەوجایەتییەک کە نووکە کردبووی، پێکەنی.

ئەو بە پیاوی پێشێلکراو کە بە تووڕەیی هەستابوو و دانیشتبوو، گوتی: «ببوورە، ببوورە، و بەر لە هەر شتێک لە پێشدا گوێ لە وێکچوونێک بگرە.

ئەوەی کە بە سەر ئێمە هات داستانی ئەو ئاوارەیە کە نوقمی خەیاڵی شتە دوورەدەستەکان، بێخەیاڵ لە رێگایەکی چۆل پێ لە سەگێکی خەوتوو دەنێ، سەگێک کە لە بەربەرۆچکە لێی وەرکەوتوە:

ـ هەر دووک رادەچەنن و وەک دوو دوژمنی گیانی، خۆ پێک دادەدەن، چونکە



هەردووک تووشی ترسێکی بە سام بوون:

سەرەڕای ئەمە و دیسان سەرەڕای ئەمە ـ هێندەی نەماوە کە ئەو دوانە یەکدی لە باوەش بگرن و یەکدی بلاوێننەوە، ئەم سەگە و ئەم پیاوە تەنیایە! چونکە، بە هەر حاڵ، هەر دووک تەنیان»

پیاوی پێشێلکراو کە هێشتا هەر تووڕە بوو، گوتی: «تۆ هەر کەسێک کە هەی نە تەنیا بە پێیەکانت بەڵکە بە وێچواندنەکەشت منت پێشێل کرد! ئاخر مەگەر من سەگم؟»

بەم قسەیە پیاوی دانیشتوو هەستا و دەستی رووتی لە گۆلاو دەرکێشا دەرەوە. چونکە لە پێشدا شاراوە و نەناسراوە وەک کەسێک کە لە بۆسەی گیانلەبەرێکی نێو زەلکاو دا بێ، لە سەر زەوی درێژ ببوو.

زەردەشت، حەپەساو، هاواری کرد: «ئەوە تۆ چ دەکەی؟» چونکە دیتی کە خوێنێکی زۆر لە باسکی رووتی دەڕژێ. «ئەی چارەڕەش، چت بە سەر هاتوە؟ ئایا گیاندارێکی زیاندار پێوەی داوی؟»

ئەو پیاوەی کە خوێن لە باسکی دەڕژا، زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی: «تۆ چ ئیشت بەمەیە!» و تەمای رۆیشتنی گرت: «من لێرە لە ماڵ و لە هەرێمی خۆمم. هەر کەس دەیەوێ لێم بپرسێ، بپرسێ: بەڵام وڵامی سەرشێتێک نادەمەوە!»

زەردەشت بە دڵسۆزییەوە ئەوی توند گرت و گوتی: «تۆ هەڵە دەکەی. تۆ لێرە لە ماڵی خۆت نی، لە هەرێمی منی و لێرە نابێ زیان بە کەس بگا.

بە هەر حاڵ، هەر چۆن پێت خۆشە من ناو بنێ ـ من هەر ئەوەم کە دەبێ ببم. من خۆم بە زەردەشت ناو دەبەم.

زۆر باشە! لەو سەرە رێگایەکە بۆ ئەشکەوتی زەردەشت؛ کە دوور نیە ـ ناتەوێ لای من بە برینەکانت رابگەی؟

ئەی چارەڕەش! لەم ژیانە دا خراپت لێگوزەراوە. لە پێشدا گیاندار بە تۆوە دەدا و لە دوایی مرۆڤ تۆ پێشێل دەکا.»

پیاوی پێشێلکراو هەر کە ناوی زەردەشتی بیست، تێکچوو و هاواری کرد:

«چۆنم لێدەگوزەرێ؟ لەم ژیانە دا چ کەسێکی دی جگە لەم مرۆڤە، یانی زەردەشت و جگە لەم گیاندارە کە بە خوێن دەژی، ئەو زەرووییە، مێشکی منیان بە خۆیانەوە خەریک کردوە!

من لەبەر زەروو لێرە لە دەم زەلکاو، وەک ماسیگرێک درێژ ببووم و دەستی درێژ کراوم هەتا ئێستا دە جار گەزترابوو کە زەرووییەکی جوانتر، یانی زەردەشت، بە تەمای خوێن منی گەزت.

چ بەختەوەرییەک! چ موعجزەیەک! سپاس بۆ ئەم رۆژە کە منی بەرەو ئەم زەلکاوە کێشا! بژی باشترین، زیندووترین خوێنمژی رۆژگار، بژی زەرووی گەورەی ویژدان، زەردەشت!»

وەهای گوت پیاوی پێشێلکراو، و زەردەشت قسەکان و دەم و راوێژی بەرز و بە ئەدەبانەی ئەوی پێخۆش بوو. زەردەشت دەستی بۆ لا درێژ کرد و پرسی: «تۆ کێی؟ لە نێوان ئێمە دا گەلێک شت هەن کە دەبێ بکرێنەوە و روون بنەوە، بەڵام نووکە وام لێ دیارە کە گەلێک شت وەک رۆژ روون بوونەوە.»

پرسیارلێکراو گوتی: «**من خاوەن گیانێکی بە ویژدانم** و لە کار و باری مەعنەوی دا لەوانەیە کەمتر کەسێک بە زیپکتر، وردبینتر و سەختگرتر لە من بێ، جگە لەو کەسەی کە لێی فێر بووم، یانی خودی زەردەشت، [کە دەڵێ:]

«هیچ نەزانین باشترە لە نیوە زانینی زۆر! لای خۆ شێت بوون باشترە لە فرەزان بوون لە بەر چاوی خەڵک!» من ـ لە بنج و بناوەکان دەکۆڵمەوە:

چ تۆفیری هەیە کە گەورەیە یا بچووکە؟ زەلکاوی پێدەگوترێ یا ئاسمان؟ بستێک زەوی بۆ من بەسە، بەو شەرتەی کە بە راستی زەوی و بناغەیەکی هەبێ!

بستە زەوییەک کە بکرێ لە سەری بوەستی. بۆ ویژدانی راستەقینەی زانست گەورە و بچووک لە کار دا نیە.»

زەردەشت پرسی: «کەوایە نەکا تۆ زەرووناس بی؟ پیاوی بە ویژدان، ئایا تۆ لە بنج و بناوانی زەروو دەکۆڵییەوە؟»

پیاوی پێشێلکراو وڵامی داوە: «زەردەشت ئەمە کارێکی پڕ مەترسییە؛ من چلۆن دەتوانم دەرۆستی بێم!



ئەوەی کە من تێیدا مامۆستا و کارامەم، مێشکی زەرووییە: دونیای **من** ئەوە!

بە راستی کە بۆ خۆی دونیایەکە! من ببوورە لەوە کە غرورم وە زمان هاتوە، چونکە من لەم بارەوە هاوتایەکم نیە. لەبەر ئەوە بوو کە گوتم، ئێرە ماڵی منە.

چەندە بە شوێن ئەوەوە بووم، ئەو مێشکەی زەروو، هەتا ئەم راستەقینە راکەرە دیسان لێرە لە دەستم رانەکا! ئێرە هەرێمی **منە**!

من لەبەر ئەو لە گشت شتێک وازم هێناوە، لەبەر ئەو گشت شتی دیکەم لا بێنرخ بوون؛ لە پەنا زانستم نەزانینی رەشم پاڵی داوەتەوە.

ویژدانی گیانی من وەهای لە من دەوێ کە من تەنیا یەک شت بزانم و جگە لەو هیچ؛ بێزارم لە گشت نیوەکارکەرەکان لە کاری گیان دا، لە گشت مژاوییەکان، نائاشکراکان، نە حەجماوەکان.

لەو جێیەی کە رووڕاستیم کۆتایی بێ کوێر دەبم و دەمەوێ کە کوێر بم. بەڵام لەو جێیەی کە داخوازی زانین بم دەمەوێ کە رووڕاست بم ـ یانی سەختگر، بە زیپک، وردبین، دڵڕەق و لێخۆش نەبوو.

زەردەشت، ئەوە کە رۆژێک تۆ گوتت: «گیان هەر ئەو ژیانەیە کە خۆی رێ دەباتە نێو ژیانەوە» ئەو ئامۆتەی تۆ بۆ من بوو بە رێباز و رێبەر و بە راستی، من بە خوێنی خۆم لە زانستی خۆم زیاد کرد!»

زەردەشت قسەکەی بڕی و گوتی، «هەر ئەوجۆرەی کە بە رواڵەت دیارە»، چونکە لە باسکی رووتی پیاوی بە ویژدان، هەروا خوێن دەچۆڕاوە، چونکە دە زەروو زۆر پیس گەزتبوویان.

ئەی دۆستی سەیر، لەم رواڵەتەی تۆ چ شتگەلێک فێر دەبم، مەبەستم خودی تۆیە! پێموایە کە نەدەبا هەموو شتێکم دە گوێ سەختگرەکانی تۆ کردبا.

بە هەر حاڵ، لێرە لێک جیا دەبینەوە. بەڵام پێمخۆشە کە دیسان تۆ ببینمەوە. لەو سەرە رێگایەکە بۆ ئەشکەوتی من: ئێمشەو لەوێ میوانی ئازیزی من دەبی!

سەبارەت بە لەشیشت، پێمخۆشە قەرەبووی ئەوە بکەمەوە کە زەردەشت پێی لێنا: لەو بارەوە بیرێک دەکەمەوە. بەڵام نووکە هاوارێکی هانا بە پەلە من لە لای تۆوە بانگ دەکا.»

وەهای گوت زەردەشت.

## جادووگەر

### ١

بەڵام کاتێک زەردەشت بۆ پشت ڕەوەزێک بای داوە، نە هێندە دوورتر، هەر لەو ڕێگایە پیاوێکی دیت کە دیناسا دەست و پێی ڕادەوەشاندن و لە ئاکام دەمەوڕوو بە زەوی داکەوت. زەردەشت بە دڵی خۆی گوت: بوەستە! ئەمە دەبێ هەر ئەو مرۆڤی باڵاترە بێ؛ ئەو هاواری بە سامی هانایە لە گەرووی ئەو هاتۆتە دەر ـ بەشکەم بکرێ یارمەتی بدەم. بەڵام کاتێک بۆ ئەو شوێنەی کە پیاو کەوتبوو هەلینگی دا، پیرەمێرێکی لەرزۆکی بە چاوگەلێکی زەق چاو پێکەوت. زەردەشت هەرچییەکی کرد هەتا ئەو هەستێنێتەوە و لە سەر پێ ڕایگرێ، بۆی نەلوا. هەروەها وا دیاری نەدەدا کە ئەو چارەڕەشە تێبگا کە کەسێک لە پەنایەتی، بەڵکە هەروەک کەسێک کە تەواوی دونیا ئەوی وەلانابێ و بە تەنیای هێشتبێتەوە جم و جووڵێکی بە بەزەییانەی دەکرد.

بەڵام لە ئاکام، دوای لەرز و پێچ و خولێکی زۆر وەها ناڵەی خۆی دەست پێکرد:

ئیدی کێ گەرمم دەکاتەوە، کێ منی خۆش دەوێ؟
دەستگەلێکی گەرمم بدەیە!
کوانووی دڵم بدەیە!
وەرکەوتوو، لەرزۆک،



وەک نیوەگیانێک کە کەسێک پێیەکانی گەرم دەکاتەوە ـ
لە چەقوچۆ دا، ئاخ! لەبەر یاوێکی نەناسراو،
هەڵلەرزاو لەبەر تیرە سارده تیژەکانی سەهۆڵ
نێچیری تۆ، ئەی بڕوا!
ئەی ناو وەخۆنەگر! ئەی شاراوە! ئەی بە سام
ئەی ڕاوکەری پشت هەورەکان!
داکەوتوو بە تیری برووسکی تۆ،
تۆ، ئەی چاو هەڵخەڵەتێنەر کە لە جەرگەی تاریکیەوە دەڕوانیە من:
من وەها کەوتووم
لە پێچ و خول دا، لە ڕەنج و ئەشکەنجە، لە عەزاب دا
لە گشت ئەشکەنجەکانی ئەبەدی دا.
پێکراو
بە دەست تۆ، ئەی ڕاوکەری دڵڕەق.
تۆ، ئەی نەناسراو ـ خودا!

قووڵتری لێدە!
دیسان لێیدەوە!
تێیچەقێنە، بیشکێنە ئەم دڵەی!
ئەم ئەشکەنجەیە
بە تیرە کولەکانی کەوان بۆچی؟
بۆچ دیسان دەڕوانی
بێماندوویەتی لە ڕەنجی مرۆڤ
بە چاوەکانی برووسکاسای خودایی خۆشحاڵ لە عەزاب دان؟

تۆ کوشتنت ناوێ.
تەنیا ئەشکەنجە، ئەشکەنجەت دەوێ؟
بۆچ **من** ئەشکەنجە دەکەی،
ئەی خۆشحاڵ لە عەزاب، ئەی خودای نەناسراو؟

هەها!
بۆ نزیک دەخزی؟
لە وەها نیوە شەوێک دا ـ
چت دەوێ؟
بێژە!
دەورەم دەدەی، رێکم دەکوشی ـ
ئەها! نزیک مەبەوە!
تۆ هەناسەم دەبیسی،
تۆ گوێ لە دڵم دەگری.
تۆ ئەی ئێرەیی بەر.
ئێرەیی بە چی؟
دوور! دوور! پەیژە بۆچی؟
دەتەوێ بچیە نێو دڵەوە؟
بۆ نێو شاراوەترین بیرەکانم؟
ئەی بێشەرم! ئەی نەناسراو ـ دز!
دەتەوێ چ بدزی؟
دەتەوێ چ ببیسی؟
بۆچ ئەشکەنجە دەکەی؟



ئەی ئەشکەنجەگەر
تۆ ـ ئەی خودای جەلاد!
یا دەبێ وەک سەگ
لە بەرت بگەوزێم؟
ئەمەگدار، لە خۆشیان
کلکەسووتەی خۆشەویستیت بۆ بکەم؟

بە خۆڕایی!
پتری تێڕاکە.
ئەی زاڵمترین دڕک!
نا، سەگ نا ـ تەنیا نێچیری تۆ منم
ئەی دڵڕەقترین راوکەر!
باییترین دیلی تۆم،
تۆ ئەی دزی پشت هەورەکان!
ئاخر، قسەیەک بکە!
چت لە من دەوێ، ئەی لە بۆسە دا؟
ئەی شاراوە لە برووسک دا! ئەی نەناسیاو! بڵێ!
چت دەوێ، ئەی نەناسیاو خودا؟

چی؟ تاوان؟
تاوان بۆچی؟
زۆرت بوێ! غروورم وەهای دەوێ.
قسەت کورت کەوە! غرووری دیکەم وەهای دەوێ.

هەها!

منت ـ دەوێ؟ من؟

من ـ سەرتاپێ؟

هەها!

ئەو شێتەی کە تۆی، من ئازار دەدا،

غرووری من ئازار دەدا؟

ئەوینم دەیە ـ ئیدی کێ من گەرم دەکاتەوە؟

ئیدی کێ منی خۆش دەوێ؟

دەستگەلێکی گەرمم بدەیە،

کوانووی دڵم بدەیە!

بیدە بە من، بە تەنیاترین کەس

وەک سەهۆڵ، ئاخ! سەهۆڵی حەوت توێ

کە تینووی دوژمن بوون بەو فێر دەکا

تینووی دوژمن

بدە، ئادی، بۆم دانێ.

ئەی زاڵمترین دوژمن!

بۆمن ـ **بۆ تۆ**

دوور!

ئەو خۆی رایکرد، کە

تەنیا هاودەم



دوژمنی گەورەم،

نەناسراوەکەم،

خودا جەلادەکەم، بوو!

ـ نا!

بگەڕێوە!

بە تەواوی ئەشکەنجەکانتەوە!

بۆ لای ئاخرینی گشت تەنیاکان.

ئاخ، بگەڕێوە!

گشت ئەسرینم بۆ لای تۆ دەڕژێن؛

و دوایین بڵێسەی دڵم ـ

بۆ تۆ گڕ دەگرێ!

ئاخ بگەڕێوە،

خودا نەناسراوەکەم! دڕەدەکەم!

دوایین بەختەوەرییم!

## ٢

بەڵام لێرە دا ئیدی زەردەشت لەوە پتر بەری خۆی پێڕانەگیرا و وەکازەکەی هەڵگرت و بە هەموو هێز و دەمای خۆی لەو ناڵەکەرەی راکێشا و بە پێکەنینەوە بە سەری دا قیژاندی: «بەسە، بەسە، ئەی دەورگێڕ! ئەی فێڵەزان! ئەی سەراپێ درۆ! من تۆ باش دەناسم!

دەمەوێ پێیەکانت دامالم، ئەی جادووگەری چەپەڵ. باش دەزانم کە وەک تۆیەک چلۆن دابماڵم!»

پیرەمێرد گوتی: «دەست ڕاگرە، ئیدی لێم مەدە، زەردەشت! ئەو تەنیا کایەیەک بوو.» و لە جێ ڕاپەڕی.

«ئەمە یەکێک لە هونەرەکانی منە. مەبەستم لەم کایەیە تاقی کردنەوەی تۆ بوو. بە ڕاستی، تۆ باش تێمگەیشتی!

بەڵام تۆش هیچ وێنەیەکت لە خۆت نەداوە بە من: تۆ **سەختی**، تۆ زەردەشتی زانا! تۆ بە «ڕاستەقینەکانت» زۆر سەخت دەوەشێنی: بەڵام گۆپاڵەکەت ئەم ڕاستەقینەیەم لێدەتارێنێ!»

زەردەشت کە هەروا تووڕە و مۆن بوو گوتی: «زمانلووسی مەکە! ئەی سەراپێ دەورگێڕ! تۆ درۆی؛ لە ڕاستەقینە چ دەدوێی!

ئەی تاوسی تاوسەکان، ئەی دەریای خۆخوازی، لە پێش من چ دەورێکت دەگێڕا، ئەی جادووگەری چەپەڵ؟ بەو ناڵەیەی کە دەرتدەبڕی دەبا ئیمانم بە کێ هێنابا؟

پیرەمێرد گوتی: «من دەوری ئەو کەسەم دەگێڕا کە «**گیانی تۆبەکاری**» هەیە ـ تۆ خۆت ئەم ڕاوێژەت زەمانێک ساز کرد.

ـ دەوری شاعیر و جادووگەرێک کە گیانی لە ئاکام دەبێتە دوژمنی خۆی، شێواوێک کە لە بەدزانی و بەدویژدانی خۆی دەژاکێ.

تۆش، ئەی زەردەشت، ئەوە بدرکێنە کە ماوەیەکی زۆری کێشا هەتا بە فێڵ و تەڵەکەی منت زانی! تۆ ئەو کاتەی کە سەری منت دە نێو دەستەکانت گرت، **باوەڕت** بە بێدەرەتانیم هێنا ـ

بیستم کە ناڵاندت: «ئەو زۆر کەم مەحەبەتی پێکراوە، زۆر کەمی پێکراوە.» لەوە کە هەتا ئەم ڕادەیە تۆم فریو داوە، چەپەڵایەتییم لە دەروونم دا شادی دەکرد.»

زەردەشت بە گوڕ گوتی: «تۆ لەوانەیە گەلێک پیاوی لە من زیرەکتر هەڵفریواندبێ. من لە ئاست خاپێنەران دا ئاگام لە خۆ نابێ، من **دەبێ** وریا نەبم: چارەنووسم وەهای دەوێ.

بەڵام تۆ دەبێ **فریو** بدەی: هەتا ئەم ڕادەیە تۆ دەناسم. تۆ هەمیشە دەبێ دوو،



سێ، چوار و پێنج لایەنە بی! ئەوەش کە نووکە هێناتە سەر زمانیش بۆ من نە هێندە ڕاست بوو و نە درۆ.

ئەی خاپێنەری چەپەڵ، لەوە پتر چت پێدەکرا! تۆ تەنانەت ئەو کاتەش کە خۆ بە رووتی نیشانی حەکیم دەدەی، نەخۆشییەکەت دەرازێنیەوە.

تۆ تەنانەت بۆ منیش درۆکەت ڕازاندەوە، ئەودەم کە گوتت: «من تەنیا دەورم گێڕابوو!» بەڵام لەو دەورگێڕانە دا **ڕاستییش** هەبوو: تۆ شتێکی لە گیانێکی تۆبەکار!

من باش پەیم بە زاتت بردوە: تۆ هەمووویانت جادوو کردوە، بەڵام درۆ و دەلەسەیەکت پتر بۆ نەماوە هەتا بە دژی خۆت دە کاری بێنی: جادووکەت ئیدی کار لە تۆ نەکا.

تەنیا ڕاستەقینەیەک کە تۆ لە دەروونی خۆت دا گردەکۆت کردوە هەر ئەو بێزەیە. هیچ کام لە قسەکانت ڕەسەن نین، جگە لە زارت، یانی بێزێک کە بە زارتەوە نووساوە.»

لێرە جادووگەری پیر بە دەنگێکی هەڕەشەکەرانەوە گوتی: «تۆ کێی! کێ دەوێرێ دەگەڵ **من**، مەزنترین کەسێک کە ئیمڕۆ دەژی، ئاوا قسە بکا؟» و لە چاوەکانیەوە زیتەیەکی کەسک لە زەردەشتی دا. بەڵام دوای ئەمە دەستبەجێ شێواو و غەمین گوتی:

«زەردەشت، من لەوە وەزاڵە هاتووم؛ هونەرەکانم دڵم دەخەیڵەوە دەبەن. من مەزن نیم ـ بۆ وا خۆ بنوێنم؟ بەڵام تۆ باش دەزانی کە من بە شوێن مەزنایەتییەوە بووم!

من دەمەویست خۆم بە مەزن نیشان بدەم و گەلێکیشم هەڵفریواندوون: بەڵام ئەم درۆیە لە توانای من بەدەرە و هەر ئەمەیە کە من تێک دەشکێنێ.

زەردەشت گشت شتێک لە من دا درۆیە؛ بەڵام ئەوە کە تێک دەشکێم ـ ئەم تێک شکانە ڕاستە!»

زەردەشت نارەحەت و سەرداخراو گوتی: «ئەمە شەرەفێکە بۆ تۆ، شەرەفێک کە بە شوێن مەزنایەتییەوە بووی، بەڵام ئەمە هەروەتر ڕازی تۆ ئاشکرا دەکا، کە

تۆ مەزن نی.

ئەی جادووگەری پیری خراپ، باشترین و شەریفترین شتێک کە من لە تۆ دا ڕێزی لێدەنێم ئەمەیە کە تۆ لە خۆت وەزاڵە هاتووی و وە زمان هاتووی کە: «من مەزن نیم.»

لەبەر ئەمە، وەک گیانێکی تۆبەکار من ڕێز لە تۆ دەگرم؛ تۆ بۆ یەک ئان و یەک دەمیش کە بوە، لەم یەک دەمە دا، ڕاستوێژ بووی.

بەڵام پێم بڵێ، لێرە لە نێو لێڕەوار و ڕەوەزەکانی من لە چی دەگەڕێی؟ بە خۆ بەردانەوە لە سەر ڕێگای من چ تاقی کردنەوەیەک لە من دەویست؟

بۆ چ شتێک دەتەویست من تاقی بکەی؟»

وەهای گوت زەردەشت و چاوی زیتەیەکی لێهات. جادووگەری پیر ماوەیەک بێدەنگ ماوە و ئەوسا گوتی: «ئایا من تۆم تاقی کردەوە؟ من ـ تەنیا دەگەڕێم.

ئەی زەردەشت، من لەو کەسە دەگەڕێم کە ڕووڕاستە و بە هەق و ساویلکە و یەکڕوویە، مرۆڤێک خاوەنی گشت شەڕەفەکان، مەکینەیەکی فرەزانی، پیرۆزێکی زانا، مرۆڤێکی مەزن!

نازانی، زەردەشت؟ **من لە زەردەشت دەگەڕێم**.»

لێرە دا بێدەنگییەکی درێژ لە نێو ئەم دوانە دا سەری هەڵدا. بەڵام زەردەشت وەها دە خۆی دابوو کە چاوەکانی وێک نابوون. بەڵام دوای ئەوە ڕووی لە هاوقسەکەی کرد و دەستی جادووگەری گرت و بە ئەدەب و مەکرێکی زۆرەوە گوتی:

«زۆر باشە! ئەو سەرە ڕێگایەکی بۆ ئەشکەوتی زەردەشت لێیە. لەو ئەشکەوتە دا دەتوانی لە کەسێک بگەڕێی کە ئاواتی دیتنەوەیت هەیە.

مشوور لە گیاندارەکانم بخوازە، لە هەڵۆ و مارەکەم: ئەوان بۆ دیتنەوەی یاریدەت دەدەن. ئەشکەوتی من گەورەیە.

من خۆم، بە ڕاستی، هەتا ئێستا هیچ پیاوێکی مەزنم نەدیوە. بۆ ئەوەی کە مەزنە، ئیمڕۆ تەنانەت چاوی ژیرترین کەسەکانیش کەم سۆمایە. ئیمڕۆ ڕۆژی پاشایەتی عەوامە.



گەلێکم دیون کە خۆیان لەبەر یەک کێشاوەتەوە و بایان دە خۆیان کردوە، و خەڵک هاواریان کردوە: «ئەوەتا، پیاوێکی مەزن!» بەڵام ئەم یەک دەمە چ کەلکی هەیە! لە ئاکام بایەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

بۆقێک کە ماوەیەک با دە خۆی بکا لە ئاکام دەتەقێ و بایەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. دەرزی لە زگی هەڵمساو کوتان خۆ خافڵاندنێکی باشە. گوێ بگرن، کوڕینە!

ئیمڕۆ هی عەوامە: کێ هەتا ئێستا زانیویەتی کە مەزن و بچووک چیە؟ کێ لە دیتنەوەی مەزنایەتی دا بەختیار بوە؟ تەنیا شێتێک: شێتەکان بە بەختن!

ئایا تۆ لە پیاوە مەزنەکان دەگەڕێی، تۆ شێتی سەیر و سەمەرە؟ کێ ئەمەی فێر کردووی؟ ئایا ئیمڕۆ کاتی وەها ئیشێکە؟ ئەی گەڕیدەی خراپ. بۆچی ـ من تاقی دەکەیەوە؟

وەهای گوت زەردەشت و بە دڵێکی ئاسوودە، بە پێکەنین ڕێی خۆی گرتە بەر.

## لەسەر خزمەت نەماو

بەڵام زەردەشت نە هێندە دوای خۆ ڕزگار کردن لە چنگی جادووگەر دیسان دیتی کە کەسێک لە سەر ئەو ڕێگایەی کە پێی دا دەڕۆیشت، دانیشتوە: پیاوێکی ڕەشپۆشی باڵابەرز بە ڕوخسارێکی بزرکاو و تێکشاو کە ئەمەی زۆر لە دڵ گران هات. بە دڵی خۆی گوت: «مخابن! مەینەت بە دەمامکەوە لەوێ دانیشتوە. پێم وایە لە بنەماڵەی قەشەکانە: **ئەوان** لە هەرێمی من چیان دەوێ؟

سەیرە هێشتا لە چنگ ئەو جادووگەرە ڕزگاریم نەهاتوە دیسان دەبێ جادووگەرێکی دیکە لە سەر ڕێم شین بێتەوە!

سێحربازێک کە بە دەست سێحر دەکا، موعجزەگەرێکی بە ڕاز و ڕەمز کە بە ڕەحمەتی خودا موعجزە دەکا، چەورکراوێکی بەدوێژی جیهان، کە شەیتان بیباتەوە!

بەڵام شەیتان هەمیشە لەو جێیەی کە دەبێ ببێ نیە: ئەم گوڕنی بە لەعنەت کراوە شەلە، هەمیشە زۆر درەنگ دەگاتێ!»

زەردەشت وەها لەعنەتی لە دڵی بێئۆقرەی دەکرد و لەم بیرە دابوو کە چلۆن روو وەربگێڕێ و بە پەنا ئەو پیاوە رەشە دا بخزێ: بەڵام، بڕوانە کە جۆرێکی دیکانە رێکەوت. چونکە هەر ئەودەم پیاوی دانیشتوو ئەوی دیت و وەک کەسێک کە لەپڕ بەخت رووی تێکردبێ، راپەڕی و بۆ لای زەردەشت چوو.

«ئەی رێبوار، هەر کەسێک کە هەی، یارمەتی رێ بزرکراوێک، پشکێنەرێک، پیرەمێردێک بدە کە لەوانەیە لێرە زیانێکی پێبگا!

دونیای ئێرە بۆ من نامۆ و دوورکەوتەیە و من لوورەی دڕندەکانم لێبیستوە و ئەوەی کە خۆی دەیتوانی پەنام بدا، ئیدی نەماوە.

من لە دوایین مرۆڤی زاهید دەگەڕام، پیرۆز و دوورەپەرێزێک کە لە لێڕەوارەکەی دا تەنیایە و ئەوەی کە ئیمڕۆ گشت عالەم دەیزانن، هێشتا نەیبیستوە.»

زەردەشت پرسی: «گشت عالەم ئیمڕۆ چ دەزانن؟ لەوانەیە ئەمە بێ کە خودایەکی پیر کە سەردەمایەک گشت عالەم ئیمانیان پێیهەبوو ئیدی نەماوە؟»

پیرەمێرد، غەمین گوتی: «وایە. من هەتا دوایین سەعات خزمەتی ئەم خودایەم کرد.

بەڵام نووکە لە سەر خزمەت نەماوم، بێ خودا ماومەوە و سەرەڕای ئەوانە ئازاد نیم و ئیدی سەعاتێک شاد نیم، جگە لە بیرەوەرییەکانم نەبێ.

لەبەر ئەوە بوو کە رووم لەو کێوانە کرد هەتا لە ئاکام جارێکی دی جەژنێک بۆ خۆم ساز بکەم، جەژنێکی شیاوی پاپێکی پیر و باوکی کلیسا: ئەوە بزانە کە من دوایین پاپم! ـ جەژنێک لە بیرەوەرییەکانی دینداریی و پەرستنی خودا.

بەڵام نووکە ئەو خۆی مردوە، ئەو مرۆڤە هەرە زاهیدە، ئەو پیرە پیرۆزەی لێڕەوارنشین، کە هەمیشە بە ستران و ورتە خودای خۆی عیبادەت دەکرد.

کاتێک کۆختەکەیم دیتەوە، خۆیم نەدیتەوە، بەڵام لەو کۆختە دا دوو گورگ لە پرسەی ئەو دا دەیانلووراند ـ چونکە هەموو گیاندارەکان ئەویان خۆش دەویست. ئەوسا رامکرد.

ئایا من لە خۆوە هاتبوومە ئەم لێڕ و کێوانە؟



ئەوسا دڵم تەمای گرت کە لە کەسێکی دیکە بگەڕێم، لە زاهیدترین پیاوی نێو تەواوی ئەوانەی کە ئیمانیان بە خودا نیە بگەڕێم ـ یانی لە، زەردەشت!»

وەهای گوت پیرەمێرد و بە نیگایەکی تیژ روانیە پیاوێک کە لە بەرابەری وێستابوو؛ بەڵام زەردەشت دەستی پاپی پیری گرت و ماوەیەکی دوورودرێژ بە رێزەوە چاوی تێبڕی.

ئەوسا گوتی: «بڕوانە، پیاوی هێژا! چ دەستگەلێکی شووش و جوان! ئەمە دەستی کەسێکە کە هەمیشە دوعای خێری بڵاو کردۆتەوە. بەڵام نووکە کەسێک ئەوی بە دەستەوە گرتوە کە تۆ لێی دەگەڕێی. منم زەردەشت.

ئەوە منم، زەردەشتی بێخودا، هەر ئەوەی کە دەڵێ: لە من بێخوداتر لە کوێیە هەتا لە ئامۆتەکانی رازی بم؟»

وەهای گوت زەردەشت و بە نیگا پەی بە بیرەکان و بیرە شاراوەکانی پاپی پیر برد. لە ئاکام پاپ گوتی:

«ئەوەی کە پتر لە هەموان ئەوی خۆش دەویست و ئەوی هەبوو، نووکە لە هەموان پتر ئەوی لە کیس داوە:

بڕوانە، ئایا لە نێوان ئێمە دوو کەس دا، نووکە من بێخوداتر نیم؟ بەڵام کێ دەتوانێ لەمە رازی بێ؟»

دوای بێدەنگییەکی قووڵ، زەردەشت بە تێڕامانەوە گوتی: «تۆ هەتا سەر خزمەتی ئەوت کرد. تۆ دەزانی ئەو چلۆن مرد؟ ئایا ئەوە راستە کە دەڵێن بەزەیی ئەوی خنکاند؟ ئەوە کە دیتی **مرۆڤ** چلۆن لە سەر خاچ هەڵواسراوە و تاقەتی ئەمەی نەهێنا، کە ئەوینی مرۆڤ ببوو بە دۆزەخی ئەو و لە ئاکام بوو بە هۆی مەرگی؟»

پاپی پیر وڵامێکی نەداوە، بەڵکە شەرمەزار و بە سیمایەکی دەردەدار و تێکچڕژاو رووی وەرگێڕا.

زەردەشت دوای بیر کردنەوەیەکی درێژ، کە لەم نێوە دا هەروا چاوی لە چاوەکانی پیرەمێرد بڕیبوو، گوتی: «با بڕوا!

با بڕوا! ئەو مردوە. هەر چەند کە ئەمە بۆ تۆ شەڕەفێکە کە لە پشت سەری

ئەم مردوویە جگە لە چاکەی نادوێی؛ سەرەڕای ئەمە تۆش وەک من باش دەزانی کە ئەو کێ بوو؛ دەزانی کە بە چ ڕێگاگەلێکی سەیر دا دەڕۆیشت.»

پاپی پیر بە خۆشییەوە گوتی، «لە نێو سێ چاوەکانی خۆمان دا بمێنێتەوە (چونکە یەکێک لە چاوەکانی کوێر بوو) کە لە کاروباری خودایی دا من لە زەردەشت شارەزاترم و نابێ لەوە بەدەریش بێ.

ئەوینی من سالانێکی درێژ خزمەتکاری ئەو بوو، ویستی من یەکسەر لە ژێر ویستی ئەو دابوو. بەڵام خزمەتکارێکی باش هەموو شتێک دەزانێ، تەنانەت گەلێک شت کە ئەرباب لە خۆشی دەشارێتەوە.

ئەو خودایەکی پڕ لە رەمز و راز بوو و شتی دەشاردەوە و لە راستی دا، ئەو بە نهێنی کوڕێکیشی بوو. زینا لە بەر دەرگای ئیمانی ئەو وەستاوە.

ئەو کەسەی کە ئەو بە ناوی خودای ئەوین، بپەرستێ بڕوای لەمەڕ ئەوین هێندە بەرز نیە. مەگەر ئەم خودایە نەیدەویست کە ببێتە قازییش؟ بەڵام ئەویندار لەوپەڕی پاداش و سزا دا، ئەوینی خۆی دەردەبڕێ.

ئەم خودا رۆژهەڵاتییە، ئەودەم کە لاو بوو سەختگیر و رق ئەستوور بوو و بۆ تۆڵە ستاندنەوە دۆزەخێکی ساز کرد.

بەڵام لە ئاکام، پیر و نەرم و سێبوور و دڵسۆز بوو و پتر لە باپیرەیەک دەچوو هەتا لە باوکێک و لە هەموان پتر لە دایەگەورێکی پیر و لەرزۆک.

ئەوسا داتەپیو لە پەنا سۆبە دانیشت، بێتاقەت لەبەر ناسازی لاقی، ماندوو لە جیهان، شەکەت لە ویستن و رۆژێک لەبەر بەزەیی لە رادە بەدەری خۆی خنکا.

لەم نێوە دا زەردەشت گوتی، «پاپی پیر، تۆ **ئەمەت** بە چاوی خۆت دیت؟ بێشک، دەبێ وەها بووبێ ـ وەها و هەروەتر بە جۆری دیکەش. خوداکان هەمیشە بە مەرگی جۆراوجۆر دەمرن.

بەڵام بە هەر حاڵ، وابووبێ یان نا، هەرچۆنێکی بێ ـ ئەو مردوە! ئەو بە پێچەوانەی زەوقی چاو و گوێی من بوو، بەڵام لە پشت سەری ئەو لەمە پتر ناڵێم.

خۆشم دەوێن گشت ئەوانەی کە روون دەڕوانن و ڕووڕاست قسە دەکەن. بەڵام ئەو ـ ئەی قەشەی پیر، تۆ دەزانی کە شتێک لە رەگەزی تۆی تێدابوو، لە رەگەزی



قەشە: ئەو چەند لایەنە بوو.

قسەکانیشی نائاشکرا بوون. ئەم غەزەبە بە گوڕەگوڕە چەندە تووڕە دەبوو، چونکە ئێمە باش لە مەبەستی نەدەگەیشتین. بەڵام بۆچی ئەو سەرڕاستر قسەی نەدەکرد؟

ئەگەر سووچی گوێیەکانی ئێمە بوو، بۆچ وەها گوێگەلێکی داببووینێ کە ئەویان خراپ دەبیست؟ ئەگەر قوڕیان لە گوێچکەکانمان کردبوو، کێ قوڕی تێکردبوو؟

ئەو هەڵەی زۆر بوو، ئەم گۆزەکەرە ناشارەزایە. بەڵام ئەمە کە ئەو تۆڵەی لە گۆزەکانی دەستاندەوە لەبەر ئەوە کە گۆزە و ئافراوەکانی خراپ لە کار هاتوونە دەر ـ ئەمە ئیدی گوناهێک بە دژی خۆشزەوقی بوو.

لە خوداپەرستیش دا خۆشزەوقی هەیە و هەر ئەمە بوو کە لە ئاکام گوتی، «بلا با وەها خودایەک نەبێ! نەبوونی خودا باشترە! چارەنووسی خۆ ساز کردن بە دەستی خۆ باشترە! شێت بوون باشترە! خۆ خودا بوون باشترە!»

پاپی پیر کە گوێی تیژ کردبوو، لێرە دا گوتی: «چ دەبیسم! زەردەشت، تۆ بە وەها بێئیمانییەک، خوداپەرستتر لەوەی کە پێت وایە! دەبێ خودایەک لە نێو تۆ دا تۆی بەرەو بێخودایی بردبێ.

ئایا ئەمە خوداپەرستی تۆ نیە کە ئیدی ئیزن نادا ئیمانت بە خودایەک هەبێ؟ و راستی پتر لە رادەی تۆیە کە تۆ لەوپەڕی چاکە و خراپەش دا رێنوێنی دەکا!

تەنیا بڕوانە، بۆ تۆ چ ماوەتەوە؟ تۆ چاو و دەست و زارێکت هەیە کە لە ئەزەلەوە بۆ ئافەرین گوتن ساز کراون. مرۆڤ تەنیا بە دەست ئافەرین ناڵێ.

هەر چەند تۆ دەتەوێ بێخوداترین کەس بی، بەڵام لە دەوروبەرت بۆنی عەترم بۆ دێ. عەترێکی شاراوەی پیرۆز و خۆش لە ئافەرین گوتنەکانی دوور و درێژ: ئەمە من سەرخۆش و غەمین دەکا.

زەردەشت، ئیزن بدە تەنیا بۆ شەوێک میوانت بم! نووکە لە سەر رووی زەوی جگە لای تۆ هیچ کوێم پێخۆشتر نیە!»

زەردەشت بە سەرسوڕماوییەکی زۆرەوە گوتی: «ئامین! بلا وابێ! رێ بەم

سەرە دایە، ئەشکەوتی زەردەشت لەوێیە.

ئەی پیاوی هێژا، بریا خۆم توانیبام تۆم هەتا وێندەرێ بردبا، چونکە من گشت خەڵکی خوداپەرستم خۆش دەوێن. بەڵام نووکە هاوارێکی هانا من بە پەلە لە لای تۆوە بانگ دەکا.

لە هەرێمی من دا کەس نابێ زیانی پێبگا؛ ئەشکەوتەکەم گیانپەنایەکی باشە و لە هەموان پتر پێم خۆشە کە دەردەداران دیسان بە پێی پتەو لە سەر زەوی پتەو دانێمەوە.

بەڵام، کێ دەتوانێ مەینەتی تۆ لە سەر شانت هەڵگرێ؟ من لەوە بێهێزترم کە ئەم کارەم پێبکرێ. بە راستی، ئێمە دەبێ زەمانێکی درێژ چاوەڕوان بمێنینەوە هەتا کەسێک خوداکەت بۆ وە ئاگا بێنێتەوە.

چونکە ئەم خودا پیرە ئیدی ناژی: ئەو لە بنەڕەتەوە مردوە.»

وەهای گوت زەردەشت.

## ناحەزترین مرۆڤ

پێیەکانی زەردەشت جارێکی دی بە کێو و لێڕەکان دا رۆیشتن و چاوەکانی پشکنیان و پشکنیان، بەڵام ئەوەی کە داخوازی دیتنی بوون، ئەو دەردەدار و هاوارکەری گەورەی هانایان، نەدیتەوە، چونکە ئەو لە شوێنێک نەبوو کە ببیندرێتەوە. بەڵام زەردەشت لە تەواوەتی رێ دا لە نێو دڵی خۆی دا شادی دەکرد و شوکرانەی دەبژاردو و بە خۆی دەگوت: «ئەم رۆژە بۆ قەرەبووی خراپ دەستپێکردنی چ شتگەلێکی باشی پێشکەشی من کرد! چ هاودەمانێکی سەیرم دیتەوە!

نووکە هەتا درێژماوەیەک قسەکانیان هەروەک دەنکە گەنمە باشەکان دەجووم و ددانەکانم ئەوان دەهاڕن و وردی دەکەن هەتا وەک شیر لە رەوانم دا بگەڕێن.»

بەڵام کاتێک دیسان رێگا بەرەو رەوەزێک چەمیوە، دیمەن لەپڕ گۆڕدرا و زەردەشت پێی دە هەرێمی مەرگ نا. لەوێ رەوەزە سوور و رەشەکان سەریان بەرز کردبۆوە؛ نە گیایەک، نە دارێک، نە چریکەی مەلێک. چونکە ئێرە دۆڵێک بوو



کە گشت گیاندارەکان، بۆ وێنە گیاندارە راوکەرەکان، خۆیان لێدەپاراست، جگە لە چەشنێک ماری قەف ئەستووری کەسک، کە کاتێک پیر دەبوو بۆ مردن دەهاتە ئێرە. لەبەر ئەوە شوانەکان بەم دۆڵەیان دەگوت دۆڵی مەرگە مار.

بە هەر حاڵ، زەردەشت چووبوە نێو یادە تاریکەکانەوە. چونکە وای دەهاتە بەر چاو کە جارێکی دیکەش رێی دەم دۆڵە کەوتوە و گەلێک شتی قورسی کەوتە سەر زەین، وەها کە هەنگاوی شل و شلتر دەکردەوە هەتا ئەوەکە وەستا. بەڵام کە چاوی کردەوە، دیتی کە شتێک لە سەر رێ دانیشتوە، شتێکی وەک مرۆڤ، بەڵام بە زۆری هاووێنە، شتێکی لە گوتن نەهاتوو و دەستبەجێ شەرمێکی گەورە زەردەشتی داگرت کە بۆچی چاوی لە وەها شتێک کردوە. زەردەشت کە هەتا موو سپییەکانی سوور هەڵگەڕابوو، چاوی هەڵگرت و هەنگاوی هەڵێناوە هەتا ئەم شوێنە ناخۆشە جێ بێڵێ. بەڵام هەر ئەودەم لە بیاوانی مردوو دەنگێک بەرز بۆوە: لە زەوی خڕەخڕ و هاش و هووشێک هەڵستا، هەروەک خڕە و هاژەی ئاوێک کە شەوانە بە پلووسکێکی گیراو دا بڕوا؛ لە ئاکام دەنگ و قسەی مرۆڤێکی لێهەستا ـ کە دەیگوت:

زەردەشت! زەردەشت! پەردەکی من بکەوە! بێژە! بێژە! **سزای شاهید چیە**؟

وا باشتر کە بگەڕێیەوە. ئێرە [وەک] سەهۆڵ خلیسکە! وریا بە! وریا بە! کە غروورت لێرە پێی خۆی نەشکێنێ!

تۆ خۆت بە فرەزان دەزانی، زەردەشتی لەخۆبایی! کەوایە، ئەی شکێنەری فندقە رەقەکان، پەردەکی من بکەوە ـ ئەو پەردەکەی کە منم! نووکە بێژە کە من کێم؟»

پێتان وایە کە بە بیستنی ئەم قسانە چ بە سەر رەوانی زەردەشت دا تێپەڕی؟ بەزەیی ئەوی داگرت و لە نەکاو، مینا داربەڕوویەک کە لە بەرابەر گەلێک تەور دا وەستابێ، داکەوت ـ داکەوتنێکی قورس و لەپڕ و بە سام تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە تەمای خستنیان هەبوو. ئەو هەر ئەودەم لە زەوی هەستاوە و سیمای تووڕە بوو و بە دەنگێکی بە قەو گوتی: **تۆ قاتڵی خودای**! بێڵە با بڕۆم.

تۆ نەتدەتوانێ تاقەتی ئەو کەسە بێنی کە تۆی دەدیت ـ کە هەمیشە تۆ و نێو و نێوانی تۆی دەدیت، ئەی ناحەزترین مرۆڤ! تۆ لەم شاهیدە تۆڵەت ستاندەوە!»

وەهای گوت زەردەشت و تەمای رۆیشتنی گرت؛ بەڵام ئەو لە گوتن نەهاتوویە داوێنی کەواکەی ئەوی گرت و دیسان خرەخرِ و لە وشە گەڕانی دەست پێکردەوە و لە ئاکام گوتی:

«بوەستە! بوەستە! لێرە مەڕۆ! من تێگەیشتم کە کامە تەور تۆی خست: بژی ئەی زەردەشت، کە دیسان هەستایەوە سەر پێ!

من باش دەزانم کە تۆ بە حاڵی ئەو کەسە دەزانی کە ئەوی کوشت ـ بە حاڵی ئەو قاتڵەی خودا! بوەستە! لە پەنام دانیشە! ئەوە کارێکی بێفایدە نیە.

بێجگە لە تۆ دەمتوانی روو دە کێ بکەم؟ بوەستە! دانیشە! بەڵام مەڕوانە من! وەها رێز لە ناحەزی من بگرە!

نووکە تۆ دوایین پەنای منی. چونکە ئەوان وە دوای من دەکەون. بریا بە بێزاری و دڵازارییانەوە وە دوام کەوتبان، چونکە من بە وەها وەدوا کەوتنێک پێدەکەنم و لێی رازیم و پێی سەربڵندم!

مەگەر ئەوە نیە کە هەتا ئێستا ئەو کەسانەی کە باش وەدوا کەوتوون، لە هەموو کەس سەرکەوتووتر بوون؟ ئەو کەسەی کە باش وەدوا دەکەوێ، بە سانایی وەدوا کەوتن فێر دەبێ: چونکە هەمیشە ـ لە پاشەوەی هەموانە!

بەڵام راکردنی من لە بەزەیی ئەوانە، لە بەزەیی ئەوانە کە من رادەکەم و بۆ لای تۆ رادەکەم. ئەی زەردەشت، بمپارێزە، ئەی دوایین پەناگام، ئەی تاکە کەسێک کە بە حاڵی من دەزانی!

تۆ بە حاڵی ئەو کەسە دەزانی، کە ئەوی کوشت. بوەستە! ئەگەر بە تەمای رۆیشتنی، ئەی بێئۆقرە، بەو رێگایە دا مەڕۆ کە من پێی دا هاتووم. ئەوێ رێگایەکی خراپە.

ئایا لە من توورەی کە نووکە بە زمانی خواروخێچ زۆربڵێیی دەکەم و تۆ پەند دەدەم؟ بەڵام بزانە کە من هەر ئەو ناحەزترین مرۆڤەم.

ـ هەر ئەوە کە گەورەترین و قورسترین پێیەکانی هەیە. بەو شوێنە دا کە من رۆیشتم، رێگا خراپە. من گشت رێگاکان وەها پێشێل دەکەم هەتا بمرن و بفەوتێن.



بەڵام دوای ئەوە کە بێدەنگ بە پەنام دا تێپەڕی؛ دوای ئەوە کە من زۆر جوان دیتم، تۆ سوور هەڵگەڕای: دوای ئەوە من تۆم ناسیوە زەردەشت.

هەر کەسێکی دیکە با بە نیگا و قسە، سەدەقە و بەزەیی خۆی بۆ لای من داویشت ـ بەڵام تۆ تێگەیشتی کە من زۆر گەدای ئەمە نیم.

بۆ ئەو ئەوەند کە پێویستە **دەوڵەمەندم**، دەوڵەمەند لەوەی کە گەورەیە، لەوەی کە بە سامە، هەرە ناحەز، شتە هەرە لە گوتن نەهاتوەکان! ئەی زەردەشت، شەرمەکەت رێزی لە من گرت!

بە دژواری خۆم لە نێوان کۆمای بەزەییدەرەکان کێشا دەرەوە ـ هەتا ئەو تەنیا کەسە ببینمەوە کە ئیمرۆ فێر دەکا: «بەزەیی بێئەدەبییە،» ـ بۆتۆ، ئەی زەردەشت!

چ بەزەیی خودا بێ، چ بەزەیی مرۆڤ: بەزەیی دژی شەرمە. لەوانەیە یاریدە نەدان باشتر بێ لە ئاکارباشییەک کە بۆ یاریدە دان هەڵدەستێ.

بەڵام ئەوەی کە ئیمرۆ لە لای گشت خەڵکی بچووک بە ئاکارباشی ناوی دەبردرێ، هەر ئەوە بەزەیە ـ ئەوان رێز لە چارەڕەشیی گەورە، ناحەزیی گەورە، سەرنەکەوتوویی گەورە ناگرن.

من، هەر وەک سەگێک کە بە سەر رانەمەڕێک دا دەڕوانێ، بە سەر هەموان دا دوور دەڕوانم. ئەمانە خەڵکێکی بۆری بچووک و خاوەن ویستی باش و خوری باشن .

وەک شاهۆ کە بە سووکی چاو لە مردواوی تەنک دەکا و رووی لێوەردەگێڕێ، منیش روو لە کۆمەڵێک شەپۆلی بۆری بچووک و ویست و رەوانەکان وەردەگێڕم و لە سەرووی ئەوانەوە دەڕوانم.

دەمێکە کە هەقیان پێداون، بەم خەڵکە بچووکە: لە ئاکام، دەستەڵاتیشیان پێدان ـ نووکە ئەوان فێر دەکەن کە: «چاکە تەنیا ئەوەیە کە خەڵکی بچووک بە چاکەی دابنێن.»

ناوی «راستەقینە» ئیمرۆ هەر ئەوەیە کە ئەو موعیزەکەرە گوتی، هەر ئەوەی کە خۆی لە نێو ئەوان سەری هەڵدابوو، هەر ئەو پیرۆز و وێژەرە سەیرەی خەڵکی بچووک، هەر ئەوەی کە لەمەڕ خۆی دا شاهیدی دا: «من راستەقینەم.»

نووکە درێژماوەیەکە ئەم پڕروویە کەللەی خەڵکە بچووکەکانی پڕ لە با کردوە ـ هەر ئەو کەسەی کە ئەم هەڵە نە هێندە چووکەی فێر کرد کە «من راستەقینەم.»

ئایا قەت وڵامی پڕروویيان، وەها بە ئەدەبانە داوەتەوە؟ بەڵام زەردەشت، تۆ بە پەنای دا تێپەڕی و گوتت: «نا! نا! سێ جار نا!»

تۆ ئەوت ئاگادار کردەوە کە هەڵەی دەکا، تۆ یەکەم کەسی کە [مەترسی] بەزەییت راگەیاند ـ نە هەمووکەس، نە هیچ کەس، بەڵکە تۆ و چەشنی تۆ.

تۆ لە شەرمی دەردەداری گەورە شەرمەزار بوویەوە، بە راستی، ئەودەم کە دەڵێی، «لە لایەن بەزەوە هەورێکی قورس دادێ، وریا بن، ئەی مرۆڤەکان!»

ـ ئەودەم کە فێر دەکەی، «ئافرێنەرەکان گشتیان رەقن، هەر ئەوینێکی گەورە لە سەرووی بەزەیی خۆی هەڵکەوتوە»: ئەی زەردەشت، بۆم دەردەکەوێ کە تۆ چەندە باش نیشانەکانی شێوانی هەوا دەناسی!

بەڵام تۆ خۆت ـ خۆشت لە بەزەیی **خۆت** ئاگادار کەوە! چونکە گەلێک بەرەو تۆ بەڕێوەن، گەلێک دەردەدار، ناهومێد، خنکێنەر، ژاکێنەر ـ

من تۆ لە خۆشم ئاگادار دەکەمەوە. تۆ باشترین و خراپترین پەردەکی منت هەڵدا، خودی خۆم و ئەوەی کە من کردوومە. من ئەو تەورە دەناسم کە تۆی بەرداوەتەوە.

بەڵام ئەو ـ دەبا مردبا. ئەو بەو چاوانەوە دەیڕوانی کە هەموو شت دەبینێ ـ ئەو ناخی مرۆڤەکان و بنەڕەتەکانی دەدیت، تەواوەتی نەنگ و ناحەزیی شاراوەیان.

بەزەکەی شەرمی نەدەناسی: ئەو هەتا چەپەڵترین سووچەکانی من خزی. ئەم هەرە پرسایە، ئەم لە رادە بەدەر زۆردارە، لە رادە بەدەر بە بەزەیە، دەبا مردبا.

ئەو هەمیشە **منی** دەدیت: من دەمەویست یا لە وەها شاهیدێک تۆڵەی بستێنمەوە ـ یا ئەوەکە خۆم ئیدی زیندوو نەمێنم.

خودایەک کە هەموو شتی دەدیت، **تەنانەت مرۆڤ**: وەها خودایەک دەبا مردبا! مرۆڤ تاقەتی ئەوەی نەبوو کە وەها شاهیدێک زیندوو بمێنێتەوە.»



وەهای گوت ناحەزترین مرۆڤ. بەڵام زەردەشت هەستا و تەمای رۆیشتنی گرت: چونکە هەتا نێو هەناوی بەستبووی.

ئەو گوتی: «ئەی لە تاریف نەهاتوو، تۆ منت لە رێی خۆت پاراست و من بۆ سپاس رێگای خۆمت خەڵات دەکەم. بڕوانە، ئەشکەوتی زەردەشت لەو سەرەیە.

ئەشکەوتی من گەورەیە و قووڵە و گەلێک سووچ و کەلێنی هەیە؛ تەنانەت خۆشاراوەترین کەسیش لەوێ شاراوگەیەک دەدۆزێتەوە و لە پەنا ئەو گیانداری کێوی خزۆک و فڕۆک و بزۆک سەدان لانە و سیپەیان هەیە.

ئەی دەرکراوێک کە خۆشت خۆت دەرکردوە، ئەگەر ناتەوێ لە نێو مرۆڤ و بەزەیی مرۆڤ دا بژی، هەر ئەوەی بکە کە من دەیکەم، کەوایە تۆش لە من فێر بە؛ تەنیا ئەوەی کە ئەنجامدەری کارێکە، فێر دەبێ.

بەر لە هەر شتێک دەگەڵ گیاندارەکانم بدوێ! باییترین گیاندار و ژیرترین گیاندار ـ ئەوان بۆ هەر دووکی ئێمە رێنونێکی شیاو دەبن!»

وەهای گوت زەردەشت و بە رێی خۆی دا رۆیشت، بەڵام پڕ فکرتر و شل هەنگاوتر لە جاران: چونکە گەلێک پرسیاری لە خۆ هەبوون و بە سانایی وڵامی بۆ نەدەدیتنەوە.

لە دڵی خۆی دا بیری کردەوە: چەندە هەژارە مرۆڤ! چەندە ناحەز، چەندە بە بۆڵەبۆڵ، چەندە ئاخنراو لە شەرمی شاراوە!

بە منیان گوتوە کە مرۆڤ ئەویندارى خۆیەتی: ئاخ، ئەو ئەوین بە خۆیە دەبێ چەندە گەورە بێ! چەندە بە سووک دانان دەگەڵی لە کێشە دایە!

ئەو پیاوەش هەر ئەوەندە کە خۆی بە سووک دادەنا، ئەوەندەش ئەویندارى خۆی بوو ـ لای من ئەو ئەویندارێکی گەورە و بە سووک دانەرێکی گەورەیە.

هێشتا کەسم نەدیوە کە وەها خۆی لەمە بە سووکتر دابنێ: بەڵام، ئەمەش پایەبەرزییە. هاوار، لەوانەیە ئەو هەر مرۆڤی باڵاتر بێ کە من هاوارەکەیم بیستوە؟

خۆشم دەوێن بە سووک دانەرانی گەورە. بەڵام مرۆڤ شتێکە کە دەبێ بە سەری دا زاڵ بێ.

## گەدای خۆویست

کاتێک زەردەشت ناحەزترین مرۆڤی جێهێشت، هەستی بە سەرما و تەنیایی کرد: چونکە گەلێک شتی سارد و تەنیا بە مێشکی دا تێپەڕیبوون، وەها کە هەموو ئەندامەکانی بەستبووی. سەرەڕای ئەوەش سەرتر و سەرتر هەڵگەڕا، هەوراز و لێژی دەبڕین، هەتا لە پەنای مێرغوزارێکی بژوێن لە بەستۆڕەیەکی بەردەڵان، کە سەردەمایەک جۆبارێکی نائارام بەو بەستۆڕە دا تێدەپەڕی: زەردەشت لەپڕ دیسان هەستی کرد کە گەرمتر و خۆشتر بۆتەوە.

زەردەشت لە خۆی پرسی: «چم لێقەوماوە؟ شتێکی گەرم و زیندوو من دەبووژێنێتەوە کە دەبێ هەر لەم نزیکانە بێ.

نووکە تەنیاییم کەمتر بۆتەوە؛ ئاوالان و برایانێکی نەناسیاو لە دەورەم ئاپوورەی دەدەن و هەناسەی گەرمیان وە رەوانم دەکەوێ.»

بەڵام کاتێک روانیە دەوروبەری خۆی و لە ئارامکەرەوەکانی تەنیایی خۆی گەڕا: دیتی لەوێ گارانێکی لێیە کە لە سەر تەپکێک لە پەنا یەک وەستاون و نزیکیی و بۆنی ئەوان بوو کە دڵیان گەرم کردبۆوە. بەڵام وا دەهاتە بەر چاو کە ئەم گایانە تامەزرۆیانە گوێیان لە وێژەرێک گرتوە و سەرنجێک نادەنە ئەو کەسەی کە دێ. کاتێک زەردەشت گەیشتە نزیکیان، بە ئاشکرا بیستی کە دەنگێکی مرۆڤانە لە نێو گایەکان دا قسە دەکا و وەها دیاری دەدا کە گایەکان تێکڕا سەریان بەرەو وێژەر وەرسووڕاندوە.

ئەوسا زەردەشت تامەزرۆیانە بازدی دا سەر تەپکەکە و بڵاوەی بە گیاندارەکان کرد، چونکە ترسی ئەوەی هەبوو نەکا ئازار بە کەسێک گەیشتبێ کە بەزەیی گایەکان چاری دەردی نەکا. بەڵام بە هەڵە چووبوو؛ چونکە بڕوانە، لەوێندەرێ پیاوێک دانیشتبوو و وا دیاری دەدا کە ئەو گیاندارانە والێدەکا کە لەو نەترسن، پیاوێکی ئاشتیخواز و موعیزەکەری کێو کە لە چاوەکانییەوە، چاکە



خۆی موعیزەی دەکرد. زەردەشت سەرسوڕماو هاواری کرد: «تۆ لێرە لە چی دەگەڕێی؟»

ئەو وڵامی داوە: «ئەی مزاحم! من لێرە لە چی دەگەڕێم؟ من لەو شتە دەگەڕێم کە تۆ بە دوایەوەی، یانی بەختیاریی سەر زەوی.

بەڵام من دەمەوێ ئەوە لەم گایانە فێر بم. چونکە بزانە کە من هەر لەبەر ئەوە دانێک لە رۆژ خەریکی قسە کردن دەگەڵ ئەوان بووم و ئەوان تازە دەیانەویست من رێنوێنی بکەن. بۆچی مزاحمیان بووی؟

هەتا نەگەڕێینەوە و نەبینەوە گا، رێمان دە مەلەکوتی ئاسمان ناکەوێ. هەر لەبەر ئەوە دەبێ **شتێک** لەوان فێر بین: کاوێژ کردن.

بە راستی، چ کەلکی هەیە کە مرۆڤ تەواوەتی دونیا وە چنگ بخا بەڵام ئەم کارە، ئەم کاوێژ کردنە، نەزانێ! دەنا مرۆڤ لە مەینەتی خۆی رزگاری نابێ!

ـ لە مەینەتی گەورەی خۆی: کە ئێمرۆ ناوی **بێزە**. کێ هەیە کە ئێمرۆ دڵ و چاو و زاری پڕ لە بێز نەبێ؟ تەنانەت تۆ! تەنانەت تۆ! بەڵام بڕوانە ئەم گایانە!»

وەهای گوت ئەو موعیزەکەرەی کێو و نیگای کە هەتا ئەودەم ئەویندارانە لە گایەکان بڕیبوو، لە زەردەشتی بڕی، بەڵام لەپڕ شێوا و هەراسان هاواری کرد و راپەڕی: «ئەمە کێیە کە من دەگەڵی دەدوێم؟

ئەمە مرۆڤی بێ بێزە، ئەمە زەردەشتە، ئەم زاڵ بوویە بە سەر بێزی گەورە دا، ئەمەیە چاو، ئەمەیە زار، ئەمەیە دڵی زەردەشت.»

لەم بەینە دا کە وەهای دەگوت، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، دەستی ئەو کەسەی کە قسەی دەگەڵ دەکرد، راموسی و وەک کەسێک دەجووڵاوە کە خەڵات و خەزێنەیەکی پڕ بایەخ لەپڕ لە ئاسمانەوە کەوتبێتە نێو داوێنی. بەڵام گایەکان شاهیدی تەواوی ئەم رووداوە بوون.

زەردەشت کە بەری دڵسۆزی خۆی گرتبوو، گوتی: «ئەی پیاوی سەیر، ئەی پیاوی نازدار! باسی من مەکە، دەگەڵ من لە پێشدا لە خۆت بدوێ. ئایا تۆ هەر ئەو گەدا خۆویستە نی کە رۆژێک سامانێکی زۆری فڕێ دا؟

کە لە سامانی خۆی و لە دەوڵەمەندان شەرمەزار بوو و بۆ لای هەژارەکان

رای کـرد هـەتا پڕایی و دڵـی خـۆی پێـشکەشی ئـەوان بکا، بەڵام ئەوان ئـەویان وەرنەگرت؟»

گـەدای خـۆویست گـوتی: «ـ بەڵام ئەوان منیـان وەرنەگـرت. تۆ ئەمـە دەزانـی. لەبەر ئەوە من رووم دە گیانداران کرد و لەم گایانە.»

زەردەشت قسەی وێژەری بڕی و گوتی: «کەوایـە تۆ ئەمە فێر بووی کە دروست بەخـشینەوە هـەتا چ رادەیەک دژوارترە لە دروست وەرگرتن و باش بەخـشینەوە خۆی هونەرێکە و دوایین و ژیرترین و سەرترین هونەری چاکەیە.»

گـەدای خـۆویست وڵامـی داوە: «بە تایبـەت ئیـمـڕۆ، مـەبەسـتم لە ئیـمـڕۆ رۆژگارێکە کە گشت نزمەکان راپەڕیون و دەسڵەمێنەوە و داخوازی داب و نەرێتی خۆیانن یانی داب و نەرێتی عەوام.

تۆ دەزانـی کـە دەمـی راپەڕینی گـەورە، خـراپ، درێژ، و کـورتـی عـەوام و بەردەکان داهاتوە و رۆژ بە رۆژ پەرەگر و پەرەگرتر دەبێ!

نووکە بچووکەکان لە هەر بەخشین و بەشینەوەیەکی کەم دەرهەڵدەبن و ئەوەی کە سامانێکی زۆری هەیە دەبێ ئاگای لە خۆ بێ!

ئەو کەسـەی کە ئیمـڕۆ هەروەک کووپە زگدارەکان لە ئەستـۆی زۆر باریکی خۆیان شتێک دڵۆپ دڵۆپ بتکێنن ـ ئیمڕۆ ئەستۆی وەها کووپەگەلێک دەشکێنن.

تەماحی تەماحکاریی، ئێرەیی تاڵ، تۆڵەستێنی مۆن، غرووری عەوام: ئەوانە گشـتـی بە رووم دادران. ئیـدی ئـەوە راست نیـە کـە هـەژارەکـان پیـرۆزن، بـەڵکە مەلەکووتی ئاسمان لە لای گایەکانە.»

زەردەشت هـەروا کـە گـایەکـانی دەوروبەری ئەو ئاشـتـیـخـوازەی ، کـە بە خـەیاڵێکی راحـەت پشـووی دەدا، لا دەدا، بە وەسـوەسـەوە پرسی: «ـ و بـۆچی لە لای دەوڵەمەندەکان نا؟»

ئەویش وڵامی داوە: «بۆچ من وەسوەسە دەکەی؟ ئەی زەردەشت؟ مـەگەر تۆ بۆ خۆت باشتر نازانی کە چ شتێک منی بۆ لای هەژارەکان راکێشا؟ مەگەر بێز لە دەوڵەمەندترین کەسەکانمان نەبوو؟

لەو زیندانیـانەی سـامـان کـە لە هـەر زبـڵێک قـازانجی خـۆیان دەردەکـێشن بە



چاوە ساردەکان و بیرە چەپەڵەکانیانەوە، لەو بوودەڵانەی کە بۆگەنیویان بەرەو ئاسمان دەڕوا.

لەو عەوامە زێڕکفتە دووڕوویانەی کە باوکەکانیان گیرفانبڕ یا کەلاکخۆر یا شڕەخۆر بوون، بە ژنی ئامادە بە خزمەت و هەوەسباز و فەرامۆشکارەوە: چونکە هیچکام لەوان هێندە لە جندەیەتی دوور نین ـ

لـە سـەرەوە عـەوام و لـە خـوارەوە عـەوام! ئیـمـڕۆ ئیـدی «هـەژار» و «دەوڵەمەند» چیە! من جیاوازییەک نابینم ـ لەبەر ئەوە بۆ دوور و دوورتر رام کرد، هەتا گەیشتمە ئەم گایانە.»

وەهای گوت ئەم ئاشتیخوازە و لە نێوان قسە کردن دا بە قورسی هەناسەی هەڵدەکێشا و ئارەقەی دەڕشت، وەها کە گایەکان دیسان حەیران مانەوە. بەڵام زەردەشت لەم بەینە دا کە ئەو وەها رەق دەدوا، بە بزەیەکەوە دەیڕوانیە سیمای ئەو و بێدەنگ سەری دەلەقاند.

«ئەی موعیزەکەری کێو، تۆ بە دەربڕینی وەها وشەگەلێکی رەق زوڵم لە خۆت دەکەی. نە زاری تۆیان بۆ وەها رەقییەک ساز کردوە و نە چاوەکانت.

هەروەکی دیارە، گەدەشت دەگەڵ وەها غەزەب و تووڕەیی و کەف پڕژاندنێک سازگار نیە. گەدەت شتگەلی نەرمتری دەوێ: تۆ قەساب نی!

بە بڕوای من تۆ زۆرتر لاگری گیا و ریشەی و لەوانەیە پتر دانەوێڵە بجووی. بەڵام، بێشک، نێوانت دەگەڵ چێژەکانی گۆشت نیە و هەنگوینت پێخۆشە.»

گەدای خۆویست بە دڵێکی ئاسوودەوە وڵامی داوە: «باش بە رازی منت زانی. من هەنگوینم پێخۆشە، دانەوێڵەش دەجووم، چونکە من لەو شتە گەڕاوم کە بەتام بوە و هەناسەی پاک دەکاتەوە

ـ هەروەتر ئەو شتەی کە پێویستی بە زەمانێکی درێژ هەیە و بۆ تەوەزەلەکان و بێکارە بێ ئازارەکان هۆی شێویلکە جووڵاندنەوە و رۆژ گوزەراندنە.

بێشک گایەکان لەم بارەوە لە هەموان لە پێشترن: چونکە کاوێژ کردن و لەبەر هەتاو خۆ هەڵخستنیان بۆ خۆیان ساز کردوە و لە هەر بیرێکی دژوار کە دەبێتە هۆی پەنەمانی دڵ، خۆ دەپارێزن.»

زەردەشت گوتی: «زۆر باشە! تۆ دەبێ گیاندارەکانی **منیش** ببینی، هەڵۆ و مارەکەم ـ وەکی ئەوان ئیمڕۆکە لە سەر رووی زەوی دەست ناکەون.

بڕوانە، ئەو ڕێگایە دەگاتە ئەشکەوتەکەی من: ئیمشەو میوانی من بە و دەگەڵ گیاندارەکانم لە بەختیاری گیاندارەکان بدوێ،

ـ هەتا من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ. چونکە نووکە هاوارێکی هانا من لە لای تۆ بانگ دەکا. لای من هەنگوینی تازەش دەست دەکەوێ، هەنگوینی زێڕن شانەی وەک سەهۆڵ: بڕۆ بیخۆ!

بەڵام نووکە دەستبەجێ لە گایەکانت دوور کەوە، ئەی پیاوی سەیر، ئەی پیاوی نازدار! هەر چەند ئەم کارەت لەبەر گران بێ، چونکە ئەمانە گەرمترین ئاواڵ و مامۆستایانی تۆن.»

گەدای خۆویست وڵامی داوە: «جگە لە کەسێک کە من لەمانەم پتر خۆش دەوێ و ئەو تۆی، ئەی زەردەشت، کە باشی و لە گا باشتری!»

زەردەشت، بە تووڕەیی هاواری کرد: «ون بە! ون بە! خۆڕێکخەری بەدجنس! بۆچی من بە وەها پەسن و شیلەی زمانلووسی خراپ دەکەی؟»

دیسان هاواری کرد: «ون بە! ون بە!» و وەکازەکەی لە گەدای دڵاوا هەڵێنا، و گەدا بە پەلە دەرپەڕی.

## سێبەر

بەڵام هەر ئەودەمەی کە گەدای خۆویست رایکرد و زەردەشت جارێکی دی دەگەڵ خۆی تەنیا ماوە، لە پشت سەری خۆی دەنگێکی بیست کە هاواری کرد: «بوەستە! زەردەشت! سەبر بگرە! منم، زەردەشت، من، سێبەری تۆ!» بەڵام زەردەشت سەبری نەگرت، چونکە لەم هەموو حەشامەت و شلووقییە لە کوێستانەکەی دا لەپڕ غەمێک دایگرت، و گوتی: «تەنیاییم بۆ کوێ چوە؟

بە راستی، ئیدی تاقەتم نەماوە؛ لەم کوێستانە خەڵک تێک بەزیون. هەرێمی من ئیدی سەر بەم دونیایە نیە. من پێویستم بە کێوگەلێکی نوێ هەیە.

سێبەرەکەم هەرام لێدەکا؟ سێبەرەکەم ئیدی کێیە! بڵا با بە شوێنم دا رابکا!



من ـ لە بەری رادەکەم.»

زەردەشت وەهای بە دڵی خۆی گوت و لە دوایی رایکرد. بەڵام ئەو کەسەی کە بە شوێنیەوە بوو وە دوای کەوت: وەها کە بە زوویی سێ کەس بە راکردنەوە بە دوای یەکەوە بوون: لە پێشەوە گەدای خۆویست، لە دوایی زەردەشت و سێهەمین و دواهەمین، سێبەرەکەی ئەو. بەڵام هێشتا هێندە بەمجۆرە هەڵنەهاتبوون کە زەردەشت لە گەوجایەتی خۆی ئاگادار بوو و بە تەکانێک تەواوی مەلوولی و بێزاری لە خۆ دوور کردەوە.

زەردەشت گوتی: «سەیرە! مەگەر شتە هەرە مەسخەرەکان هەمیشە لە نێو ئێمە خەڵوەنشینەکان و پیرۆزەکان دا روو نادەن؟

بە راستی، گەوجایەتیم لە کوێستان هەڵیداوە! نووکە دەنگی پێی شەش پیاوی شێتی پیر دەبیسم کە بە دوای یەک دا تەپەتەپیان دێ.

ئایا لەوانەیە زەردەشت لە سێبەرێک بترسێ؟ بە هەر حاڵ پێموایە کە ئەو لینگەکانی لە من درێژتر بێ.»

وەهای گوت زەردەشت و بە چاو و بە دڵ پێدەکەنی؛ ئەوسا وەستا و گورج وەرگەڕاوە، وەها کە هێندەی نەمابوو رەپێنەر و سێبەری خۆی بەرداتەوە، چونکە ئەوی دیکەی بە پاژنەیەوە نووسابوو و وەدوای دەکەوت و گەلێکیش لاواز بوو. کاتێک زەردەشت بە چاوەکانی خۆی ئەوی هەڵسەنگاند، وەها ترسی رێنیشت کە دەتگوت لەپڕ تووشی تاپۆیەک بوە: رەپێنەرەکەی وەها لاواز، رەش و تار، پووک و بێهێز دیاری دەدا.

زەردەشت بە دەرهەڵبوونییەوە پرسی: «تۆ کێی؟ لێرە چ دەکەی؟ و بۆچی خۆ بە سێبەری من ناو دەبەی؟ تۆم بە دڵ نیە.»

سێبەر وڵامی داوە: «ببوورە کە من وەهام؛ و ئەگەر بە دڵی تۆ نیم، زۆر باش، زەردەشت! من رێز لە تۆ و خۆشزەوقیت دەگرم.

من هەر ئەو ئاوارەیەم کە هەتا ئێستا گەلێک لە پشت پاژنەی تۆ هەنگاوم هەڵێناوەتەوە: هەمیشە بەڕێوە بووم، بەڵام بێئامانج، و هەروەتر بێماڵ: وەها کە، بە راستی، لەم جوولەکە هەمیشە [ئاوارەیە] چم کەم نیە جگە لەوە کە نە هەمیشەییم و نە جوولەکە.

بڕوانە؟ ئایا دەبێ هەمیشە بەڕێوە بم؟ بابردەڵەی هەر بایەک؟ بێ ئارام، دەرکراو؟ ئەی زەوی، تۆ بۆ من پتر لەوەی کە پێویستە خڕی!

هەتا ئێستا لە سەر هەر سەراییەک دانیشتووم؛ وەک تۆزی ماندووی سەر ئاوێنەکان و سەر شووشەی پەنجەرەکان خەوم لێکەوتوە: گشت شتێک، شتێک لە من دەستێنن و هیچ شتێک نامداتێ، من لاواز دەبم ـ و پتر وەک سێبەرێک دەچم.

بەڵام ئەی زەردەشت لە هەموان پتر بە دوای تۆ دا هەڵاتووم و راکێشراوم، هەر چەند هەتا ئێستا خۆم لێشاردبوویەوە، باشترین سێبەری تۆ بووم. لە هەر کوێیەک کە تۆ دانیشتووی، منیش دانیشتووم.

هەروەک تاپۆیەک کە بە ویستی خۆی بە سەر بانەکانی زستانی و بەفر دا بڕوا، دەگەڵ تۆ لە دوورترین و ساردترین دونیاکان گەڕاوم.

دەگەڵ تۆ بۆ ڕێ بردن دە نێو هەر شتێکی قەدەغە، لە خراپترین و دوورەدەستترین شتەکان، هەوڵم داوە: ئەگەر ئاکارباشییەک لە من دابێ، هەر ئەمەیە کە من لە هیچ شتێکی قەدەغەکراو باکم نەبوە.

دەگەڵ تۆ ئەوەی کە دڵم حورمەتی دەگرت، شکاندم: تەواوی بەردەکانی مەرز و کۆتەڵەکانم بەردانەوە، بە دوای پڕ مەترسیترین ئاواتەکان دا چووم ـ بە راستی، بۆ جارێک دەستم لە هەر جەنایەتک دا.

دەگەڵ تۆ ئیمان بە پەیڤەکان و بایەخەکان و ناوە گەورەکانم لە یاد سڕیوە. مەگەر ئەوە نیە کە هەر کاتێک کە شەیتان توێژ داوێژێ، ناوی ئەو توێژەش لەو دادەکەوێ؟ چونکە ئەویش توێژێکە. لەوانەیە شەیتان بۆ خۆی ـ توێژ بێ.

هیچ شتێک راست نیە. هەموو شت مەجازە: وەهام بە خۆم گوت و بە سەر و بە دڵ خۆم لە ئاوە هەرە ساردەکان هاویشت. ئاخ، دوای ئەوە چەندە وەک قرژانگێکی سوور، بە رووتی وەستاوم!

مخابن، گشت چاکەکانی من و گشت شەرمەکان و گشت ئیمانم بە چاکەکان چوونە کوێ! مخابن، لە کوێیە بێگوناهی درۆیینی من کە سەردەمایەک هەمبوو، بێگوناهی چاکان و درۆ مەزنانەکانی ئەوان!

بە راستی، گەلێک بە شوێن راستییەوە بە دوای ئەو دا رۆیشتووم، بەڵام ئەو



پێی لە سەرم ناوە. جارجار پێم وابوە کە درۆ دەکەم: بڕوانە! دروست ئەودەمە بوە کە ـ تووشی راستی بووم!

گەلێک شتم بۆ روون بۆتەوە: نووکە ئیدی من کارم بەوانە نیە. ئیدی شتێک نیە کە من خۆشم بوێ ـ کەوایە چۆن دەتوانم خۆم خۆش بوێ؟

ئەوەی کە من دەمەوێ بە مەیلی خۆ ژیانە یا نەژیانە: پیرۆزترین کەسیش ژیانی وەها دەوێ. بەڵام، مخابن! ئیدی چۆن من ـ مەیلێکم هەیە؟

ئایا من ـ هێشتا ئامانجێکم هەیە؟ یا لەنگەرگایەک کە باسپێرەکەم بەرەو ئەو لە ڕێ دا بێ؟

یا بایەکی باش؟ ئاخ، تەنیا ئەو کەسەی کە دەزانێ بەرەو کوێ دەڕوا دەزانێ کە کام با بۆ ئەو باشە و بای سەفەرە.

ئیدی چم بۆ ماوەتەوە؟ دڵێکی ماندوو و بێشەرم، ویستێکی بێقەرار، باڵگەلێکی بە باڵەفڕکە، بڕبڕە پشتێکی شکاو.

و ئەم گەڕانە لە ماڵی خۆ: زەردەشت، تۆ دەزانی کە تەواوی هەوڵ و کۆششی من هەر ئەم **لە ماڵ گەڕانە بوە** و ئەمەیە کە من دەخوا.

لە کوێیە ـ ماڵی من؟ لێیدەپرسم و لێیدەگەڕێم و لێیگەڕاوم بەڵام نەمدیتۆتەوە. ئاخ، ئەی گشت جێی هەرمان! ئەی هیچ جێی هەرمان، ئەی پووچی هەرمان!»

وەهای گوت سێبەر و سیمای زەردەشت لە قسەکانی داچۆڕاو و لە ئاکام غەمین گوتی: «تۆ سێبەری منی؟

مەترسییەک کە لە بۆسەی تۆ دایە کەم نیە، ئەی ئازادە گیانی ئاوارە، رۆژێکی خراپت هەبوە، وریا بە کە شەوێکی خراپیشت لە پێش دا نەبێ!

بۆ بێئامانجانێکی وەک تۆ، زیندانیش لە ئاکام دا بەختەوەرییەکە. دیتووتە کە جەنایەتکارەکانی زیندانی چلۆن دەخەون؟ ئاسوودە دەخەون و لە هێمنایەتی تازەی خۆیان لەزەت دەبەن.

وریا بە کە لە ئاکام لە بەندی ئیمانێکی تەنگەبەر نەکەوی ـ لە بەندی بێئیمانییەکی رەق و قایم! چونکە لەمە بە دوا ئەوەی کە تەنگەبەر و قایمە تۆ فریو دەدا و وسوەسەت دەکا.

تۆ ئامانجت بزر کردوە: مخابن، تۆ چلۆن تاقەتی ئەم زیانە دەگری و چارەی دەکەی؟ بەم کارە ـ تۆ ڕێگاشت بزر کردوە!

تۆ ئەی سەرلێشێواوی بەستەزمان، ئەی ئاواتەخواز، ئەی پەپوولەی شەکەت! دەتەوێ کە ئێمشەو حەسانەوە و حەساوگەیەکت هەبێ؟ کەوایە بچوە ئەشکەوتی من!

ئەو ڕێگایە دەچێتە ئەشکەوتەکەی من! من نووکە دەمەوێ بەلەز جارێکی دیکە لەبەرت رابکەم. نووکە ئەوە وەک سێبەرێک کەوتۆتە سەرم.

دەمەوێ تەنیا رابکەم هەتا ئاقارم جارێکی دی ڕووناک بێتەوە و بۆ ئەم مەبەستە دەبێ درەنگ ماوەیەک بە خۆشییەوە بە پێوە بوەستم. بەڵام شەوێ لای من ـ دەیکەینە سەما!»

وەهای گوت زەردەشت.

## دەمەو نیوەڕۆ

زەردەشت ڕۆیشت و ڕۆیشت و کەسی دیکەی نەدیت و تەنیا بوو پەیتا پەیتا خۆی دەدیتەوە و چێژی لە تەنیایی خۆی وەرگرت و ئەوی قوم قومە خواردەوە و سەعاتگەلێک بیری لە شتی خۆش کردەوە. بەڵام دەمەو نیوەڕۆ، کاتێک هەتاو دروست لە بان سەری زەردەشت وەستا، گەیشتە پیرەدارێکی خوار و خێچ و ریشاژۆ کە ئەوینی دارەمێوێکی بەبەر ئەوی لە هەمێز گرتبوو و لە خۆشی شاردرابۆوە: و لەو دارە گەلێک ترێی زەرد لە بەرابەر ئاوارە هەڵواسرابوون. ئەوسا مەیلکێکی، بۆ دامرکاندنی تینوایەتی کەمی خۆی و ترێ لێکردنەوە دیت: بەڵام کاتێک دەستی بۆ درێژ کرد مەیلێکی پتر بۆ شتێکی دیکەی لە خۆ دا دیت: یانی، راکشان لە بن دار و خەوتن لە جەنگەی نیوەڕۆ دا.

وەهای کرد زەردەشت و کاتێک لە سەر زەوی، لە بێدەنگی رازداری شیناوەردە رەنگینەکان دا درێژ بوو، تینوایەتی کەمی خۆی لە بیر کرد و خەوی لێکەوت. چونکە هەروەکی پەند و مەتەڵەکانی زەردەشت دەڵێ: «یەک شت پێویستترە لە شتەکانی دیکە.» ئەو تەنیا چاوەکانی کرابوونەوە ـ چونکە لە دیدار و پەسنی دار و ئەوینی دارەمێو تێر نەدەبوو. بەڵام، زەردەشت لە جەنگەی خەوتن



دا وەهای بە دڵی خۆی گوت:

ئارام! ئارام! ئایا هەنووکە دونیا کامل نەبوە؟ چم بە سەر دێ؟

خەو مینا بایەکی نەرم کە بە نادیاری لە سەر دەریای زیت سەما دەکا، سووک، سووک هەروەک پەڕ، سەمام بۆ دەکا.

چاوکانم ناقووچێنێ و رەوانم بەئاگا دێڵێتەوە. سووکە ئەو، بە راستی، سووک هەروەک پەڕ.

ئەو فریوم دەدا، نازانم چۆن. بە دەستە لاوێنەرەکانی لە دەروونەوە من دەلاوێنێتەوە، ناچارم دەکا، ئادی، من ناچار دەکا تا رەوانم خۆی لەبەر یەک بکێشێتەوە.

چەندە ماندوو و شەکەتە رەوانە سەیرەکەی من! ئایا شەوی حەوتەمین ڕۆژی دەمەو نیوەڕۆ بە سەر ئەو داهاتوە؟ ئایا ماوەیەکی زۆر بە شادییەوە لە نێو شتە باش و گەیشتووکان گەڕاوە؟

ئەو بۆ خۆی درێژ دەبێ، درێژ ـ درێژتر! ئارام دەگرێ، رەوانە سەیرەکەی من! ئەو گەلێک شتی باشی چێژتوە، ئەم غەمە زێڕنە پێوەی دەدا و ئەو لێوەکانی هەڵدەقرچێنێ.

وەک کەشتییەک کە بەرەو کەنداوی ئارامی خۆی دەڕوا ـ نووکە ماندوو لە سەفرە دوور و درێژەکان و دەریا نەناسراوەکان، لە ئاست ویشکایی دا سەری دادەنەوێنێ و بەرزی دەکاتەوە. مەگەر ویشکایی ئەمەگدارتر نیە؟

کەشتییەک کە وەها بە ویشکاییەوە بنووسێ و پەنا بۆ ئامێزی بەرێ، بۆ ئەو هەر ئەوە بەسە کە جاڵجاڵۆکەیەک لە ویشکاییەوە تەونۆکەی خۆی لێبتەنێ: پێویست بە پەتێکی قایم ناکا.

منیش، وەک ئەم کەشتی ماندوویە لە ئارامترین کەنداو، نووکە لە پەنا زەوی دەحەسێمەوە، ئەمەگدار، بە ورە، چاوەڕوان، بە ناسکترین هەودای لێبەستراو.

ئەی بەختیاری! ئەی بەختیاری! ناتەوێ گۆرانی بڵێی، ئەی رەوانی من؟ تۆ لە سەر چیمەن درێژ بووی. بەڵام ئەمە ئەو کاتە بە راز و رەمزیە کە هیچ شوانێک بلوێری تێدا ناژەنێ.

وریا بە! نیوەڕۆی گەرم لە سەر مێرغوزارەکان خەوتوە. مەیڵێ! ئارام! دونیا کامل بوە.

مەخوێنە، ئەی مەلی مێرگ، ئەی ڕەوانی من! ورتەش مەکە! بڕوانە، ئارام! نیوەڕۆی پیر خەوتوە، زاری دەجووڵێنێتەوە: مەگەر هەر ئێستا دڵۆپێک بەختیاری ناخواتەوە؟ ـ

ـ دڵۆپێکی کۆنی قاوەیی لە بەختیاری زێڕن، لە شەڕابی زێڕن؟ ئەو دڵۆپە سەراسەری لەشی دادەگرێ، بەختیارییەکەی پێدەکەنێ. خودایەک وەها پێدەکەنێ. ئارام!

«بەختەوەرانە، نووکە شتێکی هەرە کەم بۆ بەختیاری بەسە!» ڕۆژێک وەهام گوت و خۆم پێ ژیر بوو. بەڵام نووکە وەها فێر بووم کە ئەو قسەیە کفر بوو، شێتە ژیرەکان باشتر قسە دەکەن.

دروست هەرە کەم، هەرە نەرم، شتی هەرە سووک، خشەخشی مارمێلکەیەک، پشوویەک، شنەیەک، چاوترووکانێکی کەمە کە **باشترین** چەشنی بەختیاری پێک دێنێ. ئارام!

ـ چم بە سەر هات؟ گوێ هەڵخە! زەمان هەڵنافڕێ؟ ئایا تێناکەوم؟ ئایا تێنەکەوتووم؟ ـ گوێ هەڵخە! لە چاڵاوی هەرمانەتی.

ـ چم بە سەر دێ؟ ئارام! پێوەم دەدرێ ـ هاوار ـ بە دڵەوە؟ بە دڵەوە! ئاخ، بشکێ، بشکێ، ئەی دڵ، لە وەها بەختیارییەک، لە وەها پێوەدانێک!

چی؟ دونیا هەر ئێستاکە کامل نەبوە؟ خڕ و گەیشتوو؟ ئاخ، ئەو زێڕن خڕەی گەیشتوو ـ بۆ کوێ رادەکا؟ بە دوای دا رادەکەم! زووکە!

ئارام ـ (لێرە دا زەردەشت خۆی لەبەر یەک کێشاوە و هەستی کرد کە لە خەو دابوە.)

بە خۆی گوت: «هەستە! ئەی خەواڵوو! ئەی نیوەڕۆ ـ خەوتوو! بڕوانن! ڕاپەڕن! لاقە پیرەکان! کاتە و درەنگ. هێشتا ڕێگایەکی دوورتان لەبەرە.

ئێوە تێر خەو بوون ـ چەند؟ نیوە هەرمانەتییەک! زۆر باشە، ڕاپەڕە دڵی پیرم! دوای وەها خەوێک چەندە دەخایەنێ ـ کە خۆت وە ئاگا بێنی؟»



(بەڵام دیسان خەوتەوە و ڕەوانی دەگەڵی بە کێشە هات و بەرەنگاریی کرد و دیسان درێژ بۆوە. ـ «لێمگەڕێ! ئارام! ئایا نووکە دونیا کامل نەبوە؟ ئاخ، ئەی گۆی زێڕنی خڕ!»

زەردەشت گوتی: «هەستە، ئەی دەڵە دزی چووکەڵە! ئەی کات دز! چی؟ هێشتا خۆت لەبەریەک دەکێشیەوە؟ باوێشکان دەدەی؟ ئاخ هەڵدەکێشی؟ دە چاڵاوە قووڵەکان دەکەوی؟

تۆ کێی؟ ئەی ڕەوانی من!» (لەو کاتە دا راچڵەکا، چونکە تیشکێکی هەتاو لە ئاسمانەوە وە چاوی کەوت.)

ئەو بە ئاخ هەڵکێشان ڕاست دانیشت و گوتی: «ئەی ئاسمان کە لە بان سەری منی! ئایا دەڕوانیە من: ئایا گوێ لە ڕەوانی سەیرم هەڵدەخەی؟

کەی ئەم دڵۆپە ئاونگە دەخۆیەوە کە کەوتۆتە سەر گشت شتەکانی زەوینی، کەی ئەم ڕەوانە سەیرەم دەخۆیەوە؟

کەی؟ ئەی چاڵاوی هەرمانەتی! ئەی هەڵدێری بە شۆق و بە سامی نیوەڕۆ! کەی ڕەوانی من دیسان لە خۆت دا دەخۆیەوە؟»

وەهای گوت زەردەشت و لە سەر جێی خۆی لە ژێر دار وەها هەستا کە دەتگوت لە مەستییەکی غەریب هەستاوەتەوە؛ بڕوانە، کە هەتاو هێشتا هەر دروست لە بان سەری ئەو وەستابوو و ئەمە بە ڕێکی دەکرێ وەها ئاکامی لێوەرگری کە زەردەشت هێندە نەخەوتبوو.

## بەخێر هێنان

درەنگانێک لە نیوەڕۆ تێپەڕیبوو کە زەردەشت دوای گەڕان و خولانەوەیەکی بێسوود گەڕاوە ئەشکەوتی خۆی. بەڵام کە گەیشتە بەرابەری، نزیک بیست هەنگاویی ئەشکەوتەکەی، شتێک قەوما کە کەمتر چاوەڕوانی دەکرد: ئەو سەر لە نوێ هاواری هانایەکی بەرزی گەیشتە گوێ و سەیر ئەوە بوو کە ئەمجارە هاوار لە ئەشکەوتەکەیەوە هات. بەڵام هاوارێکی درێژ و توێ توێ و سەیر بوو و زەردەشت بە ئاشکرا بۆی دەرکەوت کە لە دەنگێکی زۆر تێکەڵاو پێک هاتوە کە ئەگەر لە دوورەوە ببیسرێ وەک زایەڵەی هاوارێکە لە زارێکەوە.

ئەوسا زەردەشت بۆ لای ئەشکەوتەکەی بازی دا، بڕوانە! دوای ئەو نمایشی دەنگە چ دیمەنێکی شیاوی تەماشا چاوەڕێی بوو! چونکە تەواوی ئەوانەی کە لە ماوەی رۆژ دا بە پەنایان دا تێپەڕیبوو لەوێ لە پەنا یەک دانیشتبوون: پاشای دەستی راست، پاشای دەستی چەپ، جادووگەری پیر، پاپ، گەدای خۆویست، سێبەر، خاوەنی گیانی بە ویژدان، پێشگۆی غەمین، و گوێدرێژ، بەڵام ناحەزترین مرۆڤ تاجێکی لە سەر نابوو و دوو پشتبەندی ئەرخەوانی لە خۆ بەستبوو ـ چونکە ئەویش، هەروەک گشت ناحەزەکان، پێیخۆش بووکە خۆی بە جلی گۆڕاو داپۆشێ و جوان بنوێنێ. بەڵام لە نێو ئەم کۆڕە خەفەتبارە دا هەڵۆی زەردەشت وەستابوو، زیت و نائارام، چونکە دەبا وڵامی گەلێک شتی داباوە کە غرووڕەکەی وڵامێکی بۆ نەبوون؛ و ماری ژیر لە دەوری ملی هاڵابوو.

زەردەشت بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە روانییە هەموویان، لە دوایی یەکەیەکەی میوانەکانی بە پرساییەکی دۆستانەوە هەڵسەنگاند و دەروونی خوێندنەوە و دیسان سەری سوڕماوە. لەو بەینە دا دانیشتوانی کۆڕ لە سەر جێگای خۆیان هەستان و بە رێزەوە چاوەڕوان مانەوە کە زەردەشت قسە بکا. بەڵام، زەردەشت وەهای گوت:

«ئەی هیوابڕاوەکان، ئەی سەیر و سەمەرەکان! ئەمە هاواری هانای **ئێوە** بوو کە دەمبیست؟ نووکە دەزانم کە دەبێ لە کوێ لێی بگەڕێم لەوەی کە ئیمڕۆ بێخۆ لێیدەگەڕام: مەبەستم مرۆڤی بالاترە ـ

ئەو مرۆڤە بالاترە خۆی لە ئەشکەوتی من دانیشتوە! بەڵام بۆ پێم سەیرە؟ مەگەر من خۆم ئەوم بە بەخت کردنی هەنگوین و دەنگی فریودەری بەختیاری خۆ، بۆ لای خۆم رانەکێشا؟

بەڵام بە بڕوای من، ئێوە بۆ کۆڕ دانان نابن. ئێوە بە هاواری هاناخوازی، کاتێک لێرە لای یەک دانیشن، دڵەکانی یەکدی دەشەمزێنن. کەوایە لە پێشدا دەبێ کەسێک بێ ـ

کەسێک کە جارێکی دی ئێوە وەپێکەنین بخا، ویشکەڕنێکی شەنگ و شاد، سەماکەرێک و بایەک و منداڵێکی بەدفەڕ، شێتێکی پیر. چلۆنە؟

بەڵام ئەی هیوابڕاوەکان، بمبوورن کە دەگەڵ ئێوە بەم وشە سووکانە قسە



دەکەم، کە بە راستی شیاوی میوانگەلێکی وەک ئێوە نیە! بەڵام ئێوە نازانن کە چ شتێک دڵی من بێباک دەکا ـ

ئەوە ئێوەن و دیمەنی ئێوە، من ببوورن! چونکە بەرەوڕوو بوون دەگەڵ هیوابڕاوێک هەر کەسێک بوێر دەکا. بۆ دڵگەرم کردنی هیوابڕاوێک ـ هەرکەسێک ئەوەند کە پێویستە خۆی بە هێز نیشان دەدا.

ئێوە خۆتان ئەم هێزەتان وەبەر من نا ـ چ دیارییەکی بە نرخ، میوانە هێژاکانی من! دیارییەکی بە نرخی میوانانە! کەوایە لە من تووڕە مەبن ئەگەر منیش شتێکی خۆم پێشکەشی ئێوە بکەم.

ئێرە هەرێم و مەڵبەندی منە: بەڵام ئەوەی کە هی منە بۆ ئەم ئێوارە و ئەم شەوە هی ئێوە دەبێ. گیاندارەکانم خزمەتی ئێوە دەکەن: ئەشکەوتەکەم حەساوگەی ئێوە بێ!

لە ماڵی من نابێ چ کەس هیوابڕاو بێ. من لە مەڵبەندی خۆم هەر کەسێک لە گیاندارە دڕەکان دەپارێزم. ئەمەیە یەکەم شتێک کە پێشکەشی ئێوەی دەکەم: هێمنایەتی!

بەڵام دوهەمین، ئەنگوستی چووکەی منە. کاتێک ئەوتان هەبوو دەستیشم بە تەواوەتی بەرن، و ئەوسا دڵم! بۆ ئێرە بە خێرێن، بە خێرێن، ئاواڵەمیوانەکانم!»

وەهای گوت زەردەشت و لە خۆشەویستیان و لە بەدخوازیان پێکەنی. دوای ئەم بە خێر هێنانە، میوانەکانی جارێکی دی سەریان دانواند و بە رێزەوە بێدەنگ بوون. بەڵام پاشای دەستی راست لە لایەن ئەوانەوە وەهای وڵامی ئەوی داوە:

«ئەی زەردەشت، لە شێوەی پێشکەش کردنی دەست و سڵاو کردنی تۆیە کە ئێمە تۆ بە زەردەشت دەناسین. تۆ خۆت لە حاند ئێمە چووک کردەوە، تۆ تەنانەت ئەو حورمەتەی کە لە چاوی ئێمە دا هەتبوو، شکاندت:

بەڵام کێ دەتوانێ وەک تۆ بە وەها غرووڕێک خۆی چووک کاتەوە؟ هەر ئەوە خۆی ئێمە هەڵدەکێشێ و چاو و دڵمان تازە دەکاتەوە.

ئێمە تەنیا بۆ دیتنی ئەوەش کە بوە کێوەکانی بەرزتر لەوەش بە دڵخۆشییەوە دەبڕین چونکە ئێمە وەک تامەزرۆیانی تەماشا هاتبووین و دەمانەویست ئەوەی

که چاوی تاریک، روون دەکاتەوە، ببینین.

بڕوانە کە نووکە تەواوی هاواری هانای ئێمە کۆتایی پێهاتوە. نووکە ئاوەز و دڵەکانمان فرەوان بوونەوە و شاد بوون. چی وای نەماوە کە بوێری پێشوومان ببێتە بێباکی.

ئەی زەردەشت، لە سەر زەوی شتێک شادیهێنەرتر لە ویستی سەربەرز و بە هێز نارِسکێ؛ ئەمە جوانترین رسکاوی زەوییە. وەها دارێک نموود بە تەواوەتی دیمەنێک دەدا.

ئەی زەردەشت، من ئەو کەسەی کە وەک تۆ هەڵدەدا، بە سنەوبەری دەشوبهێنم: بڵند، بێدەنگ، پتەو، تەنیا، خاوەن باشترین و نەرمترین چێو، بە شکۆ ـ

بەڵام لە ئاکام بە لکە سەوزە بە هێزەکانی دەست بە سەر هەرێمی خۆی دادەگرێ و لە با و تۆفان و ئەوەی کە ماڵی لە بەرزایی هەیە، پرسیاری بەهێز دەکا ـ

و وڵامی بەهێزتر دەداتەوە، هەروەک فەرماندەیەک و سەرکەتوویەک: ئاخ، کێ بۆ دیتنی وەها دارگەلێک کێوە بەرزەکان نابڕێ!

لێرە داری تۆ، ئەی زەردەشت، دڵ ژاکاوەکان و بێدەرەتانەکانیش دەبووژێنێتەوە. بە دیتنی تۆ پیاوی بێئۆقرەش ئارام دەگرێ و دڵی چاک دەبێتەوە.

بە راستی، ئیمڕۆ گەلێک چاویان لە کێو و داری تۆ بڕیوە. تاسەیەکی گەورە سەری هەڵداوە و گەلێک فێر بوون کە بپرسن: زەردەشت کێیە؟

هەر کەسێک کە تۆ بۆ جارێک ستران و شیلەی خۆت لە گوێی تکاندبێ: یانی، گشت شاراوەکان، تەنیاکان و جووتەکان، جارێک بە دڵی خۆیان گوتوە:

«ئایا زەردەشت هێشتا هەر زیندوویە؟ ژیانەکانی دیکە بۆ ژیان ناشێن، هەموو شت وەک یەکە، هەموو شت بێسوودە: مەگەر ئەوە کە ـ ئێمە دەگەڵ زەردەشت بژین!»

گەلێک دەپرسن: «ئەی بۆچ ئەوەی کە دەمێکە سەرهەڵدانی خۆی راگەیاندوە نایە؟ ئایا تەنیایی قووتی داوە؟ یا ئەوە کە ئێمە دەبێ بۆ لای ئەو بچین.»



نووکە وای لێهاتوە کە تان و پۆی تەنیاییش خۆی شل بۆتەوە و لێک هەڵدەوەشێتەوە، وەک گۆڕێک کە لێک بڵاو بێ و نەتوانی مردووی خۆی راگرێ. لە گشت جێ راپەڕیوەکان دەبیندرێن.

ئەی زەردەشت، نووکە شەپۆلەکان لە دەوری کێوەکەت هەڵدەکشێن و هەڵدەکشێن و بەرزایی تۆ هەرچەند بێ، دیسان دەبێ گەلێک بۆ لات هەڵکشێن. گەمێیەکەت نابێ لەمە پتر لە سەر ویشکایی بمێنێتەوە.

ئەوە کە ئێمە هیوابڕاوەکان هاتووینە نێو ئەشکەوتی تۆ و ئێستا ئیدی هیوابڕاو نین، ئەمە تەنیا نیشانە و عەلامەتێکە لەوە کە کەسانێکی لە ئێمە باشتر بەرەو تۆ بەڕێوەن ـ

چونکە ئەوەی کە خۆی بۆ لای تۆ بەڕێوەیە: دوایین پاشماوەی خودا دە نێو مرۆڤ دا، یانی مرۆڤی تاسەی گەورە، بێزی گەورە، هێڵنجی گەورە ـ

ئەوانەی کە نایەنەوێ بژین، مەگەر ئەوە کە جارێکی دی **هیوا**ی هەبوون فێر بن ـ یا ئەوە کە هیوای گەورە لە تۆ فێر بن، ئەی زەردەشت!»

وەهای گوت پاشای دەستی راست و دەستی زەردەشتی گرت هەتا رایمووسێ. بەڵام زەردەشت لە ئاست حورمەت دانانی ئەو بەرەنگاری کرد و راچڵەکاو و بێدەنگ، کشاوە دواوە و لەپڕ وەهای لێهات کە دەتگوت بۆ دوورەدەستان رادەکا. بەڵام ماوەیەک دوای ئەمە دیسان لە لای میوانەکانی بوو و بە چاوی روون و تاقی کردنەوە ئەوانی هەڵدەسەنگاند. لە دوایی گوتی:

«میوانەکانی من، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان! دەمەوێ دەگەڵ ئێوە بە ئاڵمانی و بە زمانێکی روون قسە بکەم. من لەم کوێستانە چاوەڕێی **ئێوە** نەبووم.»

(لێرە پاشای دەستی چەپ لە پەڕاوێز دا گوتی: «ئاڵمانی و بە زمانێکی روون؟ پەنا بۆ خودا! دیارە ئەم زانا رۆژهەڵاتییە ئاڵمانی بەڕێزەکان ناناسێ!

«لەوانەیە مەبەستی «ئاڵمانی و عەوامانە» بێ ـ زۆر باشە! ئەم کارە ئەم رۆژانە هێندە ناحەز نیە!»)

زەردەشت درێژەی پێدا: «لە سەر یەک لەوانەیە کە ئێوە بە راستی مرۆڤگەلێکی باڵاتر بن. بەڵام بۆ من ئەوەند کە پێویستە باڵاتر و بە هێز نین.

بۆ من، یانی: بۆ لاسارییەک کە لە من دا بێدەنگ ماوەتەوە، بەڵام هەمیشە بێدەنگ نامێنێتەوە. ئەگەر ئێوە هی منیش بن، ناتوانم ئێوە وەک دەستی راستیشم دابنێم.

چونکە ئەو کەسەی کە وەک ئێوە لە سەر لاقە نەخۆش و لاوازەکانی دەوەستێ، بەر لە هەر شتێک، چ خۆی بزانێ و چ لە خۆی بشارێتەوە، داخوازی **لاواندنەوەیە**.

بەڵام من دەست و پێیەکانی خۆم نالاوێنمەوە. من **شەرکەرانی خۆم نالاوێنمەوە**: کەوایە ئێوە کوا بە کاری جەنگی **من** دێن؟

من دەگەڵ ئێوە هەر سەرکەوتنێکی خۆم دەفەوتێنم و هەندێک لە ئێوە هەر گرمەی دەهۆڵەکانی من ببیسن، لە هۆش دەچن.

ئێوە بۆ من نە هێندەی کە پێویستە جوانن و نە شەریف. من بۆ ئامۆتەکانی خۆم پێویستم بە ئاوێنەگەلێکی خاوێن و ساف هەیە. لە سەر رووی ئێوە وێنەی منیش خوار دەدیترێ.

چ بارگەلێک، چ یادگەلێک کە لە سەر شانی ئێوە قورسایی دەکا! هەندێک گورنی چارەڕەش لە سووچەکانی ئێوە دا هەڵکورماون! لە ئێوەش دا عەوامێکی شاراوە هەیە.

ئەگەر ئێوە باڵا بن و لە چەشنێکی باڵاتر: گەلێک شت لە ئێوە دا خواروخێچ و ناڕێکە. لە دونیا دا ئاسنگەرێک نیە کە بتوانێ ئێوە بکوتێ و بۆ منتان راست و دروست بکاتەوە.

ئێوە تەنیا پردگەلێکن: بڵا کەسانی لە ئێوە باڵاتر بە سەر ئێوە دا تێپەڕن! ئێوە هەروەک پلیکانن: کەوایە لەو کەسە تووڕە مەبن کە بە سەر ئێوە دا بەرەو بەرزایی خۆی سەردەکەوێ!

بەشکەم لە تۆمی ئێوە کوڕێکی رەسەن و میراتبەرێکی کامل بۆ من بڕسکێ: بەڵام ئەمە دوورە. ئێوە خۆتان لەوانە نین کە ناو و میراتی من هی ئەوانە.

من بە شوێن ئێوەوە نیە کە لەم کوێستانە چاوەڕێم و دەگەڵ ئێوە نیە کە بۆ دوایین جار دەچمە خوار. ئێوە تەنیا هەروەک نیشانەیەک هاتوونە لای من کە لە



ئێوە باڵاترانێک بۆ لای من بەڕێوەن ـ

ـ نە خەڵکی تاسەی گەورە، بێزی گەورە، هێڵنجی گەورە و ئەوەی کە ئێوە بە پاشماوەی خوداتان ناو برد.

نا! نا! دیسان نا! من لێرە، لەم کوێستانە، چاوەڕێی **کەسانێکی دیکە** دەکەم و بێ ئەوان پێ لەم شوێنە نانێمە دەر.

چاوەڕێی کەسانێکی باڵاتر، بەهێزتر، سەرکەوتووتر، شادتر، کەسانێک بە لەش و رەوانێکی رێک: **شێری دەم بە پێکەنین** دەبێ بێ!

میوانەکانی من، ئەی سەیر و سەمەرەکان! هێشتا شتێکتان لەمەڕ منداڵەکانی من نەبیستوە! و لەوە کە بەرەو من بەڕێوەن؟

دەگەڵ من لە باغەکانم بدوێن، لە دورگەکانی بەختەوەری، لە رەگەزی جوانی تازەی من ـ بۆچی دەگەڵ من لەوانە نادوێن؟

من لە ئەوینی ئێوە ئەم دیارییە میوانانە داوا دەکەم کە دەگەڵ من لە منداڵەکانم بدوێن. من لەوە دەوڵەمەندم و بۆ ئەمە دەستبەتاڵ بووم.

من چیم نەداوە، من چ نادەم هەتا ئەم یەکەم هەبێ: ئەم منداڵانە، ئەم مووچە زیندوویە، ئەم دارە ژیانانەی ویست و سەرترین هیوام!»

وەهای گوت زەردەشت و لەپڕ لە نیوەی قسەکەی دا وەستا: چونکە تاسەباریی دایگرت و لە تاو خورپەی دڵی چاو و زاری بەست؛ میوانەکانیش هەموو بێدەنگ بوون و هەراسان بێدەنگ وەستابوون و تەنیا پێشگۆی پیر بوو کە بە دەستەکان و سیمای خۆی ئیشارەگەلێکی دەکرد.

## چێشتی شێو

لێرە دا پێشگۆ بەخێر هێنانی زەردەشت و میوانەکانی بڕی و وەک کەسێک کە ئیدی دەرفەتێکی بۆ نەمابێتەوە خۆی وەپێش دا و دەستی زەردەشتی گرت و هاواری کرد:

«بەڵام زەردەشت! تۆ خۆت گوتووتە کە یەک شت پێویستترە لە شتێکی دیکە:

زۆر باشە، نووکە یەک شت بۆ من لە هەر شتێکی دیکە پێویستترە.

قسەیەکی زۆر بە جێیە: مەگەر تۆ منت بۆ **شێو** بانگ نەکردوە؟ لێرە گەلێک کەس هەن کە ڕێگایەکی درێژیان بڕیوە. بێشک تۆ ناتەوێ کە بە قسە تێریان بکەی؟

هەروەتر ئێوە گشتتان، بە بڕوای من، پتر لەوەی کە پێویستە لەمەڕ ژاکان، خنکان، نوقم بوون و لە چەشنەکانی دیکەی مەترسی بۆ لەش بیرتان کردۆتەوە، بەڵام هیچکام لە ئێوە بیرتان لە وەزعی پڕ مەترسی **من** نەکردۆتەوە، یانی لە برسان مردن ـ»

وەهای گوت پێشگۆ؛ بەڵام کاتێک گیاندارەکانی زەردەشت ئەم قسانەیان بیست لە ترسان ڕایانکرد. چونکە دیتیان ئەوەی کە بە ڕۆژ هێناویانەتەوە ماڵ بەشی پڕ کردنی زگی ئەم پێشگۆیە ناکا.

پێشگۆ درێژەی پێدا: «و لە تینوان مردن؛ هەرچەند کە لێرە شۆڕەشۆڕی ئاو دەبیسترێ کە هەروەک قسەکانی فرەزانییە، یانی تژی و نەوەستاو: بەڵام من ـ **شەڕابم** دەوێ!

هەموو کەس وەک زەردەشت زگماگ ئاوخۆرەوە نیە: ئاو کوا بە کەلکی شەکەتی ژاکاو دێ؟ ئێمە شەڕابمان دەوێ ـ کە دەستبەجێ شەفا و سلامەتی دەبەخشێ!»

بەڵام لەم بەینە دا کە پێشگۆ داوای شەڕابی دەکرد، وەها ڕێکەوت کە پاشای دەستی چەپ، ئەو پیاوە بێدەنگە، لەپڕ وە زمان هات و گوتی: «ئێمە بیری شەڕابمان کردۆتەوە ـ من و براکەم، پاشای دەستی ڕاست: ئێمە بە ڕادەی پیویست شەڕابمان پێیە، بارەکەرێک. کەوایە لە چمان کەم نیە، جگە لە نان.»

زەردەشت بە پێکەنینەوە گوتی: «نان؟ نان هەر ئەو شتەیە کە خەڵوەنشینان نیانە. بەڵام مرۆڤ هەر تەنیا بە نان زیندوو نیە، بەڵکە بە گۆشتی بەرخی باشیش، کە من لەوان دووم هەن:

ـ ئەوانە زوو سەر ببڕن و بەهاراتی پێداکەن و بیکوڵێنن: من وەهام پێخۆشە. لە ریشە و میوەش چمان کەم نیە و ئەوەندەمان هەیە کە بەشی نەوسنەکان و خۆشخۆراکەکان بکا؛ هەروەتر فندق و شتە سەر بەستراوەکانی دی بۆ شکاندن.



کەوایە بە زوویی شێوێکی باشمان دەبێ. بەڵام هەر کەسێک دەیەوێ لە خواردن دا شەریک بێ دەبێ دەست هەڵێنێ، تەنانەت پاشاکانیش: چونکە لای زەردەشت پاشاکانیش دەتوانن چێشت لێنەر بن.»

گشتیان لە قووڵایی دڵەوە ئەم پێشنیارەیان قەبووڵ کرد، جگە لە گەدای خۆویست کە دژایەتی دەگەڵ گۆشت و شەڕاب و بەهارات هەبوو.

ئەو بە گاڵتە گوتی: «گوێ لە قسەی زەردەشتی زگپەرست بگرن! ئایا کەس دەچێتە ئەشکەوت و کێوە بەرزەکان هەتا وەها شێوێک ساز بکا!

من نووکە بە دروستی مانای ئەم قسەیە دەزانم کە ڕۆژێک فێری ئێمەی کرد: «بژی هەندێک دەستبەتاڵی!» هەروەتر ئەوە کە بۆچی دەتانەوێ گەداکان لە ئارا دا نەمێنن.»

زەردەشت وڵامی ئەوی داوە: «خۆش و شاد بە هەروەکی کە من هەم. بە خوو و خدەی خۆت بژی، ئەی بەڕێز؛ ئەگەر پێت خۆشە دانەوێڵەی خۆت بهاڕە، ئاوی خۆت بخۆوە، بە دەستاوی خۆت هەڵبلێ!

من تەنیا بۆ ئەو کەسانە قانوونم، کە لە منن، نە بۆ گشت کەس. بەڵام ئەوەی کە لە منە دەبێ ئێسک قایم و سووک پێ بێ ـ

شاد بۆ جەنگ هەروەک جەژن، نە ماتەمدار و نە خەیاڵخواز، بۆ دژوارترین کار وەها قۆڵی هەڵماڵێ هەر وەک بلێی بۆ جەژنی خۆی بێ، ساغ و رووگەش.

باشترین شت هی منە و هی ئەوانەی کە لە منن: ئەگەر ئەوان نەدەن بە ئێمە، ئێمە دەیستێنین: باشترین چێشت، پاکترین ئاسمان، بە هێزترین بڕواکان، جوانترین ژنەکان.»

وەهای گوت زەردەشت؛ بەڵام پاشای دەستی ڕاست وڵامی داوە: «سەیرە! قەت شتێکی وەها ژیرانە لە زاری زانایەکەوە بیستراوە؟

بە ڕاستی، سەیرترین شت لە زانایەک دا هەر ئەمەیە کە ژیر بێ و کەر نەبێ.»

وەهای گوت پاشای دەستی ڕاست و سەری سوڕما؛ بەڵام کەر بە دوای قسەی ئەو دا شەیتانانە گوتی: «ئا ـ ئا». بەڵام ئەمە سەرەتای ئەو شێو خواردنە درێژە بوو کە لە کتێبە مێژووییەکان دا بە «چێشتی شێو» ناودێر کراوە و لەم

بەینە دا جگە لە مرۆڤی باڵاتر نەبێ باسی هیچ شتێکی دیکە نەکرا.

## سەبارەت بە مرۆڤی باڵاتر

### ١

کە بۆ یەکەم جار بۆ لای مرۆڤ هاتم، تووشی گەوجایەتی خەڵوەنشینەکان هاتم، گەوجایەتی گەورە: من خۆم لە بازاڕ دانا.

کاتێک دەگەڵ گشتیان قسەم کرد، دەگەڵ هیچکەس قسەم نەکرد: بەڵام تاریکانان تەنیا پەتبازەکان هاودەمم بوون و کەلاکەکان و من خۆشم وەک کەلاکێک بووم.

بەڵام لە کازیوەیەکی نوێ دا راستەقینەیەکی نوێ رووی تێکردم؛ ئەودەم فێر بووم کە بڵێم: «من چ ئیشم بە بازاڕ و عەوام و هات و هەرای عەوام و گوێچکە درێژەکانی عەوام داوە!»

ئێوە، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، ئەمە لە من فێر بن: لە بازاڕ کەس ئیمانی بە مرۆڤی باڵاتر نیە و ئەگەر لەوێ دەتانەوێ قسە بکەن: سەرکەتوو بن! بەڵام عەوام چاو دادەگرێ کە: «ئێمە هەموومان بەرابەرین.»

عەوام وەها چاو دادەگرێ: «ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، مرۆڤێکی باڵاتر لە ئارا دا نیە. مرۆڤ مرۆڤە، لە ئاست خودا دا ئێمە هەموومان بەرابەرین!»

لە ئاست خودا دا! ـ بەڵام نووکە ئەم خودایە مردوە. ئێمە نامانەوێ لە ئاست عەوام دا بەرابەر بین. ئەی مرۆڤە باڵاترەکان لە بازاڕ بچنە دەر!

### ٢

لە ئاست خودا دا! ـ بەڵام نووکە ئەم خودایە مردوە! ئەی مرۆڤە باڵاترەکان،



ئەم خودایە گەورەترین مەترسی بۆ ئێوە بوو.

تەنیا ئەو دەمەی کە ئەو چوە نێو گۆڕەوە ئێوە جارێکی دی هەستانەوە. تەنیا نووکەیە کە نیوەڕۆی مەزن دادێ، تەنیا نووکەیە کە مرۆڤی باڵاتر ـ دەبێتە سەرۆک!

برایان، ئایا لە قسەکەم گەیشتن؟ ئایا ترساون؟ ئایا دڵەکانتان توشی سەرەگێژە بوە؟ ئایا لێرە هەڵدێر زاری بۆ داپچڕیون؟ سەگی دۆزەخ لێرە پێتان دەوەڕێ؟

ئەهای! راپەڕن، مرۆڤە باڵاترەکان! تەنیا نووکەیە کە کێوی داهاتووی مرۆڤ ژانی زان دەیگرێ. خودا مردوە: نووکە ئێمە دەمانەوێ کە بەرزەمرۆڤ بژی!

### ٣

نیگەرانترین کەسەکان ئیمڕۆ دەپرسن: «چلۆن دەکرێ مرۆڤ راگرن؟» بەڵام زەردەشت یەکەم و تەنیا کەسێکە کە دەپرسێ: «چلۆن دەکرێ بە سەر مرۆڤ دا **زاڵ بی**؟»

بەرزەمرۆڤ لە دڵی من دایە، **ئەو** یەکەمین و تەنیاکەسی منە ـ **نەک** مرۆڤ، نەک نزیکترین کەس، نەک هەژارترین کەس، نەک دەردەدارترین کەس، نەک باشترین کەس.

برایان، ئەوەی کە من دەتوانم لە مرۆڤ دا خۆشم بوێ ئەمەیە کە ئەو قۆناغێکە و ئاوا بوونێک. و لە ئێوە دا گەلێک شت هەن کە خۆشەویستی و هیوا لە من دا پێک دێنێ.

ئەمە کە ئێوە بە سووکتان داناوە، ئێوە مرۆڤە باڵاترەکان، ئەمە هیوام دەداتێ. چونکە بە سووک دانەرانی گەورە رێزدانەرانی گەورەن.

ئەمە کە ئێوە هیوابڕاو بوون، گەلێک شت لەم هیوابڕاوییە دا شیاوی رێز دانانە. چونکە ئێوە فێر نەبوون کە چلۆن خۆ تەسلیم بکەن، ئێوە زیرەکیی چووکەکان فێر نەبوون.

چونکە ئیمڕۆ خەڵکی بچووک بوونە سەرۆک و گشت تەسلیم و رەزا و زیرەکی

و ژیری و وردبینی و شتەکانی دیکەی ئاکارباشی بچووک موعیزە دەکەن.

ئەوەی کە لە رەگەزی ژنە، ئەوەی کە لە رەگەزی بەردەیە و بە تایبەت ئەوەی کە ئاژاوەی عەوامە: نووکە دویانەوێ ببنە سەرۆکی چارەنووسی مرۆڤ ـ ئاخ، بێز! بێز! بێز!

ئەمەیە کە دەپرسێ و دەپرسێ و لە پرسین ماندوو نابێ کە: مرۆڤ چۆن دەتوانێ خۆی بە باشترین، درێژترین، و پەسندترین چەشن راگرێ؟ بەمە ـ ئەوان سەرۆکەکانی ئێمرۆن.

برایان، بە سەر ئەم سەرۆکانەی ئێمرۆ دا زاڵ بن ـ بە سەر ئەم خەڵکە بچووکە دا: ئەمانە گەورەترین مەترسی بۆ بەرزەمرۆڤن!

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، بە سەر ئاکارباشییە بچووکەکان دا زاڵ بن، بە سەر زیرەکییە بچووکەکان دا، بە سەر حورمەت گرتنە بچووکەکان دا، بە سەر وردەکارییەکانی مێروو ئاسا دا، بە سەر ئاسوودەیی خەفەتبار دا، بە سەر «بەختیاری زۆربە» دا.

هێوابڕاو بوون باشترە لە تەسلیم بوون! بە راستی، ئێوەم لەبەر ئەوە خۆش دەوێ کە نازانن ئێمرۆ چلۆن بژین، ئێوە مرۆڤە باڵاترەکان! کەوایە ئێوە لە هەموان باشتر دەژین!

## ٤

برایان، ئایا بوێرن؟ ئایا بەدڵن؟ نەک بوێری لە ئاست شاهیدەکان، بەڵکە بوێری چۆلپەرستەکان و هەڵۆکان کە ئیدی خودایەکیش ناڕوانێتە ئەوان؟

گیان سەردەکان، یەسترەکان، کوێرەکان و مەستەکان بە بوێر دانانێم. بەدڵ ئەو کەسەیە کە ترس دەناسێ، بەڵام بە سەر ترس دا زاڵ دەبێ، ئەوەی کە هەڵدێر دەبینێ، بەڵام بە غروورەوە.

ئەوەی کە هەڵدێر دەبینێ، بەڵام بە چاوەکانی هەڵۆوە؛ ئەوەی کە بە چنگی هەڵۆ بە هەڵدێرەوە دەنووسێ: ئەوە بوێرە.



## ٥

«مرۆڤ خراپە» ـ هەرە فرەزانەکان بۆ دڵدانەوەی من وەهایان گوتوە. ئاخ، بریا ئێمرۆش وەها دەبوو! چونکە خراپە باشترین هێزی مرۆڤە.

«مرۆڤ دەبێ باشتر و خراپتر بێ» ـ من وەها فێر دەکەم. خراپترین شت بۆ باشترین شت لە بەرزەمرۆڤ دا پێویستە.

لەوانەیە ئەمە شیاوی ئەو موعیزەکەری خەڵکی بچووک بێ کە باری گوناهی مرۆڤ بکێشێ و رەنجی لێببا. بەڵام من لە گوناهی گەورە هەروەک هێمنیدەری گەورەی خۆم شادم ـ

بەڵام، وەها قسەیەک بۆ گوێچکە درێژەکان ناگوترێ و هەر قسەیەکیش هی هەر زارێک نیە. ئەم قسانە شتگەلێکی ناسک و کەم وێنەن: سمی پەز نابێ بگاتە ئەوان!

## ٦

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان! ئایا پێتان وایە من بۆ ئەوە هاتووم هەتا ئەوەی کە ئێوە خراپتان کردوە چاکی کەمەوە؟

یا لەمە بەدوا بۆ ئێوە دەردەداران نوێنێکی راحەتتر رابخەم؟ یا بە ئێوە بێئۆقرەکان، هەڵە کردووکان، شاخەوانە سەر لێشێواوەکان، جێ پێیەکی هاسانتر نیشان بدەم؟

نا! نا! سێ جار نا! تاقمێکی هەر چی پتر، هەر چی باشتر لە چەشنی ئێوە دەبێ بفەوتێ ـ و ژیان بۆ ئێوە هەر بێ ناخۆشتر و دژوارتر بێ. چونکە تەنیا ـ

ـ چونکە تەنیا بەمجۆرە مرۆڤ هەتا بەرزایی هەڵدەدا کە برووسک ئەو بکوتێ و تێکی بشکێنێ: وەها بەرز کە بۆ برووسک بەس بێ!

دەروون و تاسەم بەرەو کەم، درێژ و دوورەدەست رادەکێشرێن: بەدبەختییە بچووک و زۆر و کورتەکانی ئێوە بە من چی!

ئێوە هێشتا ئەوەند کە پێویستە رەنجتان نەکێشاوە! چونکە ئێوە لەبەر خۆتان

رەنج دەچێژن، ئێوە هێشتا رەنجی **مرۆڤتان** پێنەگەیوە؛ ئەگەر جگە لەمە بڵێن درۆتان کردوە! ئێوە هەمووتان لەوەی کە من لێی لە رەنج دابووم، رەنج نابەن.

## ٧

ئەمە من رازی ناکا کە برووسک ئیدی زیان ناگەیەنێ. نامەوێ بیگێڕمەوە: ئەو دەبێ فێر بێ کە دەبێ کار بۆ من بکا.

فرەزانیم درێژماوەیەکە کە خۆی هەروەک هەورێک تەیار کردوە و بێدەنگتر و تارتر دەبێ: هەر فرەزانییەک کە رۆژێک دەبێ برووسکی لێ بزێ وەها دەکا.

نامەوێ کە بۆ خەڵکی ئیمڕۆیی ببمە **نوور** یا بە نوور ناو ببردرێم؛ من ئەوانەم بە کوێری دەوێن: برووسکی فرەزانییم! چاوەکانیان دەربێنە!

## ٨

پتر لە توانایی خۆتان نەوێ: لای ئەو کەسانەی کە پتر لە توانایی خۆیان دەوێ درۆیەکی دزێو لە ئارا دایە.

بە تایبەت کاتێک کە داواکاری شتگەلی گەورە بن! چونکە ئەمانە، ئەم تەڕدەستە گزیکار و دەورگێڕانە، دەبنە هۆی بەدگومانی بە شتگەلی گەورە ـ

ـ هەتا ئەوەکە خۆیان لەبەر چاوی خۆیان بەدرۆ و خێل دەردەچن، وەک سەرپۆشێک لە سەر کرمێونی، داپۆشراو بە وشە بەهێزەکان و ئاکارباشیە رواڵەتیەکان و کارە درەوشاوەکانی درۆیین.

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، لەمە خۆ بپارێزن! چونکە من ئیمڕۆکە هیچ شتێک بە بایەختر و بێوێنەتر لە رووڕاستی نازانم.

مەگەر ئیمڕۆ سەردەمی عەوام نیە؟ بەڵام عەوام، نازانێ گەورە و بچوک چیە، راست و رووڕاستی چیە: ئەو بەبێ تاوان خواروخێچە؛ ئەو هەمیشە درۆ دەکا.



## ٩

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، ئەی بوێرەکان، ئەی دڵپاکان! ئیمڕۆ زۆر بەگومان بن و بەڵگەکانی خۆتان بشارنەوە! چونکە ئیمڕۆ سەردەمی عەوامە.

ئەوەی کە عەوام رۆژگارێک بەبێ بەڵگە باوەڕی هەبوە، کێ دەتوانێ بە بەڵگە ـ سەرنخوونی بکا؟

لە بازاڕ بە ئیشارە و ئاماژە رازیت دەکەن و بەڵگەکان هۆی بەدگومانی عەوامە.

ئەگەر جارێک راستەقینە سەرکەوت، بە بەدگومانییەکی زۆرەوە بپرسن: «کامە هەڵەی بەهێز خەباتی بۆ کردوە؟»

لە زانایانیش خۆ بپارێزن! ئەوان لە ئێوە بێزارن، چونکە بێ بەرن. ئەوان چاوگەلێکی سارد و ویشکیان هەیە کە لە ئاستیان دا هەر مەلێک پەڕ و باڵی دەوەرێ.

ئەوان لە خۆبایین کە درۆ ناکەن: بەڵام لە بێهێزیی بۆ درۆ کردن هەتا ئەویندارى راستەقینە بوون، مەودایەکی زۆرە. وریا بن!

مەودایەکی زۆرە لە رزگار بوون لە یاو هەتا گەیشتن بە زانایی. من بڕوام بە گیانە ژاکاوەکان نیە. ئەوەی کە ناتوانێ درۆ بکا، نازانێ راستەقینە چیە.

## ١٠

بۆ وەسەرکەوتن پێیەکانی خۆتان دەکار بێنن! مەهێڵن ئێوە هەڵبکێشن، لە بان سەر و کۆڵی بێگانەکان دامەنیشن!

بەڵام تۆ سواری ئەسپی؟ تۆ بەرەو ئامانجی خۆت داژۆیی؟ زۆر باشە، هاوڕێی من! بەڵام پێ لەنگەکەشت دەگەڵ تۆ سواری ئەسپ بوە!

کاتێک بگەیە ئامانجی خۆت، کاتێک لە سەر ئەسپی خۆت دروست بۆ **بەرزایی** خۆت باز بدەی، دەگەورزێی ـ ئەی مرۆڤی باڵاتر!

## ۱۱

ئەی ئافرێنەران، ئەی مرۆڤە بالاترەکان! هەر کەس تەنیا بە منداڵی خۆی ئاوسە.

مەهێڵن هیچ شتێکتان بە گوێ دا بخوێنن و پێتان بسەلمێنن! هاوسای ئێوە کێیە؟ ئەگەر «لەبەر هاوسا» کارێک بکەی ـ هێشتا بۆ ئەو ناخوڵقێنی!

ئەم «بۆ ئەو»ە لە یاد بسڕنەوە، ئەی ئافرێنەران! ئاکارباشی ئێوە خۆی داخوازی ئەوەیە کە ئێوە کارتان بە «بۆ ئەو»، «لەبەر» و «چونکە» نەدابێ. دەبێ گوێی خۆتان بۆ ئەم وشە بچووکە درۆیینانە ببەستن.

«لەبەر هاوسا» تەنیا ئاکارباشی خەڵکی بچووکە: ئەمە بە «قەرەبوو کردنەوە» و «یارمەتی ئەم دەستە بە دەستەکەی دیکە» ناو دەنێن ـ ئەوان نە هەق و نە هێزی خۆپەرستی ئێوەیان هەیە!

لە خۆپەرستی ئێوە دا، ئێوە ئافرێنەران، پەنامەکی و چارەنووسی کەسێک هەڵکەوتوە کە ئاوسە! لە تەواوەتی ئەوینی ئێوە دا ئەوەی کە هیچ کەس بە چاو نەیدیوە، میوەیە: کە لە پەنا دایە و ئاگای لێیەتی و بە بەری دەگەیەنێ.

تەواوەتی ئاکارباشی ئێوەش لەو جێیەیە کە تەواوەتی ئەوینی ئێوەی لێیە، لای منداڵەکانتان! کاری ئێوە، ویستی ئێوە، «هاوسا»ی ئێوەیە: مەهێڵن بایەخە درۆیینەکان ئێوە ئەفسوون بکەن!

## ۱۲

ئەی ئافرێنەرەکان، ئەی مرۆڤە بالاترەکان! ئەوەی کە دەبێ بزێ نەخۆشە، بەڵام ئەوەی کە زاوە ناپاکە.

لە ژنەکان بپرسن: کەسێک بۆ رابواردن نازێ. ژانە کە مریشک و شاعیرەکان وە قاڕەقاڕ دەخا.

ئەی ئافرێنەرەکان، لە ئێوە دا گەلێک ناپاکی هەیە، چونکە ئێوە دەبێ ببنە دایک.



منداڵێکی تازە: مخابن چەندە گەند و گەڵاشی تازە هاتوونە سەر دونیا! دوور بنەوە! ئەوەی کە زاوە دەبێ رەوانی خۆی بەپاکی بشواتەوە.

## ۱۳

پتر لە هێزی خۆتان ئاکارباش مەبن! لە خۆتان شتێکی نەگونجاو مەخوازن!

پێ لە جێ پێیەک بنێن کە ئاکارباشی باوکەکانتان بەر لە ئێوە پێی لێناوە! ئەگەر ویستی باوکەکانتان دەگەڵ ئێوە نەیەنە سەر چلۆن وەسەردەکەون!

بەڵام، ئەوەی کە دەیەوێ بەرەزا بێ دەبێ وریا بێ کە نەبێتە پاشەبەرە! لەو شوێنەی کە باوکەکانتان گوناهیان کردوە ئێوە نابێ زاهید بن!

ئەوەی کە باوکەکانی رۆژگاریان دەگەڵ ژن و شەڕابی بەهێز و گۆشتی بەراز تێپەڕ کردوە: ئەگەر داوێنپاکی لە خۆی بوێ چ مانایەکی هەیە؟

ماناکەی گەوجایەتییە! بە بڕوای من، بە راستی، وەها کەسێک شیاوی ئەوە نیە کە شووی یەک یا دوو یا سێ ژن بێ.

ئەگەر پەرستگایەکی ساز کرد و لە سەر دەرگاکەی نووسی: «رێگای بەرەو پیرۆز بوون» ـ دیسان دەڵێم: یانی چی! ئەمە گەوجایەتییەکی نوێیە!

ئەو شوێنێکی بۆ تەمێ کردن و را کردن دامەزراندوە: لەوانەیە بە کەلک بێ! بەڵام من بڕوا ناکەم.

هەر کەس هەر شتێک دەگەڵ خۆی بەرێتە خەڵوەوە ئەو شتە لەوێ هەڵدەدا، بۆ وێنە درندەی دەروون. لەبەر ئەوە دەبێ گەلێک کەس لە خەڵوەنشینی دوور بخەنەوە.

ئایا لە سەر رووی زەوی قەت شتێکی پیستر لە زاهیدی چۆلەوانی هەبوە؟ لای ئەوان نە تەنیا شەیتان ـ بەڵکە بەرازەکانیش بە ئازادی دەخولێنەوە.

## ۱٤

شەرمەزار، سەرشۆڕ، داتەپیو، وەک پڵنگێکی سەرنەکەوتوو لە خۆ پێدادان

دا: گەلێک جار ئێوە مرۆڤە باڵاترەکانم دیوە کە ئاوا دەخزێنە لاوە. جارێک لە تاس هەڵاویشتن دا سەرنەکەوتوون.

بەڵام، غەم مەخۆن، ئەی تاسبازەکان! ئێوە گاڵتە و کایە ئەوەند کە پێویستە فێر نەبوون! مەگەر ئێمە هەمیشە لە دەوری مێزێکی گەورەی گاڵتە و کایە دانەنیشتووین؟

ئەگەر لە کارێکی گەورە دا سەرنەکەوتوون، بەو مانایەیە کە ئێوە خۆتان ـ لە سەرنەکەوتووکانن؟ ئەگەر ئێوە خۆتان سەرنەکەوتوون، ئایا ماناکەی ئەوەیە کە ـ مرۆڤ سەرنەکەوتوە؟ دامنا کە مرۆڤ سەرنەکەوتوە: زۆر باشە، چ قەیدی!

## ۱۵

ڕەگەز هەرچی باڵاتر بێ، گەیشتنە سەرکەوتن کەمترە! ئێوە، ئەی ئەو مرۆڤە باڵاترانەی کە لێرەن، ئایا گشت ئێوە ـ سەرنەکەوتوو نەبوون؟

بە ورە بن، ئەمە چیە! هێشتا گەلێک شت دەکرێ! خۆ فێری پێکەنین بکەن، ئەوجۆرەی کە پیاو دەبێ پێبکەنێ!

چ جێی سەرسوڕمانە کە ئێوە سەرنەکەوتوون و نیوە سەرکەوتنێکتان دیوەتەوە، ئێوە نیوە ـ شکاوەکان! ئایا ئەمە **داهاتووی مرۆڤ** نیە کە لە ئێوە دا خۆ بۆ دەرەوە دەکوتێ و هەوڵ دەدا؟

مەگەر دوورترین و قووڵترین شتی مرۆڤ و ئەوەی کە لەو دا بەقەرا بەرزایی هەسێرەکانە، و هەروەتر هێزی بێبنی ئەو نیە کە لە مەنجەڵی ئێوە دا بە دژی یەکدی دەکوڵێن؟

چ جێی سەرسوڕمانە کە گەلێک مەنجەڵ دەشکێن! خۆ فێری پێکەنین بکەن، ئەوجۆرەی کە پێویستە! ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، هێشتا گەلێک شت هەن کە بکرێن.

بە ڕاستی، گەلێک شت هەتا ئێستا بە ئاکام گەیشتوون! ئەم زەوییە لە شتە چووکە کاملەکان و لە شتە باشە ڕێک و پێکەکان چەندە دەوڵەمەندە!

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، شتە چووکە کاملەکان لە دەوری خۆتان دابنێن!



پێگەیشتوویی زێڕنی ئەوان دڵ شەفا دەدا. کاملەکان موعیزەی هومێد دەکەن.

## ۱۶

لێرە، لە سەر زەوی، هەتا ئێستا گەورەترین گوناه چ بوە؟ مەگەر قسەی ئەو کەسە نەبوە کە کوتی: «هاوار بەوانەی کە لێرە پێدەکەنن!»

ئایا ئەو لە سەر زەوی هیچ بەڵگەیەکی بۆ پێکەنین نەدۆزییەوە؟ کەوایە ئەو خراپ لێیگەڕاوە. منداڵێکیش لێرە بەڵگەی دەدۆزێتەوە.

ئەو ئەوەند کە پێویست بوو خۆشی نەدەویست: دەنا ئێمەی خۆش دەویست، ئێمە دەم بە پێکەنینەکان! بەڵام ئەو لە ئێمە بێزار بوو و گاڵتەی پێدەکردین: ئەو مزگێنی شیوەن و ددان دە چیڕەوە بردنی بە ئێمە دەدا.

ئایا مرۆڤ دەبێ تووک لەو شوێنەی بکا کە خۆشی ناوێ؟ ئەوە بە بڕوای من سەلیقەیەکی باش نیە. بەڵام ئەو وەهای کرد، ئەم پیاوە موتڵەقخوازە. ئەو لە نێو عەوام هەڵستابوو.

ئەو ئەوەند کە پێویستە خۆشی نەدەویست: دەنا لەوە کە ئەویان خۆش ناوێ هێندە تووڕە نەدەبوو. ئەوینی گەورە ئەوینی **ناوێ** ـ لەو پتری دەوێ.

لەم موتڵەقخوازانە خۆ بپارێزن! ئەوان لە ڕەگەزی هەژار و نەخۆشن، لە ڕەگەزی عەوامن: ئەوان بەدخوازانە چاو لەم ژیانە دەکەن، ئەوان بۆ زەوی چاوپیسن.

خۆ لەم موتڵەقخوازانە بپارێزن! ئەوان پێگەلێکی قورس و دڵێکی گیراویان هەیە ـ ئەوان سەمای نازانن. زەوی چلۆن دەتوانێ بۆ وەها کەسانێک سووک بێ!

## ۱۷

شتە باشەکان هەمیشە خواروخێچ لە ئامانجی خۆیان نزیک دەبنەوە. وەک پشیلە پشت دەچەمێننەوە و لەبەر بەختیاری خۆیان بۆ دەروونیان مرەمریان دێ ـ شتە باشەکان گشتیان پێدەکەنن.

هەنگاوەکان دەیدرکێنن کە ئاخۆ پیاو هەنگاوی لە ڕێی خۆ ناوە یا نا، کەوایە چاو لە ڕێ ڕۆیشتنم بکەن! ئەوەی کە لە ئامانجی خۆی نزیک دەبێتەوە،

سەماکەرە.

بە راستی نەبوومە کۆتەڵێک. لێرە ویشک، بێدەنگ، بەردین، وەک ئەستوون رانەوەستاوم؛ من حەزم لە توند راکردنە.

هەرچەند کە لە سەر زەوی گەلێک مردواو و مەینەت هەیە، ئەوەی کە سووک پێیە بە سەر قوڕ و لیتە دا وەها هەڵدێ و سەما دەکا وەک بڵێی لە سەر تەختەسەهۆڵ بێ.

برایان، دڵەکانی خۆتان هەڵکێشن، بۆ سەر و سەرتر! پێیەکانی خۆشتان لە یاد مەکەن! پێیەکانی خۆشتان هەڵکێشن، ئەی سەماکەرە باشەکان، و باشترە کە لە سەر سەری خۆتان بوەستن!

## ١٨

ئەم تاجەی پیاوی دەم بە پێکەنین، ئەم تاجەی گوڵی سوورم من خۆم لە سەر ناوە، من خۆم پێکەنینی خۆم بە پیرۆز داناوە. بۆ ئەم کارە هیچ کەسی دیکەم ئیمڕۆ ئەوەند کە پێویستە بە هێز نەدۆزیوەتەوە.

زەردەشتی سەماکەر، زەردەشتی بارسووک، کە بە باڵ وەشاندن ئیشارەتان دەدا، ئەو ئامادە بۆ فڕینە، ئیشارە لە هەموو باڵندەکان دەکا، ساز و تەیار، شاد و سەرسووک ـ

زەردەشتی راستوێژ، زەردەشتی راستبزە، ئەوەی کە نە نائارامە و نە موتڵەقخواز، ئەوەی کە حەزی لە بازد و هەڵبەزە؛ ئادی من خۆم ئەم تاجەم لە سەر ناوە!

## ١٩

برایان، دڵەکانی خۆتان هەڵکێشن، بۆ سەر و سەرتر! پێیەکانی خۆشتان لە بیر مەکەن. پێیەکانی خۆشتان هەڵکێشن، ئەی سەماکەرە باشەکان، و باشترە کە لە سەر سەری خۆتان بوەستن!

لە مەیدانی بەختیاریش دا گیاندارەکان قورسن؛ کەسانێک هەن کە لە سەرەتاوە پێیەکی درێویان هەیە و هەروەک فیلێک کە بیەوێ لە سەر سەری خۆی



بوەستێ، زەحمەتێکی سەیر دەکێشن.

بەڵام لەبەر بەختیاری شێت بوون باشترە لە چارەڕەشی؛ درێو سەما کردن باشترە لە لەنگان. کەوایە حیکمەتەکەم فێر بن: خراپترین شتیش تەنانەت دوو لایەنی باشی هەیە.

ـ خراپترین شتیش تەنانەت پێگەلێکی باشی بۆ سەما هەیە: کەوایە، ئەی مرۆڤە بالاترەکان، فێر بن کە خۆ لە سەر پێگەلی شیاوی خۆ رابگرن!

کەوایە ئاخ هەڵکێشان و گشت شیوەنخوازی عەوام لە یاد بسڕنەوە! ئاخ، تەنانەت ویشکەڕنەکانی عەوامیش لەم رۆژگارە دا بە چاوی من پەشێو دیاری دەدەن! بەڵام، ئیمڕۆ رۆژگاری عەوامە.

## ٢٠

هەروەک با بن ئەودەم کە لە ئەشکەوتی کوێستانیی خۆی بۆ دەر باز دەدا: ئەو دەیەوێ بە هەوای نایەی خۆی سەما بکا و دەریاکان لە ژێر قورسایی هەنگاوەکانی دەهەژێن و باز دەدەن.

ئەوەی کە باڵ دەدا بە کەرەکان، ئەوەی کە دەڵە شێرەکان دەدۆشێ ـ بژی وەها گیانێکی باشی بێلغاو، کە مینا تۆفان بە سەر تەواوەتی ئیمڕۆ و تەواوەتی عەوام دا، دادێ.

ـ ئەوەی کە دوژمنی گشت دڕک بە سەرەکان و سەرداخستوان و گشت گەڵا ژاکاوەکان و گیا بژارەکانە ـ بژی وەها گیانێکی دڕ، باش، ئازاد و تۆفانی، کە لە سەر زەلکاو و مەینەتەکان وەها سەما دەکا وەک لە سەر مێرگەکان بێ.

ـ ئەوەی کە لە سەگە گەڕۆڵەکانی عەوام و گشت زاوزێی ناسازی مەینەتاسای ئەوان بێزارە ـ هەر بژی ئەو گیانەی ئازادەگیانەکان، تۆفانێکی دەم بە پێکەنین کە تۆز دە چاوی گشت رەشبینەکان و کواندارەکان دەکا.

ئەی مرۆڤە بالاترەکان، خراپترین شت لە ئێوە دا ئەمەیە کە ئەوجۆرەی کە پێویستە سەما فێر نەبوون ـ سەمایەک بە سەر خۆ دا بۆ ئەوپەڕی خۆ! قەیدی چیە کە ئێوە سەرنەکەوتوون!

هێشتا گەلێک شت دەکردرێ! کەوایە **فێر بن** کە بە سەر خۆ دا بۆ ئەوپەڕی خۆ پێبکەنن! دڵەکانی خۆتان هەڵکێشن، ئەی سەماکەرە باشەکان، بۆ سەر و سەرتر! و باش پێکەنین لە بیر مەکەن.

برایان، ئەم تاجەی پیاوی دەم بە پێکەنین، ئەم تاجە گوڵی سوورە من بۆ لای ئێوەی داوێم. من پێکەنین بە پیرۆز دادەنێم؛ ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، پێکەنین فێر بن!

## سترانی پەژارە

### ١

کاتێک کە زەردەشت ئەم قسانەی دەکرد لەبەر زارکی ئەشکەوتەکەی وەستابوو؛ دەستبەجێ دوای دەربڕینی دوایین وشەکانی لە میوانەکانی رایکرد و کورت ماوەیەک پەنای بۆ هەوای ئازاد برد.

زەردەشت هاواری کرد: «ئەی بۆنە پاکەکانی ئاقاری من، ئەی ئەهوەنی پیرۆزی ئاقاری من! گیاندارەکانم لە کوێن؟ وەرن، وەرن، هەڵۆ و مارەکەم!

ئێستا پێم بڵێن، گیاندارەکانم، ئایا ئەم مرۆڤە باڵاترانە گشتیان بۆنێکی ناخۆشیان لێنایە؟ ئەی بۆنە پاکەکانی ئاقاری من! **ئێستا** دەزانم و هەست دەکەم کە ئێوە گیاندارەکانم چەندە خۆش دەوێ.»

زەردەشت جارێکی دیکە گوتی: «ئێوەم خۆش دەوێ، گیاندارەکانم!» کاتێک ئەم قسانەی کرد هەڵۆ و مار خۆیان تێهەڵسوو و روانیانە ئەو. بەمجۆرە هەر سێ ئارام لێک کۆ ببونەوە و پێکەوە چێژیان لە هەوای تازە وەردەگرت و هەناسەی قووڵیان هەڵدەکێشا. چونکە هەوای دەرەوە باشتر لە هەوای لای مرۆڤە باڵاترەکان بوو.

### ٢

بەڵام هێشتا زەردەشت پێی لە ئەشکەوتی خۆی نەبردبوو دەرەوە کە



جادووگەری پیر هەستا و بە مەکرەوە روانیە دەوروبەری و گوتی: «ئەو چۆتە دەرەوە!

نووکە، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان ـ هیوادارم بەم ناو و پێهەڵگوتنە، وەک ئەو ئێوەم قدیلکە دابێ ـ نووکە گیانی چەپەڵی فریو و جادووگەریم شاڵاوی بۆ هێناوم ـ

هەر ئەو ئەهریمەنەی پەژارەم، کە لە بنەڕەتەوە دژی ئەم زەردەشتەیە: ئەو ببوورن! نووکە ئەو دەیەوێ لە بەرابەر ئێوە دا جادووگەری بکا، نووکە دروست کاتی ئەو داهاتوە؛ من لەخۆوە دژی ئەم گیانە بەدخوازە بەربەرەکانی دەکەم.

ـ ئێوە هەمووتان، دەتوانن بە وشەکان هەر چەشنە شانازییەک بۆ خۆتان پێک بێنن، ئێوە دەتوانن خۆ بە «ئازادەگیان» ناو بەرن یا «ئەهلی راستی» یا «گیانە تۆبەکارەکان» یا «لە بەند رزگار بوان» یا «تاسەبارانی گەورە»

ـ ئێوە هەمووتان وەک من لە **بێزی گەورە** لە رەنج دان، ئێوەیەک کە خودای کۆنەتان مردوە و خودایەکی تازە هێشتا لە مەلۆتکە و لانک نەنراوە، گیانی بەدخواز و ئەهریمەنی جادووگەری من دەگەڵ گشت ئێوە دڵاوایە.

من ئێوە دەناسم، ئێوە مرۆڤە باڵاترەکان؛ من ئەویش دەناسم. من ئەو جادووگەرەی دەناسم کە بەبێ ویستی خۆم خۆشم دەوێ، من ئەم زەردەشتە دەناسم: ئەو گەلێک جار لەبەر چاوم خۆی وەک دەمامکی جوانی قەدیسێک دەنوێنێ ـ

هەروەک کۆڕی کایەی تازە و سەیری دەمامکپۆشەکان کە لەوێ دا گیانی بەدخوازم، ئەم ئەهریمەنی پەژارەیە، خۆشحاڵە ـ گەلێک جار وەها بیر دەکەمەوە کە من زەردەشتم لەبەر گیانی بەدخوازم خۆش دەوێ.

بەڵام، نووکە ئەو شاڵاوم بۆ دێنێ و رێکم دەکوشێ، ئەم گیانەی پەژارە، ئەم ئەهریمەنەی ئێوارانە: بە راستی، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، لەو دا هەوەسێک هەیە ـ

چاوەکانتان چاک بکەنەوە! ئەو مەیلی هاتنی **بە رووتی** کردوە، پیاوانە دێ یا ژنانە، نازانم: بەڵام، ئەو دێ و من رێک دەکوشێ، هاوار! هەستتان بکەنەوە!

رۆژ دادەکەوێ، نووکە ئێوارە هەموو شتێک دادەگرێ، باشترین شتەکانیش، ببینن و ببیسن، ئەی مرۆڤە بالآترەکان، کە ئەم گیانە پەژارەی ئێوارانە، ژن یا پیاو، ئەهریمەنێکی چۆنە!»

وەهای گوت جادووگەری پیر و بە مەکرەوە روانیە دەوروبەری و ئەوسا دەستی دایە چەنگەکەی.

### ٣

لە هەوای بوولێڵ
ئەودەم کە لاواندنەوەی شەونم
- نەدیتراو و نەبیستراو -
بە سەر زەوی دا دادەکەوێ،
- چونکە شەونمی لاوێنەر
هەروەک گشت لاوێنەرانی دڵاوا
بە پێدزە دێ.
وەبیرتە، وەبیرتە، ئەی دڵی داغ
کە سەردەمایەک چەندە تینوو بووی،
تینووی فرمێسکەکانی ئاسمانی و دڵۆپەکانی شەونم،
سووتاو و تینوو و ماندوو
ئەودەمە کە لە سەر رێبازی زەردی مێرغوزارەکان
نیگای بەدخوازی هەتاوی دەمەو ئێوارە
بە نێوان دارە رەشەکان دا لە دەوری تۆ دەگەڕا
نیگا گەرمە، ئازاردەرە، شەوارەکەرەکانی هەتاو؟

ئەوان، بە گاڵتە، وەهایان گوت: «تۆ، خوازیاری راستی؟



نا! تەنیا شاعیرێک!
گیانداریک، گیاندارێکی فێڵەزان، راوکەر، لە بۆسە دا
کە دەبێ درۆ بکا
کە دەبێ بە ویست و زانینەوە درۆ بکا:
بە تەماح بۆ راو،
بە دەمامکێکی رەنگاوڕەنگەوە
خۆی دەمامکی خۆی
خۆی نێچیری خۆی -
ئەم - خوازیارەی راستی؟
نا! تەنیا شێتێک! تەنیا شاعیرێک!
تەنیا رەنگین - قسەیەک
کە لە نێو دەمامکەکانی شێتێکەوە هاوارە رەنگاوڕەنگەکان دەردەبڕێ،
سواری پردە بە درۆکانی وشەکان
لە سەر پەلکەزێڕینەکان
لە نێوان ئاسمانە درۆیینەکان
و زەوینە درۆیینەکان
گەڕۆڵ، گەڕیدە -
تەنیا شێتێک! تەنیا شاعیرێک!

ئەم - خوازیارەی راستی؟
نە بێدەنگ، بێ قسە، ساف، سارد
دەبیە کۆتەڵێک
نە وەک ئەستوونی خودا

وەستاو لە بەرابەر پەرستگا،
وەک دەرکەوانی خودایەک:
نا! دوژمنی وەها کۆتەڵەکانی راستی
هەر دەشت و دەرێک زیاتر بە ماڵ دەزانێ هەتا پەرەستگا
پڕ لە قۆشمەیی کتک
بازدەر بە نێوان هەر پەنجەرەیەک دا
گورج! لە هەر کارەساتێک دا
بۆن هەڵگر بۆ هەر لێڕەوارێک
تاسەبارانە بۆن هەڵگر
چونکە لە لێڕەوارەکان دا
لە نێوان نێچیرەکانی بە خاڵ و میل دا
تۆ تاوانبارانە ساغ و رەنگاوڕەنگ و جوان را دەکەی.
بە لێوە بە هەوەسەکانەوە
بەختەوەرانە گاڵتەکەر، بەختەوەرانە دۆزەخی، بەختەوەرانە خوێنخۆر
راوکەر، لە بۆسە دا، درۆزن.

یان وەک هەڵۆیەک کە لە دوورەوە
چاوی لە هەڵدێر بڕیوە
لە هەڵدێری خۆی ...
ئای کە هەڵۆکان بە خولانەوە لوور دەبنەوە
بۆ قووڵایی قووڵەکان!
ئەوسا
لەپڕ



یەکراست
گورج وەک برووسک
پڕ دەدەنە بەرخەکان
برووسکاسا، لە جەنگەی برسیایەتی دا
بە تەماحی بەرخ
بێزار لە تەواوی رەوانە بەرخاساکان
زۆر تووڕە لەوانەی کە
چاو ـ بەرخ و مەڕاسا و تیسک لوول،
گێژ، بە خێرخوازی بەرخەکانەوە

وەها
هەڵۆئاسا و پڵنگاسان
تاسەی تۆ لە ژێر هەزار دەمامکەوە
تۆ شێت! تۆ شاعیر!

تۆیەک کە مرۆڤت
زیاتر وەک خودا دیوە هەتا وەک مەڕ
و خودا لە مرۆڤ دا وەها هەڵدەدڕی
وەک مەڕ لە مرۆڤ دا،
و لە کاتی هەڵدڕین دا بە پێکەنین ـ

ئەمەیە، ئەمەیە بەختەوەری تۆ!
ئەو بەختەوەری پڵنگ و هەڵۆ!

بەختەوەری شاعیرێک، شێتێک!

لە هەوای بووڵێڵ
ئەودەم کە داسی مانگ
سەوز لە نێوان سوورایی ئەرخەوانی دا
ئێرەییانە دادەخزێ:
دوژمنانە دەگەڵ ڕۆژ
دەگەڵ هەر هەنگاوێک، بە نهێنی
چیمەنەکانی گوڵی سوور
دەدروێتەوە، هەتا نوقم بن
هەتا ڕەنگ بزڕکاو لە شەو دا نوقم بن.
منیش خۆم ڕۆژێک وەها نوقم بووم
لە شێتایەتی ڕاستیخوازی خۆم
لە تاسەکانی ڕۆژانەی خۆم
لە ڕۆژ ماندوو، لە ڕووناکی نەخۆش
لە شەو دا نوقم بووم
لە تاریکان دا، لە سێبەر دا
سووتاو و تینوو
لە ڕاستەقینەیەک
وەبیرتە هێشتا، وەبیرتە ئەی دڵی داغ
کە ئەودەم چەندە تینوو بووی؟
دوور بێ لە من
لە تەواوەتی ڕاستەقینە
تەنیا شێتێک!



تەنیا شاعیرێک!

## سەبارەت بە زانست

وەهای ستران بێژت جادووگەر؛ و تەواوی دانیشتوانی کۆڕ بێ ئەوەی خۆیان بزانن، هەروەک باڵندەکان، کەوتنە داوی هەوەس و فریو و پەژارەی ئەو؛ تەنیا خاوەنی گیانی بە ویژدان بوو کە ئەسیری ئەو نەببوو: ئەو گورج چەنگی لە دەست جادووگەر ڕاپسکاند و هاواری کرد: «هەوا! هەوا! هەوای باش بۆ نێو ئەشکەوت بێنن! زەردەشت بێننەوە ژوور! تۆ ئەم ئەشکەوتەت خەفە و ژاراوی کرد، ئەی جادووگەری پیری چەپەڵ!

تۆ ئێمە بەرەو داوێنی ئاواتەکان و سارا نەناسراوەکان ڕادەکێشی، ئەی درۆزنی دەغەڵ! هاوار لەو دەمەی کە کەسێکی وەک تۆ لە **ڕاستی** دەدوێ و هات و هەرا ساز دەکا!

هاوار لە هەموو ئەو گیانە ئازادانەی کە لە ئاست وەها جادووگەرانێک ئاگایان لە خۆیان نەبێ! ئیدی ئازادییان فەوتاوە: تۆ گەڕانەوە بۆ زیندان فێر دەکەی و هان دەدەی ـ

ئەی ئەهریمەنی پیری پەشێو: ناڵەی تۆ زایەڵەی چریکەی مەلی فریوی هەیە. تۆ هەروەک ئەوانەی کە بە ڕێزدانان لە زاهید بوون لە بنەوە بۆ هەوەسبازی بانگەواز دەکەن!»

وەهای گوت پیاوی بە ویژدان؛ بەڵام جادووگەری پیر ڕوانیە دەوروبەری خۆی و لەزەتی لە سەرکەوتنی خۆی برد و لەبەر ئەوە ئەو ئازادەییەی کە پیاوی بە ویژدان لەو دا پێکی هێنابوو لەبەر چاوی نەگرت و بە دەنگێکی کزەوە گوتی: «بێدەنگ! گۆرانی باشەکان زایەڵەی باشیان دەوێ؛ دوای گۆرانی باشەکان دەبێ تا ماوەیەک بێدەنگ بن ـ

هەر ئەوجۆرەی کە هەمووی ئەوانە کردوویانە، ئەم مرۆڤە بالاترانە. لەوانەیە تۆ لە گۆرانی من شتێکی وەها تێنەگەیشتبێی؟ لە گیانی جادووگەرانە دا شتێکی ئەوتۆ لە تۆ دا نیە.»

پیاوی بە ویژدان وڵامی داوە: «ئەوە پەسنێکە بۆ من، کە تۆ من لە خۆت جیا

دەکەیەوە. بەڵام چ دەبینم؟ ئێوە هەمووتان هێشتا بە چاوە هەوەسبازەکانتانەوە لەوێ دانیشتوون:

ئەی رووحە ئازادەکان، ئازادی ئێوە چۆتە کوێ؟ لە روانگەی منەوە ئێوە وەک کەسانێک دیاری دەدەن کە ماوەیەکی درێژ چاویان لە کیژە رووتە سەماکەرەکان کردبێ: رەوانەکانی ئێوەش خۆیان سەما دەکەن!

لە ئێوە دا، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان دەبێ شتێکی لەوە پتر هەبێ کە جادووگەر بە گیانی جادووگەری و گزیکاری خۆی ناوی دەبا: هەڵبەت ئێمە دەبێ لێک جوێ بینەوە.

بە راستی، بەر لەوەی کە زەردەشت بگەڕێتەوە بۆ ئەشکەوتەکەی ئێمە ئەوەند دەگەڵ یەک دوا بووین و بیرمان کردبۆوە کە من بزانم: ئێمە لە یەکدی جیاوازین.

ئێمە، یانی ئێوە و من، لەم سەرە **داخوازی** شتگەلی جیاین. چونکە من داخوازی **هێمنایەتی** پترم و لەبەر ئەوە رووم دە زەردەشت کرد. چونکە ئەو لەم سەردەمە دا هێشتا وەستاوترین بورج و ورەیە ـ

لە رۆژگارێک دا کە هەموو شت لەقە، لە رۆژگارێک دا کە تەواوەتی زەوی دەهەژێ. بەڵام کاتێک چاو لە حاڵەتی چاوەکانی ئێوە دەکەم وام بۆ دەردەکەوێ کە ئێوە بە دوای **ناهێمنایەتییەکی پترەوەن ـ**

ترس و لەرزی پتر، مەترسی پتر، بوولەرزەی پتر. گومانم وایە کە ئێوە هەوەسێکتان هەیە ـ ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، ئەم گومانە خۆخوازانەی من ببوورن ـ ئێوە هەوەسێکتان هەیە بۆ خراپترین و پڕ مەترسیترین چەشنی ژیان کە لە هەموان پتر **من** دەترسێنێ، بۆ ژیانی گیاندارە دڕەکان، بۆ لێڕەوارەکان، ئەشکەوتەکان، کێوە بە هەورازەکان و داڵانە پڕ کون و کاژێڕەکان.

ئەوەی کە ئێوە لە هەموان پتر پێتان خۆشە شتێک نیە کە لە نێو مەترسیەوە بۆ دەرەوە رێنوێنی دەکردرێ، بەڵکە شتگەلێکە کە ئێوە لە تەواوی رێگاکانەوە بەرەو لاڕێ دەبا، یانی هەڵخەڵەتێنەران. بەڵام ئەگەر لە ئێوەش دا بە راستی وەها هەوەسگەلێک هەبن، بە بڕوای من، وەها شتێک **نەگونجاوە**.

چونکە ترس ـ هەستی سەرەکی و بنەڕەتی مرۆڤە؛ ترسە کە مانای گوناهی سەرەکی و ئاکارباشی سەرەکی روون دەکاتەوە. لە دەروونی ترسەوەیە کە



ئاکارباشی منیش هەڵیداوە، هەر ئەوەی کە ناوی زانستە.

چونکە ترس لە دڕندەکان، کۆنتر لە هەر شتێکی دیکە لە مرۆڤ دا سەری هەڵداوە؛ بۆ وێنە ترس لە گیاندارێک کە لە دەروونی خۆی دا شاردوویەتیەوە و زەردەشت ئەو بە «دڕندەی دەروون» ناو دەبا.

وەها ترسێکی درێژی لەمێژینە لە ئاکام ناسک و رووحانی و مەعنەوی دەبێ ـ و ئێمرۆ، بە بڕوای من، ناوی **زانستە**.»

وەهای گوت پیاوی بە ویژدان؛ بەڵام زەردەشت کە هەر ئەودەم گەڕابۆوە ئەشکەتەکەی خۆی و دوایین قسەکانی بیست و هەستی بە چلۆنایەتییەکەی کردبوو، چەپکێکی گوڵی سوور بە پیاوی بە ویژدان دادا و بە «راستەقینە»کانی پێکەنی و هاواری کرد: «چی؟ چ دەبیسم، بە راستی، بە بڕوای من، یا تۆ شێتی یا من: من راستەقینەی تۆ بە جارێک هەڵدەوەژێرم.

چونکە **ترس** ـ لە ئێمە دا ئیستسنایە. بەڵام بوێریی و کارەساتخوازیی و لەزەت بردن لە نەناسراوەکان و رۆیشتن بەرەو شتگەلێکە کە هێشتا کەس بۆ خاتری ئەوان خۆی لە مەترسی نەخستوە ـ بە بڕوای من، **بوێریی** بنەڕەتی تەواوەتی مێژووی مرۆڤە.

مرۆڤ ئێرەیی بە ئاکارباشی تەواوەتی دڕترین و بوێرترین گیاندارەکان بردوە و ئەوی لەوان رفاندوە: بەمجۆرەیە کە ـ بۆتە مرۆڤ.

**ئەم** بوێرییە لە ئاکام ناسک و رووحانی و مەعنەوی لێهات، ئەم بوێرییەی مرۆڤ، بە باڵەکانی هەڵۆ و ژیریی مار: هەر **ئەمەیە** کە ئێمرۆ، بە بڕوای من، ناوی دەبردرێ ـ»

«**زەردەشت!**» تەواوی ئەوانەی کە پێکەوە دانیشتبوون یەک دەنگ وەها هاواریان کرد و بە دوای ئەو دا وەها قاقایان کێشا کە دەتگوت پێکەنین وەک هەورێکی قورس لەوان بەرز بۆوە. جادوگەریش پێکەنی و بە زیرەکیەوە گوتی: «زۆر باشە! گیانی بەدخوازم منی جێ هێشت!

مەگەر من خۆم ئێوەم لەو وریا نەکردنەوە و نەمگوتبوو کە ئەو گزیکار و گیانی درۆ و دەلەسەیە؟

به تایبەت کاتێک کە خۆی بە رووتی نیشان دەدا. بەڵام من دەگەڵ فریوەکانی ئەو چم پێدەکرێ؟ مەگەر **من** ئەو و دونیام ئافراندوە؟

دەسا وەرن دیسان خۆش و شاد بینەوە! هەر چەند کە زەردەشت زەق زەق تێمدەڕوانێ ـ چاو لەو بکەن! دڵی لە من ئێشاوە ـ

بەڵام بەر لەوەی کە شەو دابێ، ئەو جارێکی دیکانە فێر دەبێ کە منی خۆش بوێ و پێم هەڵبلێ. ئەو ناتوانێ بە بێ وەها شێتایەتییەک ماوەیەکی زۆر بژی.

ئەو دوژمنەکانی خۆی خۆش دەوێ: ئەو ئەم هونەرە باشتر لە گشت کەس دەزانێ کە من دیتوومە. بەڵام ئەو تۆڵەکەی لە دۆستەکانی دەکاتەوە.»

وەهای گوت جادووگەری پیر، و مرۆڤە باڵاترەکان چەپڵەیان بۆ لێدا. لە دوایی زەردەشت بە نێویان دا گەڕا و بە قۆشمەیی و مەحەبەتەوە دەستی ئاواڵەکانی رێک کوشی، هەروەک کەسێک کە بیەوەی شتێک قەربوو بکاتەوە و لەبەر ئەو داوای لێبوردن بکا. بەڵام کاتێک گەیشتە زارکی ئەشکەوتەکەی، بڕوانە، جارێکی دیتر مەیلی هەوای ئازاد و دیداری گیاندارەکانی تێدا سەری هەڵداوە و ویستی کە لە ئەشکەوت بچێتە دەر.

## لە نێو کیژەکانی سارا دا

۱

ئاوارەیەک کە خۆی بە سێبەری زەردەشت دادەنا، گوتی: «دوور مەکەوە! لای ئێمە بمێنەوە، دەنا مەینەتی کۆنەی شێدار جارێکی دیکە شاڵاومان بۆ دێنێتەوە.

هەر ئێستا ئەو جادووگەرە پیرە خراپترین ئیشی بە باشترین شێوە دەگەڵ ئێمە کرد، بڕوانە کە فرمێسک لە چاوەکانی پاپی چاکی خوداناس دا قەتیس ماوە و جارێکی دی لە دەریای مەینەت دا سواری کەشتی بوە.

ئەم پاشایانەش هەر چەند لە ئاست ئێمە رواڵەتێکی باش لە خۆ دەنوێن ـ



چونکە ئەمانەش ئەمە باشتر لە هەمووی ئێمە فێر بوون ـ بەڵام ئەگەر شاهیدێکیان نەبێ، گرێو دەکەم کە هەر ئەو رووداوە تاڵە دیسان بۆیان دووپاتە دەبێتەوە ـ

رووداوی تاڵی هەورە گەڕۆڵەکان، مەینەتی شێدار، ئاسمانی گیراو، هەتاوە رفێنراوەکان، با بە لوورەکانی پاییز،

ـ رووداوی تاڵی لوورە و هاواری هانای ئێمە: لای ئێمە بمێنەوە، زەردەشت! لێرە گەلێک چارەڕەشی شاراوەیە کە دەیەوێ قسە بکا، گەلێک ئێوارە، گەلێک هەور، گەلێک هەوای شێدار!

تۆ ئێمەت بە خۆراکە تیژەکانی پیاوانە و قسە پڕ هێزەکان پەروەردە کردوە: مەهێڵە کە پاشماوەی ئێمە ئەوە بێ کە گیانە لاوازەکانی ژنانە دیسان ئێمە داگرێتەوە!

تەنیا تۆی کە هەوا لە دەوروبەرت بە هێز و رووناک دەکەی! ئایا قەت لە سەر زەوی هەوایەکم بە باشی هەوای نێو ئەشکەوتی تۆ دیوە؟

من گەلێکم وڵات دیون و لووتم فێر بوە کە گەلێک هەوا بە تاقی کاتەوە و هەڵیانسەنگێنێ: بەڵام لای تۆیە کە تفنکم گەورەترین چێژ دەبا!

جگە ـ جگە ـ ئاخ لەم بیرەوەرییە کۆنەم ببورە! من لەبەر گۆرانییەکی کۆنی پاشماوە کە سەردەمایەک لە نێو کیژەکانی سارا دامناوە، ببوورە ـ

چونکە لای ئەوانیش هەر ئەم هەوا باش و رووناکەی رۆژهەڵاتی هەبوو؛ من لەوێ لە ئورووپای پیری هەور و هەوا و شێدار و غەمین لە هەر دەمێک پتر دوور بووم!

ئەودەم من ئەویندار وەها کیژگەلێکی رۆژهەڵاتی و مەلەکووتی ئاسمانە شینەکان کە هیچ هەور و بڕوایەک پێیانەوە نەلکاوە، بووم.

باوەڕ ناکەن کە ئەوان کاتێک کە سەمایان نەدەکرد چەندە جوان دادەنیشتن، قووڵ، بەڵام بێ هیچ بیر کردنەوەیەک، هەروەک رازە چووکەکان، وەک پەردەکێکی سەر بەستراو، وەک فندقی چەرەز ـ

رەنگاوڕەنگ و بە تەواوەتی بیانی، بەڵام بێهەور: وەک پەردەکە کراوەکان:

لەبەر خۆشەویستی ئەم کیژانە ئەو سەردەمە من وە فکری ساز کردنی گورانییەکی شوکرانەبژێری دوای خواردن کەوتم.»

وەهای گوت ئاوار کە خۆی بە سێبەری زەردەشت دادەنا؛ و بەر لەوەی کەسێک وڵامی داتەوە، چەنگی جادووگەری پیری بە دەستەوە گرت و چوارمەشقی دانیشت و بە ئەرخەیانی و زانایانە روانیە دەوروبەری خۆی ـ بەڵام وەک کەسێک کە لە وڵاتێکی تازە هەوایەکی بێگانە بە تاقی دەکاتەوە، هەوای بە ئارامی و بە تاقی کردنەوە بردە نێو تفنکەکانیەوە. لە دوایی بە گورِەیەکی تایبەت گۆرانی دەست پێکرد.

## ۲

سارا هەڵدەدا: هاوار لەو کەسەی کە ساراکان دەشارێتەوە!

ئەهای! بەشکۆ!
بە راستی بە شکۆ!
سەرەتایەکی بە بایەخ!
بە شکۆیەکی ئەفریقایی!
شیاوی شێرێک
یا مەیموونێکی بە زیقەی ئەخلاق جارِ ـ
بەڵام ئەمە لە لای ئێوە هیچ نیە.
ئێوە خۆشەویستترین هاورِێیان
کە لەبەر پێتان
من کە ئورووپاییم
بۆ یەکەم جار
لە ژێر دارخورماکان



ئیزنی دانیشتنتان داوە. سەڵا.

بە راستی سەیرە!
من نووکە لێرە دانیشتووم
لە نزیک سارا
و سەرەڕای ئەمە وەها دور لە سارا
و هیچ وێرانییەک لە من پێک نەهاتوە:
چونکە ئەم ئاوەدانییە هەرە بچووکە
منی قووت داوە
ئەو بە باوێشکەوە
زاری دڵرِفێنی کردەوە
ئەو زارە چووکە هەرە خۆشبۆیە
و من تێکەوتم
بۆ خوار، بە نێوی دا ـ لە نێو ئێوە دا،
ئێوە ئازیزترین هاورِێکانم! سەڵا.

بژی، بژی، ئەو نەهەنگەی
کە وەها جوان
بە میوانەکانی رادەگا! ـ لە ئاماژەکانی زانایانەی من دەگەن؟
بژی زگەکەی
ئەگەر وە دڵرِفێنی زگی ئاوەدانی
چووبێ
هەروەک ئەمە ـ هەر چەند من لەم بارەوە شک دەکەم،

چونکە من لە ئورووپاوە دێم
کە لە هەر ژنێکی گەڕاوەی بە شوو
شک هەڵگرترە.
خودا ئەو بۆ رێگای راست رێنوێنی بکا!
ئامین!

نووکە من لێرە دادەنیشم
لەم ئاوەدانییە بچووکە
وەک خورمایەک
قاوەیی، نێوشیرین، زێردەڵێن
تامەزرۆی زاری وەک غونچەی کیژەکان
لەوە پتر تامەزرۆی ددانەکانی پێشووی کیژانە
ددانگەلێکی سارد وەک سەهۆڵ، سپی وەک بەفر، تیژ و بە برِ
چونکە دڵی هەر خورمایەکی داغ
لە تاو و تینی ئەوان دایە. سەلا.

هەر وەک میوەی باشووری ناوبراو
گەلێک هەروەک ئەو
من لێرە درێژ بووم
قالۆنچە باڵدارەکان
لە دەوروبەرم وێزەویزانە و کایەی دەکەن،
هەروەتر لە نێوان ئاواتەکان و بیرگەلێک
چووکتر و شێتتر و گوناهکارتر لەوان



گەمارۆ دراوی ئاڵقەی ئێوە
ئێوە لاڵەکان، ئێوە بەدخەبەرەکان
کیژەپشیلەکان
دودو و زڵەخا
و من ئەبولهەولی ئاقار
دەمەوێ
هەستێکی زۆر لە وشەیەک دا جێ کەمەوە!
( خودا لەم گوناهە سەرزارەکییەم
خۆش بێ! )
لێرە دادەنیشم و باشترین هەوا قووت دەدەم
بە راستی، هەوای بەهەشت
هەوایەکی روون، سووک، زێڕکفت
بە باشی هەوایەک کە
سەردەمایەک ـ بە قسەی شاعیرە کۆنەکان ـ
لە مانگ داکەوتوە ـ
روون نیە بە هەڵکەوت بوە
یا لەبەر بەدجنسی
بەڵام من شک هەڵگرم
لەو شک دەکەم
چونکە من
لە ئورووپاوە دێم
کە لە هەر ژنێکی گەڕاوەی بە شوو
شک هەڵگرترە.

خودا ئەو بە ڕێگای ڕاست دا ڕێنوێنی بکا
ئامین!

بە کونی لووتم کە وەک پیاڵە زارکیان کردۆتەوە
ئەوم هەوا هەرە جوانە دەخۆمەوە.
بێ داهاتوو، بێ یادێک لە ڕابوردوو
من لێرە وەها دانیشتووم
ئەی خۆشەویستترین هاوڕێیان
چاو لە دارخورما دەکەم
کە هەروەک سەماکەرێک
لە سەر گردەی ڕانەکانیان دەچەمێنەوە و لار دەبنەوە
هەرکات کەسێک زۆر چاو لەو بکا
دەگەڵ ئەو ئاوا دەکا
وەک سەماکەرێک کە بە بڕوای من
زەمانێکی درێژ، پڕ مەترسی درێژ، وەستابێ
هەمیشە، هەمیشە لە سەر پێیەک
وا دیاری دەدا کە پێیەکەی دیکەی
لە بیر کردوە.
من لە خۆوە
لەو گەوهەر دوانەیە گەڕاوم
ـ یانی، لە پێیەکەی دیکە
لە پەنا داوێنی پیرۆزی
ئەو خۆشەویسترینە، ناسکترین داوێنە



ئەو داوێنە خڕ و بەخولەی پووڵەکەڕێژە.
ئادی، بڕوا بکەن
هاوڕێ جوانەکانم
ئەو ئەوی لە کیس داوە
ئەو لە کیس چوە
بۆ هەمیشە لە کیس چوە
پێیەکەی دیکەی!
مەخابن لە پێ نازەنینەکەی دیکە
لە کوێ لەوانەیە بە گریان و غەمەوە لە بیر چووبێتەوە؟
ئەو پێ تەنیایە؟
لەوانەی لە ترسی
شێر درنجێکی زێڕن یاڵی تووڕە؟
یا هەتا ئێستا لەت و پەت بوە ـ
بەستەزمانە، هاوار! هاوار، لەت و پەت بوە! سەلا.

ئاخ، ئیدی مەگرین
ئەی دڵە نەرمەکان!
ئیدی مەگرین
ئەی دڵی خورماکان
ئەی مەمکە پڕ شیرەکان!
ئەی شەکرنەیەکان ـ خوێن شیرنەکان!
پتر مەگری
دودوی ڕەنگ بزرکاو

پیاو بە، زڵەخا! بوێر! بوێر!
یا بەشکەم شتێکی هێزدەر، هێزدەری دڵ
لێرە بە جێ بێ!
قسەیەکی چەور و نەرم؟
پەندێکی رێک؟ -
ئەهای! راپەڕە، ئەی مەزنایەتی
ئەی مەزنایەتی ئورووپاییەکان!
بشنێ، دیسان بشنێ!
ئەهای!
دیسان بگوڕێنە!
بە ئەخلاقانە بگوڕێنە!
هەروەک شێری بە ئەخلاق لە ئاست کیژەکانی سارا!
چونکە ئەی کیژە خۆشەویستەکان
لووراندنی ئاکارباشانە
پتر لە هەر شتێکی دیکە
هۆی خۆشی ئورووپایی، برسیایەتی ئورووپاییە!
من نووکە لێرە
وەک ئورووپاییەک دەوەستم
لەوە بەدەر ناتوانم، خودا یارمەتیم بدە!
ئامین!
سارا هەڵدەدا: هاوار لەو کەسەی کە ساراکان دەشارێتەوە!



## بە خەبەری

### ١

دوای گۆرانی گوتنی ئاوارە و سێبەر، ئەشکەوت پڕ بوو لە قاوەقاو و پێکەنین: میوانەکانی کۆڕ تێکڕا پێکەوە قسەیان دەکرد و کەریش لەم نێوە دا هان درابوو و بێدەنگ نەمابوو، هەر ئەوە بوو بە هۆی ئەمە کە هەندێک بێزاری سەبارەت بەوان لە زەردەشت دا پێک بێ و بە چاوی سووک بڕوانێتە ئەوان: سەرەڕای ئەوە کە ئەو بۆ خۆشی لە شادی ئەوان شاد بوو، چونکە ئەمە بە بڕوای ئەو نیشانەی چاک بوونەوە بوو. لە دوایی لە ئەشکەوتەوە بەرەو هەوای ئازاد خزی و دەگەڵ گیاندارەکانی قسەی کرد.

ئەو گوتی: «هاواری هانای ئەوان بۆ کوێ چوە؟» هەر ئەودەم هەندێک دڵێشاوی تەواو بوو «وا دیارە کە لە لای من هاواری هانایان لە بیر کردوە! بەڵام، بە داخەوە، هێشتا هاوار کردنیان لە بیر نەکردوە.»

ئەوسا زەردەشت گوێیەکانی گرت، چونکە ئەودەم زەڕەی کەر بە چەشنێکی سەیر دەگەڵ هات و هەرای شادی مرۆڤە باڵاترەکان تێکەڵ ببوو.

ئەو دیسان دەستی بە قسە کردەوە: «ئەوان سەرخۆشن و کەس نازانێ لە کوێوە؟ لەوانەیە بە خەرجی خانەخوێ و ئەگەر ئەوان پێکەنین لە من فێر بوون، ئەو پێکەنینەی کە فێری بوون هێشتا پێکەنینی **من** نیە.

بەڵام چ قەیدی! ئەوانە تاقمێکی پیرن: ئەوانە بە داب و نەریتی خۆیان چاک دەبنەوە و بە داب و نەریتی خۆیان پێدەکەنن. گوێیەکانی من هەتا ئێستا تاقەتی دەنگی لەوە خراپتریان هێناوە و ناڕەحەت نەبوون.

ئیمڕۆ ڕۆژی سەرکەوتنە: ئەو بۆ دواوە دەکشێتەوە، ئەو رادەکا، ئەو **گیانقورسە**، دوژمنی سەرەکی کۆنم! ئەم ڕۆژەی کە وەها خراپ و دژوار دەستی پێکرد چەند خۆش دەیەوێ تەواو بێ!

دەیەوێ تەواو بێ. هەر ئێستا شەو دادێ: ئەو شۆڕەسوارە، سوار لە سەر پشتی دەریا داژوێ! ئەو شادخوازە، لە سەر زینی ئەرخەوانی چەند بە کەشم و نەشمەوە دێتەوە ماڵ!

ئاسمان بە روونی دەڕوانێتە ئەمە. جیهان، قورس بۆی خەوتوە: ئێوە ئەی ئەو سەیر و سەمەرانەی کە هاتوونە لای من، بە قازانجتانە دەگەڵ من بژین!»

وەهای گوت زەردەشت. و جارێکی دی هاوار و قاقای مرۆڤە باڵاترەکان لە ئەشکەوت بەرز بۆوە: ئەوسا سەرلەنوێ دیسان دەستی پێکردەوە:

«ئەوان چێشکەکەم بە دەمەوە دەگرن، چێشکەکەم شوێنی خۆی دادەنێ، دوژمنی ئەوان، ئەو گیانقورسە، لە بەرابەر ئەوانیش دا بۆ دواوە دەکشێتەوە. ئەوان بە خۆ پێکەنین فێر دەبن: ئایا دروست دەبیسم؟

چێشتی پیاوانەم، وتاری بە پێزی بە هێزم، شوێن دادەنێ: بە راستی، من ئەوانم بە سەوزی ویشک نا، بەڵکە بە خۆراکی شەڕکەران و سەرکەوتوان پێگەیاندوون: من ئاواتە تازەکانم هارووژاندوون.

لە دەست و پێیەکانیان دا هیواگەلێکی تازە هەیە، دڵەکانیان لێک ئاوەڵە دەکرێ. ئەوان پەیڤە نوێیەکان دەبیننەوە و بەم زوانە گیانیان لە هەوای بوێریی دا پشوو دەدا.

بێشک، وەها خۆراکێک نە بۆ منداڵان دەبێ و نە بۆ ژنانی پیر و لاوی بە هەوەس، چونکە ئەندەروونی ئەوانیان بەرەو رێگایەکی دیکە بردوە؛ من مامۆستا و حەکیمی ئەوان نیم.

بێز لە ئاست ئەم مرۆڤە باڵاترانە پاشەکشەی دەکا: زۆر باشە! ئەمە سەرکەوتنی منە. ئەوان لە هەرێمی من هێمنایەتیان دەست کەوتوە، شەرمی دەبەنگانە لەوان رادەکا و ئەوان خۆ دەتەکێنن.

ئەوان دڵەکانی خۆیان دەتەکێنن، دەمە باشەکان بۆیان دەگەڕێنەوە، ئەوان دیسان جەژن دەگرنەوە و کاوێژ دەکەن ـ ئەوان بوونەوە **شوکرانەبژێر**.

من **ئەوە** کە ئەوان بوونەوە شوکرانەبژێر، بە باشترین نیشانە دادەنێم. هێندەی پێناچێ کە ئەوان وە فکری ساز کردنی جەژن دەکەون و بە یادی هاوڕێ



کۆنەکانیان یادمانێک ساز دەکەن.

ئەوان **چاک بۆوەکانن**. زەردەشت بە شادییەوە بە دڵی خۆی وەهای گوت و روانییە دەرەوە؛ بەڵام گیاندارەکانی خۆیان بەوەوە نا و رێزیان لە شادی و بێدەنگی ئەو گرت.

## ٢

بەڵام لەپڕ گوێیەکانی زەردەشت خۆفیان تێکەوت: چونکە ئەشکەوتێک کە هەتا ئێستا پڕ لە قاوەقاو و قاقا بوو، لەنەکاو چوە نێو بێدەنگییەکی مەرگاساوە و هەڵم و بخوورێک کە عەتری دەنکی کاژی سووتاوی دەگەڵ بوو گەیشتە لووتی.

«چ قەوماوە؟ ئەوان چ دەکەن؟» وەهای لە خۆ پرسی و دزانە لە زارکی ئەشکەوت نزیک بۆوە هەتا بەدزی بڕوانێتە میوانەکانی. بەڵام، سەیر لە سەر سەیر! ئەوەی کە نەدەبا دیتبای بە چاوەکانی خۆی دیتی!»

«ئەوان جارێکی دی **دیندار** بوونەوە، ئەوان **عیبادەت** دەکەن، ئەوان شێت بوون!» وەهای گوت و سەرسوڕمانی لە رادە بەدەر بوو. بە راستی، هەموو ئەو مرۆڤە باڵاترانە، دوو پاشا و پاپی لە خزمەت وەلانراو، جادووگەری چەپەڵ، گەدای خۆویست، ئاوارە و سێبەر، پێشگۆی پیر، خاوەنی گیانی بە ویژدان و ناحەزترین مرۆڤ ـ گشتیان هەروەک منداڵ و پیرێژنە بە ئیمانەکان چۆکیان دادابوو و کەریان عیبادەت دەکرد. هەرئەودەم ناحەزترین مرۆڤ وە خڕە و هاش و هووش کەوت، وەها کە دەتگوت شتێکی لە گوتن نەهاتوو دەیەویست لە دەروونیەوە سەر هەڵبدا، کاتێک ئەو شتەی بە قسە دەربڕی، قسەکەی پێهەڵکوتنی موناجاتێکی زاهیدانە و نامۆ بۆ کەری پەرستراو و بخوراوی بوو. ئەو موناجاتە وەها زایەڵەی هات:

ئامین! هەتا هەتایە پەرستن و مەزنایەتی و زانایی و سپاس و پەسن و هێزی خودامان دەگەڵ بێ!

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

ئەو باری ئێمە دەبا، ئەو خۆی وەک غولام لێکردوە. لە قووڵایی دڵییەوە

سێبووره و قـەت ناڵێ «نا»؛ هەر کەس کە خودای خۆی خۆش دەوێ، ئەو تەمێ دەکا.

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

ئەو قسەیەک ناکا جگە لە «ئا» گوتن بەو دونیایەی کە خۆی ئافراندوویەتی: ئەو وەها دونیای خۆی دەپەرستێ. لەبەر ژیرییە کە قسە ناکا: وەها کەمتر تووشی هەڵە دەبێ.

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

لە دونیا دا بێ خۆ نواندن تێدەپەڕێ. ڕەنگی ئەو لەشەی کە ئاکارباشی خۆی پێدادەپۆشێ بۆرە. ئەگەر گیانێکی هەبێ ئەو دەشارێتەوە، بەڵام هەموو ئیمانیان بە گوێ درێژەکانی ئەو هەیە.

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

چ حیکمەتێکی شاراوەیە کە ئەو گوێی درێژی هەن و تەنیا «ئا» دەڵێ و قەت «نا» نابێژێ! ئایا ئەو دونیای وەک بیچمی خۆی نەئافراندوە، یانی هەتا ڕادەی گونجاو گەوجانە؟

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

تۆ بە ڕێگا ڕاست و خوارەکان دا دەڕۆی؛ تۆ کارت بەمە نیە کە بۆ ئێمە مرۆڤەکان خوار کامەیە و ڕاست کامە. پاشایەتی تۆ لەو لای چاکە و خراپەیە. بێگوناهی تۆ هەر ئەمەیە کە نازانی بێگوناهی چیە.

ـ بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

بڕوانە کە تۆ هیچ کەس لە خۆت دوور ناخەیەوە، نە گەداکان و نە پاشاکان. ئیزن بە منداڵە ساواکان دەدەی کە لێت نزیک بنەوە و هەروەک لاتە بەدخوازەکان تۆ ئازار بدەن، تۆ جگە لە «ئا ـ ئا» چی دیکە نازانی.

بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

تۆ دێڵەکەر و هەنجیری تازەت پێخۆشە، تۆ هەموو شتێک دەخۆی. کاتێک کە برسی بی چرپییەکی دڕکاوی دڵت قدیلکە دەدا. لەم کارە دا حیکمەتێکی خودایی هەیە.



بەڵام کەر بە دوای ئەو دا زەڕاندی: «ئا ـ ئا»

## جەژنی کەر

### ١

کاتێک موناجات گەیشتە ئێرە، زەردەشت ئیدی خۆی پێڕانەگیرا و تەنانەت لە کەر بەرزتر، هاواری کرد «ئا ـ ئا» و بازدی دا نێو میوانە هارەکانی خۆی و هەر ئەوجۆرەی کە عیبادەتکەرەکانی لە زەوی هەڵدەستاندەوە، هاواری کرد کە «ئەی منداڵانی مرۆڤ ئەوە چ دەکەن؟ هاوار بۆ ئێوە ئەگەر کەسێکی دیکە جگە لە زەردەشت ئێوەی دیتبا:

هەر کەسی دیکە وەهای حوکم دەدا کە ئێوە بە ئیمانی تازەی خۆتان بوونە خرابترین کافرەکان یا گێلترین پیرێژنەکان!

تۆ ئەی پاپی پیر، ئەوە چۆن لە تۆ دەوەشێتەوە کە لێرە کەرێک لە جیات خودا بپەرستی؟»

پاپ وڵامی داوە: «زەردەشت، لە کاروباری خودایی دا من لە تۆ پتر شارەزام. ئەمە کارێکی بەجێیە.

پەرستنی خودا بەم چەشنە باشتر لەوەیە کە ئەو بە هیچ چەشنێک نەپەرستی! لەم قسەیە رامێنە، دۆستی بەڕێزی من: هەتا دەستبەجێ تێبگەی کە لە وەها قسەیەک دا حیکمەتێک هەیە.

ئەو کەسەی کە گوتی «خودا رووحێکە» ـ گەورەترین هەنگاوێک کە هەتا ئێستا لە سەر رووی زەوی بەرەو بێئیمانی هەڵگیراوە، هەڵیگرت و گەورەترین بازی دا: قەرەبوو کردنەوەی وەها قسەیەک لە سەر رووی زەوی هاسان نیە!

دڵی پیری من لەوە کە هێشتا لە سەر رووی زەوی شتێک بۆ پەرستن هەیە لە خۆشیان هەڵبەزهەڵبەزیەتی. ئەی زەردەشت، لە دڵی پاپێکی دینداری پیر خۆش بە!»

زەردەشت بە ئاوارە و سێبەری گوت: «تۆ، تۆیەک کە خۆت بە ئازادەگیان ناو دەبەی و دەزانی، لێرە وەها بوتپەرستی  و مجێوری دەکەی؟

بە راستی، ئەو کارەی کە تۆ لێرە دەیکەی خراپتر لەوەیە کە دەگەڵ کیژە رەشتاڵە پرمەترسییەکانی خۆت دەتکرد، ئەی نەودینی کرێت!»

ئاوارە و سێبەر وڵامی داوە: «زۆر خراپە، هەق بە تۆیە: بەڵام من چم پێدەکرێ! کۆنەخودا دەستی بە ژیان کردۆتەوە، ئەی زەردەشت، تۆ هەرچی دەڵێی بیڵێ!

ئەمە گوناهی ناحەزترین مرۆڤە: ئەوە کە جارێکی دی ئەوی بە خەبەر هێناوەتەوە. ئەگەر دەڵێ کە رۆژێک ئەوی کوشتوە: مەرگ سەبارەت بە خوداکان خەیاڵێکی خاوە.»

زەردەشت گوتی: «تۆ، ئەی جادووگەری پیری چەپەڵ، تۆ چت کردوە؟ ئەگەر تۆ ئیمانت بە وەها کەر ـ خودایەک هەبێ، لەم سەردەمەی ئازادی دا ئیدی کێ ئیمانی بە **تۆ** دەبێ؟

ئەمە چ گەوجایەتییەک بوو کە کردت؟ چلۆن زیرەکێکی وەک تۆ دەتوانێ وەها گەوجایەتییەک بکا!»

جادووگەری زیرەک وڵامی داوە: «زەردەشت، هەق بە تۆیە، ئەمە گەوجایەتی بوو و کردنەکەشی بۆم دژوار بوو.»

زەردەشت بە پیاوی بە ویژدانی گوت: «تۆ، ئەنگوستت لە سەر لوتت دانێ و رامێنە: ئایا لێرە شتێک نیە کە دژی ویژدانی تۆ بێ؟ مەگەر ویژدانی تۆ لەوە پاکتر نیە کە دەگەڵ وەها نوێژ دابەستنێک و چرەدووکەڵی ئەم زاهیدانە یەک نەگرێتەوە؟»

پیاوی بە ویژدان ئەنگوستی لە سەر لووتی دانا و وڵامی داوە: «لەم نمایشە دا شتێک هەیە کە دەگەڵ ویژدانی من یەک دەگرێتەوە.

لەوانەیە من نابێ ئیمانم بە خودا هەبێ: بەڵام بەبێ شک، خودا بەم چەشنە بۆ من لە هەموان پتر جێی باوەڕ پێکردنە.

بە شاهیدی زاهیدترین کەس، خودا دەبێ هەرمان بێ: ئەو کەسەی کە ئەو



هەموو کاتەی هەیە، دەبێ کات بگوزەرێنێ، ئەویش بە ئارامترین و گەوجانەترین شێوەی گونجاو: وەها کەسێک دەتوانێ لەم رێگایە دا هەنگاوی گەورە هەڵێنێتەوە.

ئەو کەسەی کە پتر لە رادە گیان و هۆشی هەیە، لەوانەیە گیرۆدەی گەوجایەتی و شێتایەتی بێ. چاو لە خۆت بکە، زەردەشت!

بە راستی، تۆ خۆشت لەبەر پڕایی و فرەزانی لەوانەیە کەر بی.

مەگەر زۆر فرەزان پێ نانێتە سەر رێگا هەرە خواروخێچەکان؟ رواڵەت وا نیشان دەدا، ئەی زەردەشت ـ رواڵەتی تۆ!»

زەردەشت رووی لە ناحەزترین مرۆڤ کرد کە هێشتا بە سەر زەوی دا کەوتبوو و دەستەکانی بۆ لای کەر درێژ کردبوو (چونکە شەڕابی دەرخوارد دەدا)، پێیگوت: «لە ئاکام، تۆ، تۆ ئەی لە گوتن نەهاتوو، بڵێ کە چت کردوە!

تۆ شێواوی، چاوەکانت هەڵگڕاون. جلی پایەبەرزیت، ناحەزێتیت دادەپۆشێنێ: تۆ چت کردوە؟

ئایا راستە کە تۆ جارێکی دی ئەوت وەخەبەر هێناوەتەوە؟ بۆچی؟ مەگەر ئەو لەخۆڕا کوژرابوو و وەلا نرابوو؟

تۆ خۆشت وەخەبەر هاتوو دیاری: تۆ چت دەکرد؟ **تۆ** بۆچی باتداوە؟ **تۆ** بۆچی دیسان بۆ لای چوویەوە؟ بڵێ، ئەی لە گوتن نەهاتوو!»

ناحەزترین مرۆڤ گوتی: «تۆ رەزیلی، زەردەشت!

لە تۆ دەپرسم: کام یەک لە ئێمە باشتر دەزانێ کە **ئەو** زیندوویە یا لە سەرڕاوە ژیاوەتەوە یا لە بنەڕەت دا مردوە؟

بەڵام من شتێک دەزانم ـ و ئەمەش رۆژێک لە تۆ فێر بووم، زەردەشت: ئەوەی کە دەیەوێ لە بنەڕەتەوە بکووژێ، **پێدەکەنێ**.

بە پێکەنینەوە دەکووژن نە بە تووڕەییەوە ـ تۆ رۆژێک وەهات گوت، ئەی نهێنکار، ئەی فەوتێنەری بێتووڕەیی، ئەی قەدیسی پڕ مەترسی ـ تۆ رەزیلی!»

## ٢

بەڵام وەها ڕێکەوت کە زەردەشت لە وەها وڵامگەلێکی تەواو ڕەزیلانە سەری سوڕما و بۆ لای زارکی ئەشکەوتەکەی بۆ پاش بازی دا و ڕووی لە میوانەکانی خۆی کرد و بە دەنگێکی زل هاواری کرد:

«ئەی شێتە ڕەزیلەکان، ئەی ویشکەڕنەکان! بۆ لە ئاست من دووڕوویی و نهێنکاریی دەکەن!

کەچی دڵی دانە بە دانەتان لە شادی و قۆشمەیی لە خۆی دەبێتەوە، چونکە ئێوە، لە ئاکام، بوونەوە منداڵی ساوا، یانی دیندار ـ

کە لە ئاکام، هەروەک منداڵ دەجووڵێنەوە، یانی دەستەکانتان وێک دەنێن و دوعا دەکەن و دەڵێن «خودای دڵاوا»!

بەڵام نووکە لەم منداڵخانەیە، یانی ئەشکەوتی من وەدەر کەون کە ئیمڕۆ بۆتە ماڵی هەمە چەشنە منداڵێک. گەرمای کایەی منداڵانە و هات و هەرای دڵەکانتان لە دەرەوە دامرکێنن.

بێشک: هەتا وەک منداڵی ساواتان لێنەیە، ڕێ دە مەلەکووتی ئاسمان نابەن. (و زەردەشت بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ سەرەوە کرد.)

بەڵام ئێمە بە هیچ لەونێک داخوازی چوون بۆ مەلەکووتی ئاسمان نین: چونکە ئێمە بووینە پیاو ـ **کەوایە ئێمە مەلەکووتی زەویمان دەوێ.**»

## ٣

زەردەشت جارێکی دی دەستی بە قسە کردەوە: «هاوڕێیانی تازەی من، ئەی سەیر و سەمەرەکان، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، نووکە ئێوە چەندە بە دڵی منن ـ

چونکە جارێکی دی شاد بوونەوە! بە ڕاستی، هەمووتان پشکووتوون؛ بە بڕوای من، گوڵێکی وەک ئێوە جەژنی نوێی پێویستە ـ

هەندێک بزڕکاندنی بوێرانە، ماوەیەک پەرستنی خودا و جەژنی کەر، ماوەیەک شێتبازی زەردەشتی شادی پیر، و باهۆز کە بە هەڵکردنی خۆی ڕەوانەکانی ئێوە



ڕوون دەکاتەوە.

ئەم شەوە و ئەم جەژنی کەرە لە بیر مەکەن، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان؟ ئێوە ئەمەتان لای من ساز کرد و من ئەوە بە خێر دادەنێم ـ چونکە تەنیا چاک بوان وەها شتگەلێک ساز دەکەن!

هەرکات ئەم جەژنەتان پێک هێنا، ئەم جەژنی کەرە، بۆ خاتری من و بۆ خاتری خۆتان پێکی بێنن! و بۆ بیرەوەری من!»

وەهای گوت زەردەشت.

# سترانی مەستانە

## ١

بەڵام لەم نێوە دا یەک بە دوای یەک، بەرەو هەوای ئازاد و بۆ دەروونی شەوی ساردی بیرهەژێن، هەنگاویان هەڵێناوە؛ بەڵام، زەردەشت خۆشی بن هەنگڵی ناحەزترین مرۆڤی گرتبوو هەتا دونیای شەوانە و مانگی خڕی گەورە و ئاوهەڵدێرە زێوینەکانی نزیک ئەشکەوتەکەی پێ نیشان بدا. بەمجۆرە، ئەو تاقمە یەکسەر پیرە، بێدەنگ لە پەنا یەک وەستان، بەڵام بە دڵگەلێکی ئاسوودە و بوێر و لە نێو خۆیان دا حەیران لەوە کە لە سەر زەوی چەندە خۆشیان لێدەگوزەرێ؛ بەڵام ڕازی شەو لە دڵەکانیان نزیک و نزیکتر بۆوە. زەردەشت جارێکی دی دەگەڵ خۆی بیری کردەوە کە: «نووکە ئەوان چەندە لەبەر دڵی منن، ئەم مرۆڤە باڵاترانە!» ـ بەڵام لەبەر ڕێز لە شادی و بێدەنگیان ئەم قسانەی دەرنەبڕی.

بەڵام ئەودەم شتێک ڕووی دا کە لەو ڕۆژە درێژە سەیرە دا، سەیرترین شت بوو: ناحەزترین مرۆڤ جارێکی دی و بۆ دوایین جار خڕەخڕ و هاش و هووشی دەست پێکرد، کاتێک وە قسە هات، بڕوانە، پرسیارێکی خڕ و خاوێن لە زاری دەرپەڕی، پرسیارێکی باش و قووڵ و ڕوون، کە دڵی بیسەرەکانی ڕفاند.

ناحەزترین مرۆڤ گوتی: «ئەی گشت هاوڕێیانی من، بیر لە چ دەکەنەوە؟ لەبەر ئەم ڕۆژە ـ من بۆ یەکەم جار لە تەواوی ژیانم ڕازیم.

رازی بوون بەو شاهیدییەم بۆ بەس نیە. ژیان لەسەر زەوی بە بایەخە. یەک ڕۆژ، یەک جەژن دەگەڵ زەردەشت منی فێرە ئەویندار بوون بە زەوی کرد.

دەمەوێ بە مەرگ بێژم: **ئەمە** بوو ـ ژیان؟ کەوایە جارێکی دیکەش!

هاوڕێیانی من، دەڵێن چی؟ ئێوەش ناتانەوێ وەک من بە مەرگ بێژن: **ئەمە** بوو ـ ژیان؟ بۆ خاتری زەردەشت، کەوایە، جارێکی دیکەش!»

وەهای گوت ناحەزترین مرۆڤ و بەڵام ئەودەم هێندەی بۆ نیوەشەو نەمابوو. پێتانوایە ئەودەم چ قەوما؟ مرۆڤە باڵاترەکان کاتێک پرسیاری ئەویان بیست، لەپڕ لە گۆڕان و چاک بوونەوەی خۆیان ئاگادار بوون و زانیان کە کێ ئەوەی پێبەخشیون: ئەوسا بەرەو زەردەشت هەلینگیان دا و هەر کام بە داب و نەرێتی خۆی، هەندێک بە پێکەنین و هەندێکیان بە گریان، خەریکی شوکرانەبژێری و ڕێزگرتن و راموسانی دەستی زەردەشت بوون. بەڵام پێشگۆی پیر لە خۆشیان سەمای دەکرد و هەر چەند بە قسەی هەندێک کە دەگێڕنەوە سەرخۆش لە شەڕابی شیرین بوو، بێشک لە ژیانی شیرین سەرخۆشتر بوو و لە گشت ماندوویەتییەک حەسابۆوە. هەروەها دەگێڕنەوە کە کەریش لەم نێوە دا وە سەما کەوتبوو: چونکە پێشتر لەمە ناحەزترین مرۆڤ لەخۆوە شەڕابی دەرخوارد نەدابوو. ئێستا وا بووبێ یان نا، چ کەر بە راستی لەو شەوە دا سەمای کردبێ یان نا، ئەوسا شتێکی گەورەتر و سەیرتر لە سەمای کەر قەوما. بە کورتی، هەرەوک پەند و مەتەڵی زەردەشت دەڵێ: «چ قەیدی!»

## ۲

کاتێک وەها بە سەر ناحەزترین مرۆڤ دا تێپەڕی، زەردەشت هەروەک مەستێک وەستا: چاوەکانی ڕەشکە و پێشکەیان دەکرد، زمانی گیرا و پێیەکانی شل بوونەوە. کێ دەیزانی چ بیرگەلێک بە ڕەوانی زەردەشت دا رادەبرن؟ بەڵام، گیانی بە ئاشکرا گەڕاوە دواوە و رایکرد و لە دوورەدەستان بوو و هەروەکی نووسیویانە «لە سەر تەپکێکی بەرز لە نێوان دوو دەریا، مینا هەورێکی قورس لە نێوان رابوردوو و داهاتوو دا دەخولاوە» بەڵام کاتێک مرۆڤە باڵاترەکان ئەویان دەباوەش گرت، هەندێک هاتەوە سەر خۆ و بە دەست ئاپوورەی جەماعەتی



ڕێزگری لادا، بەڵام هیچی نەگوت. کەچی توند ئاوڕی داوە، وەها کە دەتگوت گوێی لە شتێک هەڵخستوە: ئەوسا ئەنگوستی لە سەر زار دانا و گوتی: «وەرن!»

دەستبەجێ بێدەنگی و حاڵەتێکی پڕ لە راز دەوروبەری داگرتن؛ بەڵام لە قووڵاییەوە ئارام ئارام دەنگی زەنگ دەهات. زەردەشتیش هەروەک مرۆڤە باڵاترەکان گوێی لێڕاگرت و ئەوسا جارێکی دی ئەنگوستی لە سەر زار دانا و دیسان گوتی «وەرن! وەرن! نیوەشەو دادێ.» و دەنگی گۆڕابوو، بەڵام هێشتا لە جێگاکەی نەدەجووڵاوە. دیسان هەموو شت بێدەنگتر و پڕ لە رازتر بوو و گشتیان گوێیان لێڕاگرتبوو، تەنانەت کەر و گیاندارانی بەڕێزی زەردەشت، هەڵۆ و مار و هەروەتر ئەشکەوتی زەردەشت و مانگی ساردی مەزن و شەویش. بەڵام زەردەشت بۆ سێهەمین جار دەستی لە سەر زاری دانا و گوتی:

«وەرن! وەرن! وەرن! وەرن نووکە بخولێنەوە! کات داهاتوە: وەرن لە شەو دا بخولێینەوە!»

## ۳

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، نیوەشەو داهاتوە: کەوایە دەمەوێ شتێک دە گوێتان دا بێژم، هەر ئەوجۆرەی کە ئەو زەنگە کۆنە دە گوێی من دا دەڵێ ـ

وەها پڕ لە راز، وەها بە سام، وەها نزیک کە ئەو زەنگەی نیوەشەو بە من دەڵێ، ئەوەی کە ترپەی بە ژانی دڵی باوکەکانتانی ژماردوە ـ ئاخ! ئاخ! چ ئاخێک هەڵدەکێشێ! چلۆن لە خەو دا پێدەکەنێ! نیوەشەوی پیری قووڵی قووڵ!

بێدەنگ! بێدەنگ! لێرە گشت شت دەبیسرێ کە لە ڕۆژ دا ئیزنی دەنگ هەڵبڕینی نیە، بەڵام نووکە لە هەوای سارد دا تەواوی هات و هەرای دڵەکانی ئێوەش دامرکاون. ـ

نووکە قسە دەکا، نووکە دەبیسرێ، نووکە دەخزێتە نێو ڕەوانە شەونخوونەکان: ئاخ! ئاخ! چ ئاخێک هەڵدەکێشێ! چلۆن لە خەو دا پێدەکەنێ! ـ

ئایا نابیسی کە چەند بە راز و بەسام و نزیک دەگەڵ تۆ دەدوێ، نیوەشەوی پیری قووڵی قووڵ!

## ٤

هاوار لە من! زەمان چۆتە کوێ؟ ئایا لە چاڵاوە قووڵەکان دا نەخنکاوم؟ دونیا خەوتوە ـ

ئاخ! ئاخ! سەگ دەلوورێنێ، مانگ دەدرەوشێتەوە. واباشترە کە بمرم، کە بمرم بەڵام بە ئێوە ناڵێم کە دڵی نیوەشەوییم نووکە بیر لە چی دەکاتەوە.

هەنووکە مردووم، ئیدی تەواو بوو. ئەی جاڵجاڵۆکە چ لە دەورەم دەتەنی؟ خوێنت دەوێ؟ ئاخ! ئاخ! ئاونگ دادەکەوێ، کات دادێ ـ

ئەو کاتەی کە تێی دا دەلەرزێم و دەژاکێم، ئەو کاتەی کە دەپرسێ و دەپرسێ و دەپرسێ: «کێ ئەو دڵەی هەیە؟

کێ دەبێ ببێتە سەرۆکی زەوی؟ کێ دەڵێ: وەها دەبێ برۆن، ئەی رووبارە گەورە و چووکەکان!»

کات نزیک دەبێتەوە: ئەی رەوان، ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، وریا بن! ئەم قسەیە بۆ گوێ هەستیارەکانە، بۆ گوێیەکانی تۆ ـ **نیوەشەوی قووڵ چ دەبێژێ؟**

## ٥

لەخۆ بوومەوە، رەوانم سەما دەکا. کاری رۆژانە! کێ دەبێتە سەرۆکی زەوی؟

مانگ سارده و با بێدەنگ. ئاخ! ئاخ! ئێوە ئەوند کە پێویستە بەرز بوونەوە؟ ئێوە سەما دەکەن: بەڵام قاچێک ناتوانێ باڵ بێ.

ئەی سەماکەرە باشەکان، سەردەمی خۆشییەکان تەواو بوە: شەڕاب گەیشتۆتە دەرد و جامەکان دەشکێن. گۆڕەکان لاڵەپەتەن.

ئێوە ئەوەند کە پێویستە بەرز نەبوونەوە: نووکە گۆڕەکان لاڵەپەتانە دەدوێن: مردوەکان رزگار بکەن! بۆچی شەو وەها درێژە؟ ئایا مانگ ئێمەی مەست نەکردوە؟»



ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، گۆڕەکان رزگار بکەن، جەندەکەکانن هەستێنن! ئاخ! بۆچی کرم هێشتاش هەر رەهەند لێدەدا؟ نزیک دەبێتەوە، کات نزیک دەبێتەوە ـ

زەنگ دەزرینگێتەوە، دڵ هێشتا هەر ترپەی دێ، کرمی دار، کرمی دڵ هێشتا هەر رەهەند لێدەدا، ئاخ! ئاخ! دونیا قووڵە.

## ٦

چەنگی خۆشاهەنگ، چەنگی خۆشاهەنگ! دەنگی تۆم پێخۆشە، بڵقەبڵقی شوومی مەستانەت! ـ دەنگت لە چ دوورەزەمان و چ دوورەدەستانەوە دەگاتە من، لە زۆنکاوەکانی ئەوینەوە!

ئەی زەنگی کۆن! ئەی چەنگی خۆشاهەنگ! گشت دەردێک رژاوەتە نێو دڵت، دەردی باوک، دەردی باوکان، دەردی باپیران، قسەت پوخت بوە ـ

پوخت هەروەک پاییزی زێڕن و بەرەبەیان، وەک دڵی خەڵوەنشینی من ـ نووکە تۆ دەڵێی: دونیا خۆی پوخت بوە، ترێ پێدەگەن ـ

نووکە ئەو دەیەوێ بمرێ، لە بەختیارییان بمرێ. ئەی مرۆڤە باڵاترەکان،ئایا بۆنەکانی هەست پێناکەن؟ بۆنێکی نهێنی بەرز دەبێتەوە ـ

بۆن و بەرامەیەکی هەرمانەتی، عەتری شەڕابی زێڕنی رەنگ تاری بەختیاری کۆن، عەتری دڵڕفێنی گوڵی سوور،

کێ سەبارەت بە بەختیاریی مەرگی مەستانە لە نیوەشەو دا گۆرانی دەڵێ: دونیا قووڵە، **قووڵتر لەوەی کە رۆژ بیری لێکردۆتەوە!**

## ٧

بەرمەدە! بەرمەدە! من لەوە پاکترم کە بە کەلکی تۆ بێم. ئایا دونیای من هەنووکە کامل نەبوە؟

پێستی من لەوە پاکترە کە دەستەکانی تۆی شایەن بن. بەرمەدە، ئەی رۆژی گێژ و وێژی بێزمان! ئایا نیوەشەو رووناکتر نیە؟

هەرە پاکەکان دەبێ ببنە سەرۆکی دونیا، هەرە نەناسیاوەکان، هەرە بەهێزەکان، رەوانە نیوەشەوییەکان، کە لە گشت رۆژێک رووناکتر و قووڵترن.

ئەی رۆژ، کوێرانە بە شوێنم دا دەست دەکوتی؟ بە دوای بەختیاری منەوەی؟ ئایا ساماندارم؟ تەنیا؟ خەزێنەیەکی زێڕ؟ گەنجینەیەکم بۆ تۆ؟

ئەی دونیا **منت** دەوێ؟ وەک دونیام؟ رووحانیم؟ وەک خودام؟ بەڵام ئەی رۆژ، ئەی دونیا ئێوە گەلێک خاون ـ

دەبێ دەستگەلێکی زیرەکتان هەبێ، دەستگەلێکی درێژکراو بەرەو بەختیاری قووڵتر، بەرەو نابەختیاری قووڵتر، بەرەو خودایەک نەک بەرەو من ـ

نابەختیاری من، بەختیاری من قووڵە، ئەی رۆژی سەیر، بەڵام من نە خودام، نە دۆزەخی خودا: **رەنجی ئەو قووڵە.**

## ٨

رەنجی خودا قووڵترە، ئەی دونیای سەیر! دەست بەرەو رەنجی خودا درێژ بکە نەک بەرەو من! من چیم؟ چەنگێکی مەستی خۆشاهەنگ ـ

چەنگێکی نیوەشەویی، زەنگێکی شووماهەنگ کە کەس تێیناگا، بەڵام **دەبێ** بۆ کەڕەکان بدوێ، بۆ ئێوە مرۆڤە باڵاترەکان! چونکە ئێوە لە من ناگەن.

ئەی تێپەڕیو! ئەی تێپەڕیو، ئەی لاوەتی! ئەی نیوەڕۆ! ئەی بەرەبەیان! نووکە تاریکان دادێ و شەو و نیوەشەو ـ سەگ دەلوورێنێ، یانی با:

مەگەر با سەگ نیە؟ ئەو دەنووزێنێ، دەلوورێنێ و دەوەڕێ. ئاخ! ئاخ! چ ئاخێکی هەڵدەکێشێ نیوەشەو؟ چلۆن پێدەکەنێ، چلۆن پرخەی دێ و هانکەهانکیەتی!

نووکە چ وشیار دەدوێ، ئەم ژنە شاعیرە مەستە! لەوانەیە مەستی کردبێتە بەدمەستی، لەوانەیە زووتر هەستێندراوە؟ لەوانەیە کاوێژ دەکا؟

لە خەو دا رەنجەکەی کاوێژ دەکا و لەو پتر لەزەتەکەی، نیوەشەوی پیری قووڵ. چونکە هەر چەند کە رەنج قووڵە بەڵام **لەزەت قووڵترە لە مەینەتی دڵ.**



## ٩

ئەی دارەمێو، بۆچ دەمپەرستی؟ من بووم کە تۆم بڕیوە! من دڵڕەقم، تۆ برینداری: رێزی تۆ لە دڵڕەقی مەستانەی من بۆ چیە؟

تۆ وەها دەڵێی: «ئەوەی کە کامل بوە، ئەوەی کە گەیشتوە داخوازی مەرگە!» بژی، بژی، کێردی ترێچنی! بەڵام ئەوەی کە نەگەیشتوە ژیانی دەوێ: مخابن!

رەنج دەڵێ: «دوور کەوە، بڕۆ ئەی رەنج!» بەڵام ئەوەی کە رەنج دەچێژێ، دەیەوێ بژی هەتا پێبگا و شاد و تامەزرۆ بێ ـ

تامەزرۆی شتە دوورترەکان، سەرووترەکان، رووناکترەکان. ئەوەی کە رەنج دەچێژێ وەها دەبێژێ: «من میراتبەرم دەوێ، من منداڵم دەوێ، من **خۆم** ناوێ.»

بەڵام لەزەت نە میراتبەری دەوێ نە منداڵ ـ ئەو خۆی دەوێ، هەرمانەتی، گەڕانەوە، ئەو هەموو شتێکی هەرمانی هەر ئەوجۆرەی کە هەیە دەوێ.

رەنج دەڵێ: «بیشکێنە، خوێنی بڕێژە، ئەی دڵ! ئەی پێ، بگەڕێ! ئەی باڵ، بفڕە! ئەی دەرد، هەستە، راپەڕە!» بەڵام، وەرە ئەی دڵی پیر: رەنج دەڵێ **«بمرە!»**

## ١٠

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان چۆنی تێدەگەن؟ ئایا من پێشگۆیەکم؟ خەون دیتوویەک؟ مەست؟ خەون ماناکەرەوەیەک؟ زەنگێکی نیوەشەوم؟

دڵۆپێک ئاونگ؟ عەتر و بەرامەیەکی هەرمانەتی؟ ئایا نایبیسن؟ ئایا بۆنی ناکەن؟ دونیای من هەنووکە کامل بوە، نیوەشەویش نیوەڕۆیە ـ

دەردیش لەزەتێکە، نفرینیش ئافەرینێکە، شەویش هەتاوێکە ـ دوور کەونەوە دەنا فێر دەبن کە زاناش شێتێکە.

ئایا قەت ئاتان بە لەزەتێک گوتوە؟ کەوایە، هاوڕێیانی من، ئێوە ئاتان بە گشت رەنجیش گوتوە. شتەکان هەموو لێک زنجیر کراون، بە لێزگەیەک بەستراونەوە، ئەسیری ئەوینی یەکدین ـ

ئەگەر شتێک کە جارێک هاتوە دیسان بتانەوێتەوە، ئەگەر گوتبێتان: «ئەی بەختیاری، لەبەر دڵانی، تاوێک بمێنەوە!» کەوایە ئێوە گشت شتێکتان دەوێ کە بگەڕێتەوە ـ

گشت شتێکتان سەر لە نوێ، گشت شتێکتان هەرمان، گشت شتێکتان لێک زنجیرکراو، بە لێزگەیەک، ئەسیری ئەوینی یەکدی دەوێ. ئادی، ئێوە دونیاتان وەها **خۆش دەوێ** ـ

ئێوە هەرمانەکان، ئەوتان هەمیشە و هەرمان خۆش ویستوە: بە ڕەنجیش دەڵێن: دوور کەوە، بەڵام بگەڕێوە! **چونکە هەر لەزەتێک هەرمانەتی دەوێ!**

## ١١

هەر لەزەتێک گشت شتێکی بە هەرمانی دەوێ، هەنگوینی دەوێ، دەردی دەوێ، نیوەشەوی مەستی دەوێ، گۆڕەکانی دەوێ، فرمێسکی ئارامدەری پەنا گۆڕەکانی دەوێ، سوورایی زێڕکفتی ئێوارانی دەوێ ـ

لەزەت **چیهای** کە ناوێ! ئەو تینووتر، بەسۆزتر، برسیتر، بە سامتر، پڕ رازتر لە هەر ڕەنجێکە، ئەو خۆی دەوێ، ئەو بە خۆیەوە دەدا، ویستی ئاڵقە لەو دا دەگەڵ خۆی کێشەیەتی ـ

ئەو ئەوینی دەوێ، ئەو بێزاری دەوێ، ئەو ئەنگڕاوە، ئەو دەبەخشێ، فڕێ دەدا، دەپاڕێتەوە کە کەسێک پەسنی بکا و سپاسی پەسنکەر دەکا، ئەو پێیخۆشە کە لێی بێزار بن ـ

وەها دەوڵەمەندە لەزەتێک کە، تینووی ڕەنجە، تینووی دۆزەخ، بێزاری، سووکایەتی، تینووی ئەوەی کەگردەنشینە، تینووی **دونیا** ـ ئەم دونیایە، ئاخ، ئادی ئێوە ئەو ناناسن.

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، لەزەت تامەزرۆی، ئێوەیە، ئەم سەربزێوە پیرۆزە تامەزرۆی ڕەنجی ئێوەیە، ئێوە سەرنەکەوتوان. هەر لەزەتێکی هەرمان تامەزرۆی خەڵکی سەرنەکەوتوویە.

چونکە هەر لەزەتێک خۆی دەوێ، لەبەر ئەوە داواکاری مەینەتە! ئەی



بەختیاری! ئەی دەرد! ئاخ، بشکێ ئەی دڵ! ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، فێر بن کە لەزەت هەرمانەتی دەوێ،

لەزەت گشت شتێکی هەرمان دەوێ، **داخوازی هەرمانەتی قووڵی قووڵە!**

## ١٢

نووکە سترانی من فێر بوون؟ لە ماناکەی گەیشتن؟ هەیهات! وەرن ئەی مرۆڤە باڵاترەکان و نووکە لاوکی من بڵێنەوە!

نووکە بیڵێنەوە ئەو سترانەی کە ناوی «جارێکی دی»ە و ماناکەی «هەتا هەرمانەتی»یە ـ

لاوکی زەردەشت بڵێنەوە ئەی مرۆڤە باڵاترەکان!

ئەی مرۆڤ! وریا بە!

نیوەشەوی قووڵ چ دەبێژێ؟

خەوتبووم، خەوتبووم

لە خەوی قووڵ هەستاوم

دونیا قووڵە

قووڵتر لەوەی کە ڕۆژ بیری لێکردۆتەوە

ڕەنجی ئەو قووڵە

لەزەت قووڵترە لە مەینەت

ڕەنج دەڵێ: بمرە!

بەڵام هەر لەزەتێک هەرمانەتی دەوێ

هەرمانەتی قووڵی قووڵ

## نیشانە

بەڵام، بەیانی دوای ئەو شەوە، زەردەشت لە سەر نوێنی خۆی راپەڕی پشتبەندەکەی بەست و لە ئەشکەوتی خۆی دەرکەوت، درەوشاوە و بە هێز، مینا هەتاوی بەرەبەیان کە لە پشت کێوە تاریکەکان سەر دەربێنێ.

هەر ئەو جۆرەی کە رۆژێک بەرلەمە گوتبووی، گوتی: «ئەی هەسێرەی مەزن ، ئەی چاوی قووڵی بەختیاری، تۆ چ بەختیارییەکت دەبوو ئەگەر نەبان **ئەوانەی** کە بۆیان دەدرەوشێیەوە!

ئەگەر ئەوەدەم کە بەخەبەر و هەڵاتووی و خەریکی بەشینەوە و دابەشینی، ئەوان لە ژوورەکانیان دا مابانەوە، شەرمی بە غرووری تۆ چەندە تووڕە دەبوو!

هەیهات، ئەوان هێشتا خەوتوون، ئەم مرۆڤە باڵاترانە، بەڵام **من** بەخەبەرم: **ئەوانە** هاوڕێی راستەقینەی من نین! لەبەر ئەوانە نیە کە من لێرە، لە کوێستانی خۆم، چاوەڕێم.

دەمەوێ بچمەوە سەر کار و سەر رۆژی خۆم: بەڵام ئەوان نازانن کە نیشانەکانی بەرەبەیانی من کامەن. ترپەی هەنگاوی من بۆ ئەوان سەڵای هەستان نیە.

ئەوان هێشتا لە ئەشکەوتی من دا خەوتوون، خەونەکەیان هێشتا لە سترانە مەستانەکانی من دەخواتەوە. بەڵام گوێیەک کە بۆ من هەڵخسترابێ ـ **گوێی بە فەرمان** لە دەست و پێی ئەوان دا نیە.»

هەروا کە هەتاو هەڵدەکشا، زەردەشت ئەو قسانەی بە دڵی خۆی گوت. ئەوسا پرسا چاوی لە ئاسمان بڕی، چونکە لە بان سەری خۆی سیرەی تیژی هەڵۆکەی بیستبوو. زەردەشت روو لە سەر هاواری کرد: «زۆر باشە! وەها بە دڵی من و وەها شیاوی منە. گیاندارەکانم بەخەبەرن، چونکە من بەخەبەرم.

هەڵۆکەم بەخەبەرە و هەر وەک من هەتاو دەپەرستێ. ئەو بە چنگی هەڵۆوە دەست بۆ شۆقی تازە درێژ دەکا. ئێوە گیاندارانی راستەقینەی منن، ئێوەم خۆش



دەوێ.

بەڵام هێشتا مرۆڤی راستەقینەی خۆم نیە!»

وەهای گوت زەردەشت؛ بەڵام وا رێکەوت کە لەپڕ دەنگی باڵندەیەکی لە رادەبەدەر زۆری بیست کە پۆل پۆل بە باڵ وەشاندن دەورەیان داگرت و جیک و هەرای ئەم هەمو باڵە و زەختی دەوروبەری سەری هێندە بوو کە چاوی قووچاند. بە راستی، دەتگوت هەورێک کەوتبوو بان سەری، هەورێک کە بارانێک تیر بە سەر دوژمنێکی تازە دا داباریێنێ. بەڵام ئەمە هەورێک لە ئەوین بوو لە سەر دۆستێکی تازە.

«چم بە سەر دا تێپەڕی» زەردەشت لە دڵی واقوڕماوی خۆی دا وەهای بیر کردەوە و ئارام لە سەر گاشەبەردێک کە لەبەر زارکی ئەشکەوتەکەی بوو، دانیشت. بەڵام لەم نێوە دا کە دەستی لە دەوروبەر و سەر و خوار دەگێڕا و باڵندە دڵاواکانی دەتاراند، بڕوانە کە شتێکی سەیرتر قەوما: چونکە لە نەکاو دەستی وە یاڵ و بژێکی چڕ و گەرم کەوت و هەرئەوەدەم نەڕەیەک لە بەرابەری دەنگی داوە ـ نەڕەی نەرم و بەقەوی شێرێک.

زەردەشت گوتی: «نیشانە داهاتوە» و دڵی بووراوە. بە راستی، کاتێک بەرابەری رووناک بوو، گیاندارێکی رەنگ زەردی بە شکۆی لە پێش پێی خۆی بینی کە سەری لە ئەژنۆی ئەو هەڵدەسوو و لەبەر خۆشەویستییەکی کە پێیهەبوو نەیدەویست لێی دوور کەوێتەوە و هەروەک سەگێک دەجووڵاوە کە خێوی کۆنی خۆی دیتبێتەوە. بەڵام کۆترەکان لە دەربڕینی خۆشەویستی دا لە شێر کەمتر نەبوون و هەر کات کە کۆترێک بە سەر لمبۆزی شێر دا تیژ تێدەپەڕی، شێر سەری رادەوەشاند و گەش دەبۆوە و پێدەکەنی.

زەردەشت لە ئاست گشت ئەمانە دا، تەنیا گوتی: «منداڵەکانم نزیکن، منداڵەکانم» و لە دوایی بێدەنگ بوو. بەڵام خۆی پێڕانەگیرا و فرمێسک لە چاوەکانی هەڵوەرین و کەوتنە سەر دەستەکانی. ئەو ئیدی سەرنجی نەدەدا هیچ شتێک و بێ ئەوەی کە گیاندارەکانیش لە خۆی بتارێنێ هەر لەوێ بێبزووت دانیشت. کۆترەکانیش لێر و لەوێ فڕین و لە سەر شانەکانی هەڵنیشتن و خۆیان لە پرچە سپییەکانی هەڵسوو و لە گماندن و دەربڕینی خۆشەویستی ماندوو

نەدەبوون. بەڵام شێری بە هێزیش پەیتاپەیتا ئەو فرمێسکانەی کە دەکەوتنە سەر دەستەکانی زەردەشت دەلێستەوە و بە شەرمەوە دەیمراند و دەینەڕاند. وەهایان کرد ئەم گیاندارانە.

ئەوانە گشتی ماوەیەکی درێژ یا کورتیان خایاند: چونکە بە دروستی دەبێ بێژین کە لە سەر رووی زەوی بۆ وەها شتگەلێک هیچ **زەمانێک نیە** ـ بەڵام لەم نێوە دا مرۆڤە باڵاترەکان لە ئەشکەوتی زەردەشت دا لە خەو هەستان و پێکەو ریزێکیان ساز کردبوو هەتا بۆ بەیانی باشی بچنە لای زەردەشت: چونکە کاتی هەستان لە خەو دیتبوویان کە ئەو دەگەڵیان نیە. بەڵام کاتێک گەیشتنە زارکی ئەشکەوت و ترپەی پێیەکانیان لەوان پێشتر کەوت، شێر راچڵەکا و لەپڕ رووی لە زەردەشت وەرگێڕا و بە نەڕەیەکی دڕندانە بەرەو ئەشکەوت بازدی دا و بەڵام مرۆڤە باڵاترەکان کاتێک نەڕەی ئەویان بیست تێکڕا هاواریان کرد و بەرەو دوا رایان کرد و دەستبەجێ ون بوون.

بەڵام زەردەشت گێژ و وێژ هەستا، دەوروبەری خۆی چاو لێکرد و حەیران وەستا و پرسیاری لە دڵی خۆی کرد و دە بیرەوە چوو و تەنیا بوو. لە ئاکام ئارام گوتی: «چم گوێ لێبوو؟ هەنووکە چم بە سەر دا تێپەڕی؟»

ئەوسا وە بیری هاتەوە و لە چاوترووکانێک دا دە هەموو ئەو شتانەی کە لە نێوان دوێنێ و ئیمرۆ دا لێیقەومابوو، گەیشت. دەستی بە ردێنی خۆی داهێنا و گوتی: «ئەمەیە ئەو بەردەی کە من دوێنێ لە سەری دانیشتبووم؛ هەر لێرە بوو کە پێشگۆ هاتە لای من و هەر لێرە بوو کە بۆ یەکەم جار هەر ئەو هاوارەم بیست کە هەرئێستاش دەیبیسم، هاواری هانای گەورە.

ئەی مرۆڤە باڵاترەکان، کەوایە ئەمە هاواری هانای ئێوە بوو کە دوێنێ بەیانی ئەو پێشگۆ پیرە بۆی پێشگۆیی کردبووم ـ

ئەو بە دوای هاواری ئێوە دەیەویست من فریو بدا و وەسوەسەم بکا و بە منی گوت: «ئەی زەردەشت من هاتووم هەتا تۆ بەرەو دوایین گوناهت وەسوەسە بکەم.»

زەردەشت هاواری کرد و بە تەوسەوە بە قسەکانی خۆی پێکەنی: «بۆ دوایین گوناهم؟ بێجگە لە دوایین گوناهم چم بۆ مابۆوە؟»



زەردەشت جارێکی دی چوە نێو خۆیەوە و دیسان لە سەر گاشەبەردەکە دانیشتەوە و چوە نێو بیرەوە. لەپڕ راپەڕی:

**«بەزەیی! بەزەیی بە مرۆڤە باڵاترەکان!»** ئەو وەهای هاوار کرد و روخساری شین هەڵگەڕا. «ئادی ئەوەش کاتی خۆی هەبوو!

بەزەیی و دەردی من چیە. ئایا من بۆ **بەختیاریی** هەوڵ دەدەم؟ من بە شوێن **کاری** خۆمەوەم.

زۆر باشە، شێر هاتوە، منداڵەکانم نزیکن، زەردەشت گەیشتوە، کاتی من هات.

ئەمە بەرەبەیانی **منە**، رۆژی **من** دادێ: **نووکە وەرە سەر، وەرە سەر، ئەی نیوەڕۆی مەزن!»**

وەهای گوت زەردەشت و ئەشکەوتی خۆی جێ هێشت، درەشاوە و بە هێز، مینا هەتاوی بەرەبەیان کە لە پشت کێوە تاریکەکان سەر دەردێنێ.

# فەرهەنگۆک

**ئافراندن:** خولقاندن

**ئافرێنەر:** خولقێنەر

**ئاکارباش:** کەسێک کە چاکە و کردەوەی باش دەکا.

**ئاکارباشی:** کردەوەی باش و چاک، پلەبەرزی لە کاری چاک دا.

**ئامۆتە:** فێرکراوە، ئامۆژە.

**بازگە:** شوێنی باز دان

**باسپێر:** پارچە و قوماشێکی گەورەیە کە لەو گەمیّ و کەشتیانەی هەڵداوەسن کە بە هێزی با ئیش دەکەن.

**بۆقە:** دەنگی بەراز

**بەرزەمرۆڤ:** بەرزەمرۆڤ لە جیات وشەی Übermensch هەڵبژاردراوە. Über یانی سەر، بەرز و mensch یانی مرۆڤ کە بە گشتی یانی مرۆڤی تەواو پێگەیشتوو.

**بەرەزا:** یەکەم منداڵی دایک و باوک، نۆبەرە. // پاشەبەرە

**پرسا:** کەسێک کە لە هەموو شت دەپرسێ و دەکۆڵێتەوە، وردکۆڵ، کونجکاو.

**پەردەک:** مەتەڵۆکە، مەتەڵ.

**پەیڤ:** قسە، وتە، کەلام.

**تلیلی:** دەنگی شادی دەربڕین بە زمان و دەم.

**تاریکان:** ئێوارەی درەنگ، تاریکایی ئێوارێ.

**چەنگ:** ئامێرێکی کۆنی مۆسیقا

**خەدەنگ:** تیری کەوان، تیر

**خەڵوەنشین:** کەسێک کە لە ژوورێکی تەنیا یا لە ئەشکەوتێک دا خەریکی



عیبادەتە و کەم دەخوا، خەڵوەکێش.

**دەخمە:** سەیزان و ژێرخانێک کە کەلاکی مردووی لێدادەنێن.

**رەوان:** رووح

**سەرایی:** بەشی هەرە سەرووی شتێک، سەتح.

**فرەزان:** زۆرزان، چازان، زۆر زانا.

**فەریسی:** کۆمەڵێکی ئایین ویشکی جوولەکە بوون کە لە سەردەمی مەسیحیش دا هەبوون و عیسا دژایەتی دەگەڵ دەکردن.

**کوپیدۆ:** خودای ئەوینی رۆمییەکان، کوڕی ڤێنووس.

**کەپوور:** جۆرێک ماسی.

**گرگران:** فیشەکەشێتە و کەرەسەی ئاگرین دە حەوا کردن لە کاتی جەژن و خۆشی دا، ئاگربازی.

**گورنی:** مرۆڤی کورتەڵە، بابەعەمرە.

**لەیستۆک:** کەرەسە و ئەسبابی کایەی منداڵ، ئەو شتانەی کە منداڵ کایەی پێدەکەن.

**لێمشت:** لافاو، سێڵاو

**مەلەوەر:** هەر شتێک کە لە سەر ئاو بێ و بە تەواوی نوقم نەبووبێ و ئاو دەگەڵ خۆی بیبا.

**مینا:** چەشن، وەک، وەکوو

**نێرینە:** نێوەڕاست

**وەزەغ:** بۆقی گڵێ، بۆقی ویشکایی.

**یادمان:** پەیکەرە یا کۆتەڵێک کە بۆ یاد و بیرەوەری کەسێک ساز بکردرێ.

# کتێبە چاپکراوەکانی دەزگا

١ – جوگرافیای کوردستان
٢ – نەژادی کورد
٣ – باڵە سیاسییەکان لە ئێران
٤ – کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی مووسڵ
٥ – اربیل ٨٨ هەولێر ٩٩
٦– جمعیة خویبون
٧– امارة بابان
٨ – امارة بوتان
٩ – امارة بادینان
١٠–جیهانگیری
١١ – حقوق الانسان والمجتمع المدني بین النظریة والتطبیق
١٢ – الفدرالیة وامکانیة تطبیقها في العراق
١٣ – تەقریرستان
١٤ – شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا
١٥ – کردستان – في القرن الثامن الهجري
١٦ – فەرهەنگ و لێکحاڵی بوون
١٧ – فەرمانڕەوایانی قۆچ زێڕین – لە سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە تا ئەتاتورک
١٨ – ئەودیوی مەرگ
١٩ – فریدریک نیتشە
٢٠ – چەند بابەتێکی ڕێزمان و زمان
٢١ – ژیانەوە
٢٢ – ئینسکلۆپیدیای ئابووریی
٢٣ – دێموکراسی چییە؟
٢٤ – ئەو پڵنگانەی لە تەک مندا غاریانداوە
٢٥ – کوردستان و کێشەی سنووری عوسمانی – فارسی



٢٦ – لوڕ و لوڕستان
٢٧ – مناڵییم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکەزێڕینەکاندا باز بازێنی دەکرد
٢٨ – شۆڕشی دەرسیم
٢٩ – ماکیاڤیللی
٣٠ – الشدادیون
٣١ – پاریا
٣٢ – شێخ عەبدولقادری گەیلانی
٣٣ – کوردستان لە مێژوودا –چاخە کۆنەکان
٣٤ – کوێری
٣٥ – خەیامی هەژارانە
٣٦ – بێدەنگی دەریا
٣٧ – االفدرالیة والحکم الذاتي
٣٨ – کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الاولی الی نهایة مشکلة الموصل ١٩١٤ – ١٩٢٦
٣٩ – القضیة الکوردیة في المؤتمرات الدولیة
٤٠ – ڕێبازە هاوچەرخەکانی فەلسەفە
٤١ – سەرۆک کۆماری کوردستان – لەبەردەم دادگادا
٤٢ – کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو بەشێک لە مێژووی ڕزگاریخوازی گەلی کورد
٤٣ – الاسلام وحقوق الانسان
٤٤ – سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون
٤٥ – چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد (بەرگی دووەم)
٤٦ – سەرۆک کۆماری کوردستان – لەبەردەم دادگادا
٤٧ – ستران و دیلان
٤٨ – من وثائق الحرکة القومیة الکردیة